# شكاری بیر

**( صيد الخاطر )**

بەرگی یەکەم

**نووسینی**

الإمام ابو الفرج عبدالرحمن إبن الجوزي

**وەرگێڕانی**

قاسم عەلی

# پێشەکییەك

لەمێژ بوو ناوی کتێبی (صَیْدُ الخَاطِر)م بیستبوو، لە زۆربەی ئەو کتێبانەی دەمخوێندنەوە دەمدیت وەکوو سەرچاوە بەکارهاتووە و وتە و راوبۆچوونەکانیان لێوە ڕاگوێزتووە. بۆیە هەر لەو کاتەوە تامەزرۆی ئەوە بووم ڕۆژێك دەستم کەوێت و بیخوێنمەوە، ئیتر ئەم ڕۆژە هات و بەتاسەوە لە بەرگەوە تا بەرگ بەوردی و سەلیقەوە خوێندمەوە، ئینجا زانیم چ شاکارێکە!

کتێبەکە لەپاڵ ئەوەی کۆمەڵێك زانیاریی بەنرخی تێدایە لە هەمان کات نووسەر لەبارەی زۆر بابەت و پرسەوە باسی ئەزموونی خۆی و ئەو سەردەمە دەکات کە تێیدا ژیاوە و ئامارە دەکات بە ڕەفتار و بیروباوەڕی ئەو سەردەمەی خەڵك و پەنجە دەخاتە دەرد و برینەکان. وێڕای ئەمەش بابەتەکانی کورت و پوخت باس کردوون. نووسەر لەبارەی زۆربەی بابەتە ئیسلامییەکانی نووسیوە و شەن و کەوی کردوون و بۆچوونی ورد و جوانی لەبارەوە دەربڕیون، ئەو ڕایەی دەربڕیوە کە پێی وایە ڕاست و دروست بووە. بە بەڵگەی عەقڵ و نەقڵ پاڵپشتی بۆچوونەکانی خۆی کردووە و بیروبۆچوونی بەرانبەرەکانی بە بەڵگەی بەهێز و بەپێزەوە لەبەریەك هەڵوەشاندووە.

بەڵام کە باس لە گرینگیی و شاکاریی هەر کتێبێك دەکەین بە واتای ئەوە نایەت کە کتێبەکە بێ کەموکورتییە و ئێمە لەگەڵ هەموو بیروڕایەکانی نووسەردابین، بەڵکوو نووسەریش مرۆڤە و هیچ مرۆڤێکیش تێروتەواو و بێ کەموکورتی نییە، بۆیە ئاساییە لەم کتێبەشدا هەندێ بۆچوون هەبێ من و تۆ بەدڵمان نەبێ و لەگەڵیدا نەبین بەتایبەتی هەندێ لەو بۆچوونانەی تایبەتن بە سەردەمی ئەوکاتی نووسەر یان هەندێ تێگەیشتن و ڕای تایبەتی نووسەر. من خۆم لەگەڵ بەشێکی کەم لە ڕاوبۆچوونەکانی نووسەر نیم و لە هەندێ شوێنیش لەنێو دوو کەوانەدا ( ) ڕوونکردنەوەم داوە و هەروەها لێکۆڵەر (محقق)ی کتێبەکەش لە سەرەتای کتێبەکە و لە پەراوێزەکانیشدا لەبارەی زۆر بابەت و پرسەوە ڕوونکردنەوەی داوە.

- دەمەوێ لێرەدا ئاماژە بە چەند تێبینییەك بكەم:

یەکەم: ئەم کتێبەم لە دوو سەرچاوەوە وەرگێڕاوە کە لە لایەن دوو کەسەوە تەحقیق کراوە:

١- لە لایەن (عامر بن علی یاسین) ەوە تەحقیق کراوە و سەرنج و تێبینی لەسەر نووسراوە.

٢- لە لایەن (د. عبدالحمید هنداوی) تەحقیق کراوە...

دووەم: نووسەر لە ساڵی (٥٧٩)ی کۆچی، کۆچی دوایی کردووە، واتە ئەم کتێبە نزیکەی ٩٠٠ ساڵ پێش ئێستا نووسراوە بۆیە زمانی نووسین هی ئەو سەردەمەیە، دەربڕین و وشە و زاراوەکان هی ئەو کاتن تەنانەت هەندێ وشەی تێدا بوو لە هیچ فەرهەنگێك بۆم نەدۆزرایەوە و پرسیاری شارەزایانیشم کرد وتیان ڕەنگە وشەکە هی ئەو سەردەم یان ناوچەیی بێت. بۆ وەرگێڕانی وشەکانیش نزیکەی ١٠ فەرهەنگی موعتەبەری عەرەبی - عەرەبی و عەرەبی - کوردی بەکارهاتووە.

سێیەم: وەرگێڕانی هەر کتێبێك لە لایەن هەر وەرگێڕێکەوە واتای ئەوە نییە کە وەرگێڕ لەگەڵ هەموو ئەو بیروڕایانەدایە کە لەدووتوێی کتێبەکەدا هاتووە، بەڵکوو ڕەنگە ڕەخنەشی لە هەندێ بۆچوون هەبێ و ڕەتی بکاتەوە. منیش بە هەمان شێوە لەگەڵ بەشێك لە بۆچوونەکانی ناو کتێبەکە نیم و بۆچوونی جیاوازم هەیە.

چوارەم: کاری هیچ مرۆڤێك بێ هەڵە نییە، ئەم کارەی منیش ڕەنگە بێ کێمایەسی نەبێ بەڵام زیاتر لە ساڵ و نیوێك پێوەی خەریك بووم و ئەوپەڕی هەوڵم داوە بێ کەموکورتی بێت، ئەگەر کەسێکیش هەر هەڵە و کەموکورتییەکی تێدا دۆزییەوە سوپاسی دەکەین ئاگادارمان بکاتەوە.

لە کۆتاییشدا سوپاسی مامۆستا (فایەق مەحەممەد نارینی) خاوەنی دەزگای (نارین) دەکەم کە هەمیشە و بەردەوام خەمخۆری بڵاوکردنەوەی کتێبی ڕەسەن و بەسوود و ئامانجدارە، ئەگەر هاندانەکانی ئەو نەبووایە وەرگێڕانی ئەم کتێبە ڕووناکی نەدەبینی.

قاسم عەلی
٢٠٢٠/١٠/٣١ هەولێر

# كورتەیەك لەبارەی دانەرەوە

(ابن الجوزی) ناوی (أبو الفرج عبدالرحمن بن أبی الحسن علی بن محمد القرشی البكری)ە، زانایەكی حەنبەلییە، لە ساڵی (٥١٠)ی كۆچی بەرانبەر (١١١٦)ی زایینی لە شاری بەغدا لەدایك بووە و هەر لەوێ لە ساڵی (٥٩٧)ی كۆچی، كۆچی دوایی كردووە.

لەبارەی زۆربەی بابەتە ئیسلامییەكان بەرهەمی هەیە تا ئەوەی دەوترێ نزیكەی (٣٠٠) دانراوی هەیە.

ئەمانە لە گرینگترین دانراوەكانی ئەون:

- زاد المسير في علم التفسير أربعة أجزاء.
- نواسخ القرآن.
- دفع شبه التشبيه بأكف التنزيه.
- الموضوعات من الأحاديث المرفوعات.
- العلل المتناهية في الأحاديث الواهية.
- صفة الصفوة.

- تلبيس إبليس.
- التذكرة في الوعظ.
- كتاب ذم الهوى.
- صيد الخاطر.
- الوفاء بأحوال المصطفى.
- المنتظم في تاريخ الملوك والأمم.
- تاريخ بيت المقدس.
- أخبار الحمقى والمغفلين.
- ولقط المنافع، في الطب.
- تنبيه النائم الغمر على مواسم العمر.
- لفتة الكبد إلى نصيحة الولد.
- أعمار الأعيان.
- كتاب المدهش في الوعظ.
- فنون الأفنان في عيون علوم القرآن.
- سيرة ومناقب عمر بن عبد العزيز الخليفة الزاهد.
- مناقب عمر بن الخطاب.

- أخبار الظراف والمتماجنين.
- كتاب الأذكياء.
- بستان الواعظين ورياض السامعين.
- التبصرة في الوعظ.
- درر الجواهر من كلام الشيخ عبد القادر.
- بحر الدموع.

## پێشەكیی دانەر

بسم الله الرحمن الرحيم

وبه المستعان وعليه التكلان.

شێخی پێشەوا و زانا (ئەبوولفەرەج عەبدولڕەحمان كوڕی عەلی كوڕی محەممەد كوڕی ئەلجەوزی) وتوویە:

الحمدلله حمدا يبلغ رضاه، وصلى الله على أشرف من اجتباه، وعلى من صاحبه ووالاه، وسلم تسليما لايدرك منتهاه.

كاتێ بیروهزر لە تێڕامانی ئەو شتانەی دێنە بەر زەین دەكەوێتە جموجۆڵ و پاشان فەرامۆشیان دەكات ئیتر دەڕۆن و ون دەبن بۆیە شیاوترین شت پاراستنی ئەو ئەندێشانەیە كە بە زەیندا دێن تاوەكوو لە بیر نەچنەوە، پێغەمبەر (درووودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: ((قيِّدوا العلم بالكتابة)) صحيح موقوفا و مرفوعا.. واتە: بە نووسین زانست كۆتوبەند بكەن (مەبەستی ئەوەیە بینووسنەوە تا لە بیرتان نەچێتەوە و لە دەست نەچێت).

چەندان شتم بەبیردا هاتووە و لە تۆماركردنی مەشغووڵ دەبم ئیتر دەڕوات و لە دەستم دەچێ و دواتر خەمی بۆ دەخۆم!

له نه‌فسی خۆمه‌وه‌ڕا دیتم که من هه‌ر کاتیٚ چاوی بیرکردنه‌وه‌م کرده‌وه ئه‌وا له سه‌یروسه‌مه‌ره‌کانی غه‌یبه‌وه شتی وه‌های بۆ ده‌رده‌که‌ویٚ که له حیسابدا نه‌بووه، لێشاوی تێگه‌یشتن و تێگه‌یاندن به‌سه‌ریدا ده‌باریٚ که ناکریٚ که‌مته‌رخه‌می به‌رانبه‌ر بکریٚ، ئیتر ئه‌م کتێبه‌م کرده شکارێك بۆ ئه‌م بیر و هزرانه.

والله ولي النفع، إنه قريب مجيب..

## ١- بۆچی دوای ئامۆژگاری، دڵ تووشی بێئاگایی و ڕەقبوون دەبێتەوە؟

مرۆڤ لە کاتی بیستنی ئامۆژگاری و وەعزدا بێدار دەبێتەوە، بەڵام کە لە کۆڕی زیکر دابڕا دڵڕەقی و بێئاگایی یەخەی دەگرێتەوە !

لە هۆکاری ئەوە ورد بوومەوە، زانیم چییە.

پاشان دیتم خەڵك لەوەدا جیاوازن و وەکوو یەك نین:

حاڵەتە گشتییەکە ئەوەیە کە دڵ لە کاتی بیستنی ئامۆژگاری و دواتر وەکوو خۆی نامێنێتەوە، ئەوەش لەبەر دوو هۆ:

یەکەم: ئامۆژگاری و وەعز وەکوو قامچی وایە، قامچیش دوای بەسەرچوونی ئازاری کاتی وەشاندنەکەی، ئێشی نییە.

دووەم: لە حاڵی بیستنی ئامۆژگاریدا مرۆڤ هەست و هۆش و دڵی خاڵییە لەو شتانەی مەشغووڵی دەکەن، بە جەستە و فیکریەوە لە هۆکارەکانی دونیا دوورکەوتۆتەوە و، بە دڵئاگاییەوە گوێی گرتووە، بەڵام کاتێ دەگەڕێتەوە سەر کار و سەرقاڵییەکانی، ئیتر بە کێشە و گرفتەکانیەوە بە لای خۆیدا کەمەندکێشی دەکاتەوە، جا چۆن دەکرێ وەکوو جارانی لێ بێتەوە؟!

ئەمە حاڵەتێکە زۆربەی خەڵك دەگرێتەوە، بەڵام دڵبێداران لە مانەوەی شوێنەواری ئامۆژگاری جودان:

هەیانە بێ دوودڵی بڕیار دەدات و بێ ئاوڕدانەوە بەرەو پێشەوە هەنگاو دەنێت، ئەگەریش پێکهاتەی سروشتی مرۆڤانەش پێشی لێ گرتن و وەستاندنی، ئەوا هاواریان لێ هەڵدەستێ هەروەکوو (حەنظەڵە) لەبارەی خۆیەوە گوتی: حەنظەڵە دووڕوو بوو!

(حەنظەڵە دەگێڕێتەوە: ڕۆژێکیان چوومە لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا حەنظەڵە دووڕوو بوو! پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: ئەمە چۆن؟ گوتی: کە لە لای تۆین و باسی دۆزەخ و بەهەشتمان بۆ دەکەیت وەکوو ئەوە وایە بە چاو ببینین، بەڵام کە لە کن تۆ هەستاین ئەوا سەرقاڵی ژن و ماڵ و منداڵ دەبین و زۆرمان لە بیر دەچێتەوە! پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) پێی فەرموو: ((سوێند بەو خودایەی گیانی منی بە دەستە، ئەگەر بەردەوام بن لەسەر زیکر و ئەو حاڵەتەی لە لای منن ئەوا فریشتەکان لەسەر جێخەو و ڕێگاکانتان تەوقەتان لەگەڵ دەکەن، بەڵام حەنظەڵە: کاتێك بۆ خودا و کاتێك بۆ خۆت و ماڵ و منداڵ))..

خەڵکێك هەیە سروشتی مرۆڤانەیان هەندێ کات بەرەو بێئاگاییان دەبات و هەندێ کاتیش ئامۆژگاری و وەعز بەرەو کاری چاکیان دەبات، ئەوانە وەکوو گوڵەگەنمێك وان کە با لاری دەکاتەوە و بەم لا و بەو لایدا دەبات.

(له فەرموودەیەکی صەحیحی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) هاتووه كه فەرموویەتی: ئیماندار وەكوو گوڵەگەنم وایە، هەندیٚ كات لار دەبێتەوه و هەندیٚ كاتیش ڕاست دەبێتەوه.)

هەندیٚ خەڵكیش هەن تەنها به ئەندازەی بیستنی، ئامۆژگاری كاریان تیٚ دەكات، وەكوو ئاوێك بەسەر بەردێكی لووسی دابكەیت.

## ٢- سروشتى مرۆڤ لە نێوان حەزبزوێنەكانى دونيا و يادى ئاخيرەتدا

ئەو شتانەى سروشتى مرۆڤ بەرەو دونيا ڕادەكێشن زۆرن، پاشان لە ناوەوەن، يادى ئاخيرەتيش شتێكە لە دەرەوەى سروشتى مرۆڤ، لە دەرەوەشە.

كەسێك كە زانست و زانيارى نييە لەبەر ئەو هەڕەشانەى لە قورئانى دەبيستىَ وا گومان دەبات ئەو شتانەى بەرەو ئاخيرەت كەمەندكێشت دەكەن بەهێزترە.

بەڵام وانييە، چونكە نموونەى سروشتى مرۆڤ لە ئارەزووى بۆ دونيا وەكوو ئاوێكى ڕەوانە كە خوازيارى بەرەو خوار چوونە، بەرزكردنەوەى بەرەو سەروو ئاتاج بە زۆر لەخۆكردن و ماندووبوونە، بۆيە لە شەرعدا بابەتى ئومێد وەبەرنان و ترساندن (الترغيب و الترهيب) هەيە كە لايەنى عەقڵ بەهێز دەكات.

لەمەڕ سروشتى مرۆڤيش ئەوا ئەو شتانەى كەمەندكێشى دەكەن فرەن، سەير لەوەدا نييە زاڵ ببێت و سەركەوێت، بەڵكوو سەير لەوەدايە تێك بشكىَ و بكەوێتە ژێرەوە.

## ٣- ڕوانین بۆ سەرەنجام مایەی سەلامەتییە

هەر کەسێك هەر لە سەرەتایەوە بە چاوی دڵەوە کۆتایی شتەکان ببینێ ئەوا خێر و چاکەکەی دەست کەوتووە و لە خراپییەکەی ڕزگاری بووە.

هەر کەسێکیش سەرەنجامەکان نەبینێ، هەست بەسەریدا زاڵ دەبێ، هەر کات سەلامەتی لێ بخوازێ بە ئازار بۆی دەگەڕێتەوە، ئومێدی حەسانەوەی لێ بکات بە ماندووبوون بۆی دێتەوە.

ڕوونکردنەوەی ئەمە لە داهاتوو بە باسکردنی ڕابردوو ڕوون دەبێتەوە:

ئەتوو لە تەمەنی خۆتدا هەم سەرپێچیی خودات کردییە و هەمیش گوێڕایەڵی: کوا چێژی سەرپێچییەکەت؟! کوا ماندووبوونی گوێڕایەڵییەکەت؟! ئەم دووانە چەندە لێك جیاوازن! هەر یەکەیان بەوەی تێیاندا بوو ڕۆیشتن!

خۆزگە کە تاوانەکان تەواو دەبوون و چێژەکەیان دەڕۆیشت مرۆڤیش ئاسوودە بووایە و لە ئێش و خەم و پەشیمانی ڕزگاری بووایە!!

ئەمەت زیاتر بۆ ڕوون دەکەمەوە: ساتی مردن بێنە بەرچاوت و سەیری تاڵیی خەم و ئاخ هەڵکێشان بۆ کەمتەرخەمی بکە، ناڵێم: چۆن شیرینیی چێژەکان تێك دەشکێنی چونکە شیرینیی چێژەکان گۆڕاوە بۆ گوژاڵك، تەنها تاڵیی خەم و پەژارە ماوە.

ئایا نەتزانی کە کار بە سەرەنجامەکەیەتی؟!

ئاگات لە سەرەنجامەکان بێت سەلامەت دەبیت، لەگەڵ ئارەزووی هەست خوار مەبەوە دەنا پەشیمان دەبیتەوە.

## ٤- ژیانی دونیا کەم و کورتە

هەر کەسێ بیر لە سەرەنجامی دونیا بکاتەوە وریای خۆی دەبێ، هەر کەسێکیش باوەڕی بە درێژیی ڕێگا هەبێ خۆی بۆ سەفەر ئامادە دەکات.

ئەی ئەو کەسەی باوەڕت بە شتێك هەیە و پاشان لەبیری دەکەیت چەندە سەیریت، لە زیانی حاڵێك دڵنیایت و پاشان دەیکەیت، لە خەڵك دەترسیت کەچی خودا شیاوی لێ ترسانە!

لەوەی گومانت لێیەتی نەفست بەسەرتدا زاڵ دەبێت و لەوەی باوەڕت پێیەتی بەسەریدا زاڵ نابیت!

سەیرترینی سەیر و سەمەرەکان: دڵخۆشبوونتە بە لە خۆباییت، گەمە و یاری بێئاگای کردوویت لەوەی بۆت ئامادە کراوە! بە لەشساغیت فریو دەخۆیت و لە خۆبایی دەبیت و نزیکبوونەوەی نەخۆشی لە یاد دەکەیت، بە ساغ و سەلامەتیت دڵخۆشیت و بێئاگایت لە نزیکبوونەوەی ئێش و ئازار! مردنی غەیر مەرگی خۆتی پێ نیشاندایت، گۆڕی غەیر گۆڕی خۆتی بەر لە مردن پێ نیشان دایت! بەدەسهێنانی چێژەکانت سەرقاڵی کردیت لە بیرکردنەوە لە وێرانیی خودت.

كأنك لم تسمع بأخبار من مضى
ولم تر في الباقين ما يصنع الدهر
فإن كنت لا تدري فتلك ديارهم
محاها مجال الريح بعدك والقبر

چەندان کەست بینی بەر لە مردن لە پلەوپایەی بەرز هاتەخوار و ماڵ و موڵکی کەوتە دەست کەسانی تر! چەندان والی و بەرپرسی نێو کۆشك و تەلارت بینی کاتێ لەسەر کار لادرا و دوورخرایەوە دوژمنەکەی هاتە شوێنی!

ئەی ئەو کەسەی چاوی لە هەموو ئەو شتانەیە و دەیانبینێ بەڵام کردەوەی وەکوو کەسێکە نە تێ دەگات و نە دەزانێ!

وكيف تنامُ العينُ وهي قريرة
ولم تدر من أي المحلّين تنزلُ

مرۆڤ چۆن بە دڵخۆشی خەوی لێ دەکەوێ کە هێشتا نازانێ بەهەشت هەواریەتی یان دۆزەخ؟!

## ٥- دوورکەوتنەوە لە فیتنە

هەر کەسێك لە فیتنە نزیك بێتەوە سەلامەتی لێ دوور دەکەوێتەوە، هەر یەکێکیش بانگەشەی سەبر و ئارامگری بکات بە نەفسی خۆی دەسپێردرێ، ڕەنگە سەیرکردنێك مرۆڤ تووشی فیتنە بکات و زیانێکی گەورەی بەدواوە بێت، زمان و چاو لە هەموو شتان زیاتر شیاوی بەرزەفتکردن و بەسەرداڵزالبوونن.

ئامان و سەت دەخیل نەکەی لەگەڵ نزیکبوونەوە لە فیتنە بە بڕیاری وازهێنان لە هەوا و ئارەزوو فریو بخۆیت، چونکە هەوا و ئارەزوو فێڵبازێکی گەورەیە! چەندان کەسی ئازا لە ڕیزی شەڕدا تیرۆر کران، لە لایەن کەسێکەوە تیری مەرگی بۆ هات کە هەر حیسابی بۆ نەدەکرد و بێزی نەدەهات تەماشاشی بکات!

ڕووداوی شەهیدکردنی حەمزەی کوڕی عەبدولموتەلیب لە لایەن وەحشییەوە بەبیری خۆت بێنەوە.

فتبصرْ ولا تشِم كلَّ برقٍ ... ربَّ برقٍ فيه صواعقُ حَينِ

واغضضِ الطرفَ تسترحْ من غرامٍ ... تكتسي فيه ثوبَ ذلٍّ وشَينِ

فبلاءُ الفتى موافقةُ النفسِ ... وبدءُ الهوى طموحُ العينِ

چاوت بکەوە و وریابە، ڕوو مەکە ڕواڵەت و ڕووکەشی شتەکان، ڕەنگە بێ ئەوەی بزانی ببنە هۆی لەناوچوون و فەوتانت..

## ٦- گەورەترین سزادان

گەورەترین سزادان ئەوەیە سزدراو هەست بە سزایەکە نەکات!

گەورەتر و سەختتر لەوە ئەوەیە بە شتێك دڵخۆش بیت کە سزایە وەکوو دڵخۆشبوون بە ماڵی حەرام و توانای تاوانکردن!

هەر کەسێك ئەمە حاڵی بێت تاعەتی دەست ناکەوێت.

من لە حاڵوباری زۆرێك لە زانا و زاهیدان وردبوومەتەوە بینیومن لەنێو سزاگەلێکدان و هەستی پێ ناکەن، زۆربەشی بە هۆی خوازیاری سەرۆکایەتییەوەیە، زانا هەیە تووڕە دەبێ ئەگەر بەرپەرچی هەڵەکەی بدرێتەوە، ئامۆژگار و واعیز زۆرلەخۆکردن(تصنع) بە وەعزەکەیەوە دەکات، زاهیدیش دووڕووە یان ڕیاکار.

یەکەم سزایان ئەوەیە لەبەر مەشغوولبوونیان بە خەڵقەوە پشت دەکەنە هەق.

لە سزایە شاردراوەکانیان سەندنەوەی شیرنایی موناجات و لالآنەوە و چێژی خواپەرستییە.

تەنها پیاوان و ژنانی ئیماندار نەبێ، خودا زەوی بەوانەوە دەپارێزێ، ناخیان وەکوو دەرەوەیانە بەڵکوو ڕوونتریشە، نهێنییان وەکوو ئاشکرایانە بەڵکوو شیرینتریشە، هیممەتیان لە کن ئەستێرەی گەلاوێژە بەڵکوو بەرزتریشە، ئەگەر ناسران خۆ نەناس

دەکەن، ئەگەر کەرامەتێکیان لێ ببینرێ نکوڵی لێ دەکەن، خەڵك لە بێئاگاییەکانیان نغرۆ بوونە و ئەوانیش بە کارکردن بۆ ئاخیرەتیان مەشغوولن، هەموو زەوی خۆشیان دەوێن و ئەستێرەکانی ئاسمان پێیان دڵخۆشن.

لە خودای گەورە داوا دەکەین یارمەتیمان بدات بۆ شوێنکەوتنیان و بمانکاتە شوێنکەوتەی ئەوان.

## ٧- هیمەتبەرزی

لە نیشانەی تێروتەواویی عەقڵ هیمەتبەرزییە، ئەو کەسەشی بە نزمی ڕازییە خۆی نزمە.

ولم أر في عيوب الناس عيبا      كنقص القادرين على التمام

هیچ نەنگییەکم لە خەڵك نەبینیوە گەورەتر بێت لە تەواو نەکردنی کاری ئەو کەسانەی کە توانای تەواوکردنیان هەیە.

(ئەمە دێڕێکی شیعرێکی موتەنەببی شاعیری گەورەی عەرەبە).

## ٨- گەورەیی بەخششەکانی خودا

پاکوبێگەردی بۆ ئەو خودایەی خۆشەویستیی خۆی بەسەر دۆستانیدا باراندووە، لەسەر شتێك ستایشی کردوون کە خۆی پێی بەخشیون، شتێکی لێ کڕیون کە خۆی پێی داون، کەسانێك کە لەم وەسفانە دواکەوتوون خودا بە هۆی (ایثار)یانەوە پێشی خستوون، شانازی بە ڕۆژووەکەیانەوە کردووە و بۆنی دەمیانی خۆش گەرەك بووە.

ئای ئەمە چ حاڵەتێکی پارێزراوە! هەموو داواکارێك بۆی ناکرێ و هەموو خوازیارێکیش ناگات بە حەقیقەتی وەسفەکەی.

# ٩- توێشووی سەفەری کۆتایی

لەسەر کەسی ژیر و هۆشمەند پێویستە توێشو بۆ کۆچکردنی ئامادە بکات چونکە نازانێ کەی فەرمانی پەروەردگاری بۆ دێت؟ نازانێ کەی بانگ دەکرێ؟

خەڵکێکی زۆرم بینی گەنجێتی فریوی دان و لەدەستدانی هاوڕێکانیان لەبیرکرد و هیوادرێژی سەرقاڵ و بێئاگای کردن.

ڕەنگە زانایەك هانی خۆی بدات و بڵێ: ئەمڕۆ خەریکی فێربوون و کۆکردنەوەی زانست دەبم پاشان سبەی کاری پێ دەکەم! بە بیانووی خۆشی وەرگرتن لە گوناه شلڕەوی دەکات و بۆ هێنانەدی تەوبە ئامادەکاری دوادەخات و لە غەیبەتکردن یان گوێگرتن لێی خۆ ناپارێزێ، لە نان پەیداکردنی گوماناوی بە هیوایە بە کارێکی سبەی بیسڕێتەوە، بەڵام لەبیری چووە کە مردن لەناکاو بۆی دێت.

عاقڵ ئەو کەسەیە کە هەر ساتێك چی لەسەر پێویستە هەقی خۆی بداتێ، ئەگەر مردنیش لەناکاو یەخەی گرت ئامادە بێت، ئەگەر ئەو ئاواتەشی هەیەتی بەدەستی هێنا خێر و چاکەی زیاتر بکات.

## ١٠- هۆکاری سزای خوایی

بیرۆکەیەکم بە هزردا هات لەبارەی ئەو بەڵا و موسیبەت و کارەساتە گەورانەی کە بەسەر زۆرێك لە خەڵکدا دێت کە زۆر سەخت و دژوران!

گوتم: پاکوبێگەردی بۆ خودا! خودا بەخشندەترینی هەموو بەخشندانە، بەخشندەییش لێبووردەیی پێویست دەکات، ئەدی ئەم سزادانە بۆچی؟

بیرم کردەوە؟!

دیتم زۆرێك لە خەڵك لە بوونیاندا وەکوو نەبوو وان، ناڕواننە بەڵگەکانی یەکتایی خودا، سەیری فەرمان و نەهییەکانی خودا ناکەن، بەڵکوو وەکوو ئاژەڵ لەسەر دابونەریتی خۆیان دەڕۆن، ئەگەر شەرع لەگەڵ مەبەست و ویستیان گونجا و کۆك بوو ئەوا باشە وەگەرنا تەنها پشت بە مەبەست و دڵخوازەکانیان دەبەستن! دوای دەسکەوتنی دینار گرینگی نادەن بەوەی لە ڕێگایەکی حەڵاڵەوەیە یان حەرام؟ ئەگەر نوێژ لەسەریان ئاسان بێت دەیکەن وەگەرنا وازی لێ دێنن! هەیانە لەگەڵ ناسینی خودا تاوانی گەورەش دەکەن، ڕەنگە زانیاری زاناکانیان بەهێزیش بێت و تاوانیشیان زۆر و گەورە بێت!

ئیتر زانیم سزاکان ئەگەر گەورەش بن هێشتا لە خوار تاوانەکانیانە.

ئەگەر بۆ سڕینەوەی گوناهێکیان سزایەکیان بۆ بێت هاوار دەکەن: دەبێ ئەمە بە هۆی چ گوناهێکەوە بێت؟! لەبیری دەچێت هەندێ گوناه زەوی لەبەر دەهەژێ!

ڕوودەدات پیرێك لە گەورەییدا ئەوەندە ڕیسوا و سووك ببێت تا ئەوەی خەڵك سکیان پێ بسووتێ بەڵام نازانێ ئەوە بە هۆی فەرامۆشکردنی هەقی خودایە لەسەردەمی لاوێتیدا!

هەر کاتێ کەسێکی سزادراوت بینی بزانە بە هۆی تاوانەوەیە.

## ١١- زانای دونیایی و زانای قیامەتی

بیرم کردەوە لەو حەسوودییەی لەنێوان زانایاندا هەیە دیتم بە هۆی خۆشویستنی دونیاوەیە، زانایانی قیامەتی یەکتریان خۆشدەوێ و حەسوودی بەیەکتر نابەن هەروەکوو خوای گەورە فەرموویەتی:

﴿وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّا أُوتُوا﴾ (الحشر: ٩) واتە: لە بەرانبەر ئەو شتانەی بە کەسانی تر دراوە هیچ حەسوودییەکیان لە دڵدا نییە.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَالَّذِينَ جَاءُو مِن بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِّلَّذِينَ آمَنُوا﴾ (الحشر: ١٠) واتە: ئەوانەی لە دوای ئەوانەوە هاتن دەڵێن: پەروەردگارا لە ئێمە و ئەو برایانەمان خۆش بە کە بە ئیمان پێشمان کەوتن و هیچ ڕق و کینەیەك مەخەرە دڵمان بەرانبەر ئەوانەی ئیمانیان هێناوە.

(ئەبوو دەرداء) هەموو شەوێك دوعای بۆ کۆمەڵێك لە براکانی دەکرد.

ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل بە کوڕی شافیعی گوت: بابت لەو شەش کەسەیە کە هەموو شەوێك لە کاتی بەرەبەیاندا دوعایان بۆ دەکەم.

جیاوازیی نێوان ئەم دوو دەستەیە ئەوەیە: زانایانی دونیایی چاویان لە پایەی سەرۆکایەتییە و حەز لە زۆری شوێنکەوتە و مەدح و ستایش دەکەن، زانایانی

قیامەتییش لەمانە بەدوورن و لێی دەترسن و بەزەییان بەو کەسانەدا دێتەوە کە گرفتاری ئەمە بوون.

(ئیبراهیم نەخەعی) هەرگیز بۆ وانەوتنەوە پشتی نەدەدایە دینگەی مزگەوت.

(عەلقەمەی کوڕی قەیسی نەخەعی) وتوویە: پێم ناخۆشە شوێن پێم هەڵگرن و بوترێ: تاڵ و تفت بوو!

زانای وا هەبووە ئەگەر زیاتر لە چوار کەس لە کنی دانیشتبووایە هەڵدەستا.

فەتوایان لە خۆ دوور دەخستەوە و ڕەوانی لای کەسانی تریان دەکرد و حەزیان لە بێناوی و بێ شۆرەتی بوو.

نموونەی ئەمانە وەکوو کەسێکە چووبێتە ناو دەریا و دەریاش کەوتبێتە شەپۆلدان و هەڵچوون، ئەویش سەرقاڵ دەبێ تا لە ڕزگاربوون دڵنیا دەبێ.

ئەوان هەندێکیان دوعایان بۆ هەندێکیان دەکرد و سوودیان لە یەکتر وەردەگرت، چونکە ئەوان سەرنشینی کەشتییەك بوون و هاوسەفەر بوون یەکتریان خۆشدەویست، ڕۆژان و شەوان قۆناغیانە بۆ سەفەری بەهەشت.

## ١٢- پاڵفتەکردنی حاڵ و کار

هەر کەسێك حەز بە پاڵفتەکردنی حاڵوبار (تصفية الاحوال) دەکات با لە خاوێنکردنەوەی کارەکانیدا کۆشش بکات.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَأَلَّوِ ٱسۡتَقَٰمُواْ عَلَى ٱلطَّرِيقَةِ لَأَسۡقَيۡنَٰهُم مَّآءً غَدَقٗا ١٦﴾ (الجن: ١٦) واتە: ئەگەر لەسەر ڕێی خواپەرستی دامەزراو بوونایە ئەوا ئاوێکی زۆرمان بۆ دەباراندن و تێراومان دەکردن.

پێغەمبەریش (ﷺ) لە خوداوە دەگێڕێتەوە و دەفەرموێ: ((ئەگەر بەندەکانم گوێڕایەڵیم بکەن ئەوا بە شەو بارانیان بۆ دەبارێنم و بە ڕۆژیش خۆریان بۆ هەڵدێنم و وا دەکەم دەنگی هەورەبروسکە نەچێ بە گوێیاندا)). (طيالسي و ئەحمەد و ئەلحاکم) گێڕایتیانەوە و زانایانیش بە لاواز (ضعيف)یان داناوە.

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((چاکە کۆن و ڕزیو نابێ و، گوناهیش بیرناچێتەوە و فەرامۆش ناکرێ و، خوداش نامرێ، چی بچێنی ئەوە دەدوورییەوە)). (ضعيف)ە..

(ئەبوو سولەیمانی دارانی) وتوویەتی: هەر کەسێ دڵ و کاری پاك بوو ئەوا ژیان و قیامەتیشی بۆ پاك و پوخت دەکرێ، هەر کەسێکیش دڵ و کاری پۆخڵ کرد ئەوا ژیان و ئایندەشی لێڵ و شێواو دەبێ، هەر کەسێ لە شەودا چاکەی کرد لە ڕۆژدا پاداشت دەدرێتەوە و دەپارێزرێ، هەر کەسێکیش لە ڕۆژدا چاکەی کرد ئەوا لە شەودا پارێزراو دەبێ.

پیرێك له کۆڕ و کۆبوونەوەکاندا دەگەڕا و دەیگوت: هەر کەسێ پێی خۆشە ساغ و سەلامەتی بۆ بەردەوام بێت با تەقوای خودا بکات.

(فوضەیلی کوڕی عیاض) دەیوت: من لە ئاکاری هاوسەر و ئەسپەکەمەوەڕا دەزانم کە سەرپێچیی خودام کردووە.

بزانە کەسی بەنجکراو هەست بە زەبر و لێدان ناکات، کەسێك هەست بە زیادبوون و کەمبوون دەکات و دەزانێ کە هەمیشە لێپرسینەوە لە نەفسی خۆی دەکات.

هەر کاتێ لە حاڵوبارتدا شێواوی و پەشێوییەکت بینی ئەوا بیرت بێتەوە کە نیعمەتێك هەیە شوکرانە نەکراوە یان هەڵە و تاوانێك کراوە..

لە تەرەبوونی نیعمەتەکان و لەپڕ هاتنی نەگبەتییەکان وریابە، بە فراوانیی ڕایەخی لەسەرخۆیی(حلم) فریو مەخۆ، ڕەنگە پێچانەوە و لوولدانی نزیك بێت.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمْ ﴾ (الرعد: ١١) واتە: خودا حاڵوباری هیچ نەتەوەیەك ناگۆڕێ تا خۆیان خۆیان نەگۆڕن..

(ئەبوو عەلی ئەلڕوزباری) دەڵێ: فریوخواردن و لەخۆباییبوون ئەوەیە خراپە بکەیت و چاکەت لەگەڵدا بکرێ و تۆش واز لە تەوبە بێنی بەو خەیاڵەی گوایە چاوپۆشی لە هەڵە و تاوانەکانت دەکرێ.

## ١٣- تەسلیمبوون بە حیکمەتی خودا

ڕۆژێکیان بیرم لە (تەکلیف) کردەوە دیتم دابەش دەبێ بۆ ئاسان و قورس.

ئاسانەکە کار و کردەوەی ئەندامەکانە بەڵام هەیانە لە هەندێکی تریان قورسترن، دەسنوێژ و نوێژ لە ڕۆژوو ئاسانترن، لەوانەشە ڕۆژوو لای هەندێ کەس لە زەکات ئاسانتر بێت.

بەڵام قورسەکە لێك جیاوازن، هەندێکیان لە هەندێکی تر قورسترن:

لە قورسەکان: ئەو تێڕوانین و بیرکردنەوە و بەڵگەدۆزییەیە کە دەتگەیەنێتە ناسینی بەدیهێنەر (خالق)، ئەمە لە لای ئەوانەی شتە هەستییەکان بەسەریاندا زاڵ بووە قورسە بەڵام لە کن ئەهلی عەقڵ ئاسانە.

لە قورسەکان: زاڵبوون بەسەر ئارەزوو و ڕامکردنی نەفس و جڵەوکردنی غەریزە لە هەڵسوکەوتکردن بەو شێوەیەی پێی خۆشە، هەموو ئەمانە ئاسانە بۆ کەسی عاقڵ لە پاداشت و هیوای سەرەنجامی بڕوانێ و بیربکاتەوە ئەگەرچی ئێستا قورسیش بێت.

بەڵام قورسترین و سەیرترینی تەکلیفەکان ئەوەیە: لە لای عەقڵ حیکمەتی بەدیهێنەر سەلماوە پاشان دەبینین ئەو کەسەی بە زانستەوە سەرقاڵە و ڕووی لە

خواپەرستی کردووە هەژاری دەکات تا ئەوەی دەسکورتی کەڵبەکانی لێ گیردەکات ئەویش بۆ دەسختنی نان زەلیلی بەردەستی نەزان دەبێ، لە هەمان کات کەسی لادەر و نەزانیش دەوڵەمەند دەکات و ماڵی دونیای بەسەردا دەبارێنێ.

پاشان دەبینین جەستەکان دروست دەکات و مکومیان دەکات، پاشان لە سەرەتا و کاتی تەواو دروستبوونیدا بنیاتی لاوان لەبەریەك هەڵدەوەشێنێتەوە و ئیتر دەبێتەوە خاکوخۆڵ.

پاشان دەبینین منداڵان ئازار دەدات تا ئەوەی هەموو سروشتێك بەزەیی پێیاندا دێتەوە پاشان پێی دەوترێ: نەکەی گومان لەوە بکەی کە ئەو دلۆڤانترینی دلۆڤانەکانە (أرحم الراحمين).

پاشان دەخرێتە گوێیەوە کە خودا موسای بۆ فیرعەون ناردووە و پێی دەوترێ: باوەڕ بکە کە خودای گەورە فیرعەونی گومڕێ کردووە و بزانە کە ئادەم هەر دەبوو درەختەکەی بخواردایە کەچی سەرزەنشت کراوە بە ئایەتی: ﴿ وَعَصَىٰٓ ءَادَمُ رَبَّهُۥ ﴾ (طه: ١٢١) واتە: ئادەم سەرپێچیی پەروەردگاری کرد.
لە وێنەی ئەم شتانە خەڵکێکی زۆر سەرگەردان و دۆشداماو بوون تا ئەوەی بەرەو بێباوەڕی و بەدرۆخستنەوە چوون.

ئەگەر لە نهێنیی ئەم شتانەیان بپشکنیبایە ئەوا دەیانزانی کە دانان بەم شتانە ڕاسپاردن و تەکلیفکردنی عەقڵە تا ملکەچ بێت.

ئەمە ئەسڵ و بنەمایە ئەگەر فام بکرێ لێیەوە سەلامەتی و تەسلیمبوون دێتەدی.

له خودای گەورە دەپاڕێینەوە ئەو نهێنی و نادیارانەمان بۆ ئاشکرا بکات کە ئەو کەسانەی سەرگەردان کردووە کە گومڕێ بوون، خودا نزیك و وەڵامدەوەرەیە.

# ١٤- نرخى كات

پێویسته لەسەر مرۆڤ گەورەیی سەردەم و ڕێزی کاتەکەی بزانێت، هیچ ساتێکی لە غەیری نزیکبوونەوە لە خودا بەفیڕۆ نەدات و، باشترینی قسە و کردەوەکان پێش بخات ئینجا باشتر.

با هەمیشە بۆ خێر و چاکە نییەت و نیازی دامەزراو بێت بەتایبەت ئەو کارانەی ناتوانیٚ بە جەستە بیانکات هەروەك لە فەرموودەدا هاتووە: ((نییەت و نیازی ئیماندار لە کردەوەکەی باشترە.)) (ضعیف)لاوازە..

کۆمەڵێك لە پێشینان (السلف) ساتەکانیان دەقۆستەوە و بەفیڕۆیان نەدەدا:

لە (عامری کوڕی قەیس) گێڕدراوەتەوە کە پیاوێك پێی وتووە: قسەم بۆ بکە! ئەویش پێی وتووە: خۆر ڕاگرە!

(ئیبن ثابت ئەلبونانی) وتوویە: چووم تەلقینی بابم بدەم گوتی: کوڕەکەم! لێمگەڕێ، من وا لە ویردی شەشەمم.

لە سەرەمەرگدا چوونەتە لای هەندێ لە پیاوچاکانی پێشین بینیویانە وا نوێژ دەکات، پێی وتراوە ئێستا کاتی ئەوەیە؟ وتوویەتی: نووکە تێنووسی کردەوەکانم دەپێچرێتەوە!

ئەگەر مرۆڤ زانی کە مردن لە کارکردنی دادەبڕێ ئەوا لە ژیانیدا ئەوەندە کار دەکات بە هیوای ئەوەی پاداشتەکەی لە دوای مردنی بۆی بەردەوام بێت: ئەگەر شتێکی لە دونیا هەبێت ئەوا (وەقف)ێك وەقف دەکات و، درەختێك دەڕوێنێ، ڕووبارێك چێ دەکات، هەوڵی خستنەوەی وەچەیەك دەدات کە دوای خۆی یادی خودا بکەن و بۆی ببێتە پاداشت، یان کتێبێك لەبارەی زانستەوە ئامادە دەکات، چونکە کتێب دانان کوڕی زیندووی مرۆڤە، بەزانینەوە کاری خێر و چاکە بکات، تا کردەوەکەی ببێتە پێشەنگ بۆ خەڵك و چاوی لێ بکەن، هەر ئەوەیە کە نەمردووە.

خەڵکێك هەر بە زیندوێتی مردن!

## ١٥- حەقیقەتی زوهد

دیتم گەورەترین فرتوفێڵی شەیتان ئەوەیە کە دەوڵەمەند و زەنگینەکان دەور بدات بە هیوا و ئومێد و سەرقاڵکردنیان بەو چێژ و خۆشییانەی لە ئاخیرەت و کارکردن بۆی دایدەبڕن!

ئەگەر بە ماڵ و پارەوپووڵی دڵبەست کردن و هانی کۆکردنەوە و بەدەسهێنانی دان ئەوا وەکوو ڕەزیلی و دەسقوچاوی فەرمانیان پێ دەکات پاسەوانی لێ بکەن، ئەوەش لە فرتوفێڵە بەهێزەکانییەتی.

پاشان لەم بابەتەدا فرتوفێڵە ورد و پەنهانەکانی خۆی شاردۆتەوە کاتێ ئیمانداران لە کۆکردنەوەی ماڵ و پارە دەترسێنێ، بەوەش ئاخیرەتخواز لێی دوور دەکەوێتەوە و تۆبەکاریش ئەوەی لە دەستیەتی دەیبەخشێ.

ئیتر ئەهریمەن(شەیتان) بەردەوام لەسەر زوهد(وازهێنان لە دونیا) هانی دەدا و فەرمانی وازهێنان لە ماڵی پێ دەکات و لە ڕێگاکانی کار و کاسبی دەترسێنێ و وا دەردەخات کە ئەوەی لە دڵسۆزی و بۆ پاراستنی دینەکەیەتی، لە پەنهانییەکانی ئەوەشدا شتی سەیروسەمەرە لە فرتوفێڵی هەیە!

لەوانەیە شەیتان لەسەر زاری هەندێ لەو پیرانەی تۆبەکار پەیڕەوی لە گوفتار و ڕەفتارەکانیان دەکات پێی بڵێ: لە ماڵەکەت دەرچوو و بڕۆ نێو دەستەی زاهیدانەوە! هەر کات نانی نیوەڕۆ یان ئێوارەت هەبوو ئەوا تۆ لە ئەهلی زوهد نیت و ئاستەکانی ئیرادە و پێداگری (مراتب العزم) بەدەست ناهێنی... ڕەنگە ئەو فەرموودانەی زۆر بۆ دووبارە بکاتەوە کە دوورن لە ڕاستی یان هۆکار و واتای تایبەتیان هەیە.

ئەگەر ئەوەی هەیەتی هەمووی بەخشی و وازی لە کارکردن هێنا ئینجا دێت چاوی دەبڕێتە پەیوەندیی براکان یان هاوڕێیەتیی دەسەڵاتداری لە کن جوان دەبێ چونکە ناتوانێ لەسەر ڕێی زوهد و تەرکی دونیا بەردەوام بێت تەنێ چەند ڕۆژێ نەبێ، پاشان سروشتی مرۆڤانەی دەگەڕێتەوە و خواستەکانی دووبارە دەکاتەوە، ئیتر دەکەوێتە نێو قێزەونتر لەوەی لێی ڕایکردووە و یەکەم شتێ کە بۆ وەدەسهێنانی دونیا دەیبەخشێ دین و ئابڕوویەتی و بازرگانی پێوە دەکات و دەچێتە ڕیزی دەستپانکەرەوان..

ئەگەر بێتوو سەیری ژیاننامەی پیاوان و خانەدانەکانیانی کردبووایە و، سەرنجی فەرموودە دروستەکانی دابووایە لەبارەی سەرکردەکانیان ئەوا دەیزانی کە (ئیبراهیم)ی دۆست و خۆشەویستی خودا (صەڵات و سەلامی خوای لێ بێت) خاوەنی ئەوەندە ماڵی دونیا بوو تا ئەوەی مەڕوماڵاتەکەی لە شارەکەیدا جێی نەدەبووەوە، هەروەها (لوط) یش (صەڵات و سەلامی خوای لێ بێت) بە هەمان

شێوه و، زۆرێك له پێغەمبەرانیش (صەڵات و سەلامی خوایان لێ بێت) و ژمارەیەکی فرەش له هاوەڵان..

له کاتی نەبوونیشدا ئارامیان گرتووه و بۆ پەیداکردنی بژێویان کەمتەرخەمیان نەکردووه و ئەوەی ڕێپێدراو بووه خواردوویانه.

ئەبووبەکر (خودای لێ ڕازی بێت) بۆ بازرگانی دەردەچوو و پێغەمبەریش(دروودی خوای لێ بێت) زیندوو بوو.

زۆربەیان بەشی خۆیان له (بیت المال) وەردەگرت و ئەوەی لێیان زیاد بووایه دەیانبەخشی و، له زەلیلی ئاتاجبوون بە برایان سەلامەت دەبوون.

(ئیبن عومەر) هیچ شتێکی ڕەت نەدەکردەوه و داواشی نەدەکرد.

ئەز ئەم حاڵەم له زۆرێك له ئەهلی دین و زانست بینیوه، دیتوومه له سەرەتادا زانست له کارکردن مەشغوولی کردوون، ئەوان که له هەمووان زیاتر شیاوی شکۆمەندی بوون کاتێ پێویستیان به خۆژیاندن بووه زەلیل بوون.

لەسەر ژیر و هۆشمەند پێویسته ئەوەی هەیەتی بیپارێزێ و له کار و کەسابەت خۆی ماندوو بکات تا ناچار نەبێ مەرایی و ماستاو بۆ ستەمکار یان مامەحەمەیی بۆ نەزان بکات و ئاوڕ نەداتەوه بۆ قسه پڕوپووچەکانی ئەو خۆ بە سۆفیزانانەی به ئارەزووی خۆیان بانگەشەی هەژاری دەکەن، هەژاری تەنها نەخۆشی پیر و پەککەوتەکانه، ئارامگر لەسەر هەژاری، پاداشتی ئارامگر لەسەر نەخۆشی هەیه مەگەر کەسێك له کارکردن ترسنۆك بێت و به کەم ڕازی بێت، ئەوەش له پله و

ئاستی پاڵەوانەکاندا نییە بەڵکوو ئەوە لە پلە و پێگەی ترسنۆکە زاهیدەکاندایە، بەڵام ئەوەی ئیش دەکات بۆ ئەوەی بەخشەر بێت نەك پێ بەخشراو، خێرکەر بێت نەك خێرپێکراو ئەوا لە پلە و ئاستی ئازا ئاکاربەرزەکانە..

هەر کەسێ سەرنج لەمە بدات شەرەفی بێنیازی و دەوڵەمەندی و، سەرکێشی و زیانباریی هەژاری دەزانێ.

## ١٦- خەفەت بۆ ئەوەی لە دونیا لە دەستت چووە مەخۆ

لە حاڵوباری ئاکارچاکان(الفضلاء) ڕامام، دیتم بەزۆری لە بەش و بەختی دونیا کەمبەش دراون و بەشی زۆری دونیا کەوتۆتە دەستی کەموکورتان (أهل النقائص).

سەیری ئاکارچاکانم کرد دیتم خەم لەوە دەخۆن کە لە دونیا لە دەستیان چووە و کەموکورتان وەدەستیان هێناوە، ڕەنگە هەندێکیان لە حەژمەتدا وەسکیان دابێ!

لەگەڵ هەندێك لەم خەمخۆر و خەفەتبارانە دوام و پێم وت: ماڵوێران! کاروبارت ڕێکخە، تۆ لە چەند ڕوویەکەوە هەڵەیت:

یەکەم: ئەگەر تۆ بۆ دونیاخوازی هیممەتت هەیە ئەوا بۆ وەدەسهێنانی تێبکۆشە، ئیتر بۆ لەدەستچوونی، خەفەتت لە کۆڵ دەبێتەوە، تۆ دانیشیت و خەم و داخ بۆ ئەوە بخۆیت کە غەیری تۆ وەدەستی هێناوە و تەنبەڵ و تەوەزەل لێی ڕاکشێیت ئەوا ئەوپەڕی دەستەوسانی و بێدەسەڵاتییە.

دووەم: دونیا بۆ ئەوە دەویسترێ وەکوو پردێك بەسەریدا بپەڕیتەوە نەك بیکەیتە ماڵی هەمیشەیی و ئاوەدانی بکەیتەوە، زانست و تێگەیشتنەکەشت هەر ئەوەت پێ دەڵێن و پێ نیشان دەدەن، ئەو بەخشش و زیادەشی کەموکورتان لە دونیا دەستیان دەکەوێ ئازاری جەستە و دینیان دەدات. ئەگەر ئەوەت زانی پاشان هەر

خەفەتت بۆ لەدەستدانی ئەوە خوارد کە لەدەستدانی بۆ تۆ باشترە ئەوا خەفەتخواردنەکەت سزایەکە بۆ خەمخواردن بۆ شتێك کە دەزانیت بەرژەوەندیت لە دووربوونتە لێی، ڕازیبە بەوەی ئەوە سزای دونیات بێت ئەگەر لە سزای دوارۆژ سەلامەت بیت.

سێیەم: تۆ زانیوتە کە بەراورد بە ئاژەڵ بەشی مرۆڤ بە گشتی لە خواردن و چێژەکانی دونیا کەمترە، چونکە ئاژەڵ لە دونیا زیاتر و هێمنتری دەست دەکەوێ بەڵام تۆ لەگەڵ ترسدا کەمتریشت دەست دەکەوێ.

ئەگەر بەشت لە دونیا دوو هێندە کرایەوە ئەوا ئەوە دەتگەیەنێ بە ئاژەڵ، لەو ڕووەوە کە ئەوە لە وەدەسهێنانی فەزیلەت و ئاکارە جوانەکان مەشغوولی دەکات، بارسووکی، خاوەنەکەی هەڵدەنێ بۆ وەدەسهێنانی پلەبەرزەکان.

ئەگەر لە بەشی دونیا ئارەزووی زیادەت کرد ئەوا زانست و زانیارییەکەت سووك و عەیبدار کردووە و ئەمەش نیشانەیە بۆ ئەوەی کە لە بیروبۆچوونتدا تێکەڵ و پێکەڵی هەیە !

## ١٧- بۆچی خەڵك دەچێتە نێو پاوانی قەدەغەکراوەکانەوە؟

سەرنجم دا لە بەپیرەوەچوونی زانایان بەرەو ئەو ئارەزووانەی نەفس کە نەهی لێ کراوە دیتم ئاستێکە نزیك دەبێتەوە لە بێباوەڕی(الکفر) ئەگەر واتایەك دەرنەکەوێ کە بریتییە لەوەی خەڵك لە کاتی ئەنجامدانی کارێکی قەدەغەکراوەوە دابەش دەبن بۆ:

– هەیە نازانێ کە ئەوە یاساغکراوە، ئەمەیان جۆرێکە عوزری هەیە.

– هەیە پێی وایە قەدەغەکراوەکە مەکرووهە نەك حەرامکراو، ئەمەش نزیکە لەوەی یەکەم، ڕەنگە ئادەم (صەلات و سەلامی خوای لەسەر بێت) بچێتە نێو ئەم بەشەوە.

– هەیە تەئویل دەکات و سەرچیغ دەڕوات(هەڵە دەکات)، هەروەك دەوترێ: ئادەم(صەلات و سەلامی خوای لەسەر بێت) لە درەختێکی دیاریکراو نەهی لێ کرا، ئەو لە ڕەگەزی وی خوارد نەك لە دیاریکراوەکە!

– هەیە دەزانێ حەرام کراوە بەڵام زاڵبوونی ئارەزوو بەیادهاتنەوەی ئەوەی بیربردۆتەوە، ئەوەی بینیویەتی مەشغووڵی کردووە لەوەی دەیزانێ.

لەبەرئەمە دز دەسبڕینی لەبیر نییە بەڵکوو بەتەواوی بۆ دەسکەوتنی بەشەکەی خۆی لەبیردەکات، ئەو کەسەشی داوێنپیسی دەکات نە ئابڕووچوونی لە یادە نە حەد، چونکە ئەوەی دەیبینێ بێئاگای دەکات لەوەی دەیزانێ.

– هەیە بە قەدەغەکردنەکە دەزانێ و لەبیریشیەتی بەڵام بە لەسەرخۆیی و لێبووردەییی (خودا) هەڵدەخەڵەتێ.

ئەمە ئەگەر ئەوەش ڕاست بێت بەڵام بۆ کەسی ژیر وەها باشترە توندوتۆڵ و گورج بێت، چۆن نا کە زانیویەتی ئەم پاشا دانایە لە چارەکە دینارێك دەستی بڕیوە و بینای جەستەیەکی مەحکەمی بە هۆی چێژوەرگرتنی ساتێك بە بەردبارانکردن ڕووخاندووە و چەندانی تری بە نغرۆکردن لە زەوی و مەسخکردن و نقوومکردن سزاداوە..؟!

## ١٨- تەرازووی داد

هەر کەسێك لە کردەوەکانی خودای پاك و بێگەرد ڕابمێنێ دەبینێ هەمووی لەسەر یاسای داد ڕۆنراوە و هەروەها دەبینێ کە سزا بۆ سزادراو ئامادەکراوە ئەگەر دوای ماوەیەکیش بێت، بۆیە نابێ ئەو کەسەی جارێ چاوپۆشی لێ کراوە هەڵبخەڵەتێ و لەخۆبایی بێت چونکە هەندێ کات سزا دوادەکەوێ.

لە قێزەونترین ئەو گوناهانەی سزایەکی گەورەی بۆ ئامادە کراوە سووربوونە لەسەر گوناه، پاشان خاوەنەکەی بە داوای لێخۆشبوون (استغفار) و نوێژ و پەرستش فریوبازی دەکات و پێی وایە ئەو فریوبازییە سوودی هەیە!

لەخۆباییترین و بێئاگاترینی خەڵك ئەو کەسەیە کە ئەو کارانە دەکات کە خودا پێی ناخۆشە و داوای ئەو شتانەشی لێ دەکات کە خۆی حەزی لێیە و پێی خۆشە، هەروەك لە فەرموودەدا هاتووە: ((دەستەوسان ئەو کەسەیە نەفسی دەخاتە شوێن ئارەزووەکانی و هیوا و ئاوات و خۆزگە لە خودا دەخوازێ.)) لاواز(ضعیف)ە.

لەسەر کەسی هۆشمەند پێویستە چاوەڕێ و چاودێریی ڕوودانی سزا بکات:

(ئیبن سیرین) وتوویە: تانە و تەشەرم لە پیاوێکدا و پێم وت: ئەی پەڕپووت(مفلس)! دوای چل ساڵ خۆم پەڕپووت بووم.

(ئيبن ئەلجەلاء) وتوويەتى: مامۆستايەكم بينيمى وا سەيرى لووسكەڵەيەك دەكەم!
گوتى: ئەمە چييە؟! سەرەنجامەكەيت دێتەوە پێش...دواى چل ساڵ قورئانم لەبيربرايەوە!

بە پێچەوانەى ئەمەوە هەر كەسێك كردەوەيەكى باشى كرد يان نيازى ڕاست كردەوە با چاوەڕێى پاداشتى باش بكات ئەگەر ماوەيەكيش بخايەنێت.

خوداى گەورە فەرموويەتى: ﴿ إِنَّهُۥ مَن يَتَّقِ وَيَصۡبِرۡ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴾ (يوسف: ٩٠) واتە: هەر كەسێ تەقواى خودا بكات و ئارام بگرێ ئەوا خودا پاداشتى چاكەكاران ون ناكات.
پێغەمبەرى خوداش (صلى الله عليه وسلم) فەرموويە: ((هەر كەسێك چاو لە جوانييەكانى ژنێك بپۆشێ ئەوا خودا بە ئيمانێك پاداشتى دەداتەوە كە شيرنايیەكەى لە دڵيدا هەست پێ دەكات.)) زۆر لاواز (ضعيف جدا).

با كەسى ژير بزانێ تەرازووى داد چاوپۆشى ناكات.

## ١٩- بیدعەی تەسەووف

لە حاڵوباری سۆفی و زاهیدانەکان وردبوومەوە دیتم زۆرتریان لە شەریعەت لایانداوە جا بە هۆی نەزانینیان بێت بە شەرع یان بیدعەکارییان بە هۆی ڕاوبۆچوونەوە، ئایەتگەلێك دەکەنە بەڵگە کە لە واتاکەی تێ ناگەن و فەرموودەگەلێك دەهێننەوە کە هۆکاری خۆیان هەیە و زۆربەیان ساغ نەبوونەتەوە.

لەوانە: ئەوان گوێیان لە قورئان بووە کە دەفەرموێت: ﴿وَمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَآ إِلَّا مَتَـٰعُ ٱلْغُـرُورِ ﴿١٨٥﴾﴾ (آل عمران: ١٨٥) واتە: ژیانی دونیا بێجگە لەوەی کە ڕابواردنێکی خەڵەتێنەرە شتێکی تر نییە.

یان ﴿وَمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَآ إِلَّا مَتَـٰعُ ٱلْغُـرُورِ ﴿٢٠﴾﴾ ( الحديد: ٢٠) واتە: ژیانی دونیا گەمە و ڕابواردن و ڕازاندنەوەیە..

هەروەها لە فەرموودەدا بیستوویانە: ((لَلدُّنيا أهونُ على الله من شاةٍ ميتةٍ على أهلها)).

واتە: ((مەڕێکی مردار لای خاوەنەکەی چەند بێنرخە، دونیاش لەلای خودا بێنرخترە)) موسلیم گێڕایتییەوە.

بێ ئەوەی لە حەقیقەتی دونیا بکۆڵنەوە لە پشت تێکردنی زیادەڕەوییان کردووە!

ئەگەر حەقیقەتی شتێك نەزانیت دروست نییە نە ستایش بکرێت و نە زەم.

ئەگەر لە دونیامان کۆڵییەوە دەبینین ئەم زەوییە ڕاخراوە کراوەتە شوێنی نیشتەجێبوون و ئۆقرەگرتنی خەڵق، خواردنیان لەوێوە بۆ دێتەدەر و مردووەکانیان تێدا دەنێژن. نموونەی ئەمەش زەم ناکرێ چونکە بەرژەوەندی مرۆڤی تێدایە. بینیمان ئەو ئاو و ڕووەك و ئاژەڵەی لەسەریەتی هەمووی بۆ سوود و بەرژەوەندی مرۆڤە و پاراستنی هۆکاری مانەوەیەتی، دیتمان مانەوەی مرۆڤیش هۆکارێکە بۆ ناسینی پەروەرێن و پەرستن و خزمەتکردنی. شتێکیش هۆکاری مانەوەی خواناسی خواپەرست بێت ستایش دەکرێ نەك زەم.

کەواتە بۆمان ڕوون بوویەوە کە زەم بۆ کردارەکانی کەسی نەزان یان یاخییە لە دونیا.

## ئەگەر مرۆڤ ماڵی حەلاڵ و ڕێپێدراوی دەست خست و زەکاتەکەی دا ئەوا هیچ گلەییەکی لێ ناکرێ:

زانراوە کە (زوبەیر) و (ئیبن عەوف) و ئەوانیتر چییان لە دوای خۆیان بەجێهێشتووە، خێر و سەدەقەی ئیمامی عەلی (خودای لێ ڕازی بێت) گەیشتۆتە چل هەزار. (ئیبن مەسعوود) نەوەت هەزاری دوای خۆی بەجێهێشت. (لەیث کوڕی سەعد) وەبەرهێنانی ساڵانەی بیست هەزار بوو. (سوفیانی ثەوری) بازرگانی دەکرد. (ئیبن مەهدی) ساڵانە دوو هەزار دینار وەبەرهێنانی بوو.

## ئەگەر ژنی زۆری هێنا ستایشکراوە نەك زەمکراو:

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) چەندان هاوسەری هەبوو. زۆرینەی هاوەڵانیش ژنی زۆریان هەبووە، عەلی کوڕی ئەبوو تاڵیب چوار ژنی ئازاد و حەڤدە کەنیزەکی هەبووە. حەسەنی کوڕی نزیکەی چوار سەت ژنی هێناوە (باوکی لەسەر ئەمە سەرزەنشتی کردووە و داوای لە خەڵك کردووە ژنی نەدەنێ).

ئەگەر مرۆڤ بە مەبەستی منداڵ هاوسەرگیری بکات ئەوە ئەوپەڕی خواپەرستییە، ئەگەر مەبەستیشی چێژوەرگرتن بوو ئەوا ئاسایی و ڕێپێدراوە و لەمەشدا خواپەرستییەکی بێشومار هەیە لە پاکڕاگرتنی داوێنی خۆی و ژنەکە و ...هیتریش.

پێغەمبەر موسا (سەلامی خوای لەسەر بێت) (١٠) دە ساڵ لە تەمەنی خۆی بۆ مارەیی کچی شوعەیب خەرج کرد. ئەگەر هاوسەرگیری لە باشترینی شتەکان نەبووایە زۆرێك لە کات و تەمەنی پێغەمبەران لەودا نەدەڕۆیشت. (ئیبن عەبباس) وتوویە: باشترینی ئەم ئوممەتە ئەوەیانە کە زۆرترین ژنی هەیە..

سەبارەت بە خواردن و خۆراکیش ئەوا مەبەست لێی بەهێزکردنی جەستەیە بۆ خزمەتکردنی خودای گەورە، هەموو خاوەن سوارێك دەبێ خزمەتی سوارەکەی بکات تاوەکوو بە کەڵکی بێت و هەڵیبگرێت.

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) چی هەبووایە دەیخوارد، ئەگەر گۆشت هەبووایە دەیخوارد، گۆشتی مریشکی دەخوارد، حەڵوا و هەنگوینی لە هەموو شتێك لە کن

خۆشتر و خۆشەویستتر بوو، لێی نەگێڕدراوەتەوە کە شتێکی ڕێپێدراو(مباح)ی ڕەت کردبێتەوە.

ڕۆژێك فالودەیەکیان (فالوذج) بۆ عەلی کوڕی ئەبووتالیب (خوا لێی ڕازی بێت) هێنا و ئەویش لێی خوارد و وتی: ئەمە چییە؟ گوتیان: ڕۆژی نەورۆزە، وتی: نەورۆزی ئێمە هەموو ڕۆژێکە.

مەکروە و ناپەسند ئەوەیە لەسەر تێربوون هەر بخۆیت و بۆ خۆبادان و فیز و دەعیە جلوبەرگ بپۆشیت.

هەندێ خەڵك بە خوارتر لەوە قایل بوون چونکە حەڵاڵی پاك و بێخەوش نزیکە نەکرێ مەبەستی تێدا بەدی بهێنرێ وەگەرنا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کراسێکی بە نرخی (٢٧) بیست و حەوت حوشتر بۆ کڕدرا (ئەم فەرموودەیە لاوازە).. (تەمیمی ئەلداری) کراسێکی هەبوو بە هەزار درهەم کڕدرابوو، شەوانە نوێژی پێوە دەکرد.

خەڵکانێك هاتن وازهێنان لە دونیا (التزهد) یان دەرخست و ڕێگایەکیان داهێنا کە هەوا و ئارەزوو بۆی ڕازاندبوونەوە پاشان بەڵگەیان بۆ خواست، بەڵام پێویستە مرۆڤ شوێن بەڵگە بکەوێت نەك شوێن ڕێگایەك بکەوێت و بەڵگەی بۆ بخوازێ و داتاشێ! پاشان ئەمانە دابەش بوون:

هەیانە لە ڕواڵەتدا نمایش و نواندن (تصنع) دەکات و لە ناخەوەش شێری دڕندەیە، لە خەڵوەت و تەنهاییەکانیدا خەریکی شەهوەتبازی و سەرگەرمی چێژ و

خۆشییەکانە و بە جلوبەرگەکانیشی وا پیشانی خەڵك دەدات کە سۆفی و زاهیدە، بەڵام تەنها کراسەکەی زوهدی نواندووە و ئەگەر سەیری حاڵوباری بکەیت خۆبەزلزانیی فیرعەونی هەیە.

هەیانە ناخیان ساغە بەڵام لە شەرعدا نەزانە.

هەیانە بۆتە پێشەوا و کتێبی داناوە، لەم ڕێگایەدا نەزانەکان شوێنی کەوتوون وەکوو کوێرێك شوێن کوێرێك کەوتبێ، ئەگەر ئەوان لە سەرەتادا سەرنجی ئەو ڕێگایەیان دابووایە کە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و هاوەڵان لەسەری بوون ئەوا نەدەخلیسکان و لایان نەدەدا.

کۆمەڵێك لە لێکۆڵەران بایەخ نادەن بە کەسێکی گەورە لە بەرچاو و دڵان ئەگەر لە شەریعەت لایدا بەڵکوو سەرکۆنەیەکی زۆری دەکەن:

لە ئیمامی ئەحمەد گێڕدراوەتەوە کە (ئەلمەروەزی) پێی وتووە: لەبارەی ژنهێنانەوە چی دەڵێیت؟ وتوویە: سوننەتی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم).. مەروەزیش وتوویەتی: ئیبراهیم کوڕی ئەدهەم گوتوویەتی.... ئیتر ئیمامی ئەحمەد قسەکەی پێ بڕیوە و بەسەریدا هاواری کردووە و پێی وتووە: قسەی پڕوپووچم بۆ دەکەیت!

هەروەها بە ئیمامی ئەحمەد وترا: (سەری ئەلسەقەطی) وتوویە: کاتێ خوای گەورە پیتەکانی خولْقاند (ئەلیف) وەستا و (باء)یش کڕنووشی برد..ئەویش وتی: خەڵکی لێ بتەکێننەوە..

بزانە کە لێکۆڵەر ناوێکی زل و گەورەکراو سەرسامی ناکات هەروەك پیاوێك بە عەلی کوڕی ئەبوو تالیب (خودای لێ ڕازی بێت) وت: ئایا پێت وایە طەلحە و زوبەیر لەسەر ناڕەوا بووبن؟ ئەویش وتی: ( إنَّ الحقَّ لايُعرَفُ بالرجال، اعرفِ الحقَّ تَعرِف أهلَه) واتە: هەق و ڕاستی بە پیاوان ناناسرێت، هەق بناسە خاوەنەکەی دەناسیت.

بەدڵنیاییەوە گەورەکردنی خەڵکێك لە دڵ و دەرووندا جێگیر بووە، ئەگەر شتێکیان لێ گێڕدرایەوە و نەزانێك گوێی لێ بوو ئەوا پەسندی دەکات چونکە لە دڵ و دەروونیدا گەورەیە.

لە (ئەبی یەزید) گێڕدراوەتەوە کە وتوویە: نەفسم هەندێ گەمژەیی و پێدرێژی کرد سوێندم خوارد ساڵێك ئاو نەخۆمەوە.

ئەگەر ئەمە ڕاست بێت ئەوا هەڵەیەکی ناشیرین و خلیسکانێکی ناقۆڵایە چونکە ئاو خۆراك بۆ جەستە دەبات و هیچ شتێك جێی ناگرێتەوە ئەگەر نەیخواتەوە ئەوا ئازاری جەستەی خۆی داوە، لە فەرموودەدا هاتووە کە ئاو بۆ پێغەمبەر (صلی اللە علیە وسلم) شیرین دەکرا.

ئایا پێت وایە ئەمە کرداری کەسێك بێت کە دەزانێ نەفسی هی خۆی نییە و دروست نییە بە بێ مۆڵەتی خاوەنەکەی ڕەفتاری تێدا بکات؟!

هەروەها لە زاری سۆفییەك دەگێڕنەوە کە وتوویە: بە پشتبەستن بە خودا بە پێخواسی ڕێگای شاری مەککەم گرتەبەر، کە دڕکێك لە پێم ڕادەچوو بە زەویمدا

دەهێنــا و دەرم نــەدەهێنا، جلوبــەرگێکی زبــرم (مســح) لەبــەردابوو، ئەگــەر چــاوم ئێشابایە بەم جلوبەرگە زبرە هەڵمدەگلۆفت، بەم هۆیەوە چاوێکم لەدەست دا.

نموونــەی ئەمــە زۆرە، ڕەنگــە چــیرۆکخوانەکان بــە کەرامــەتی لێکدەنــەوە و لــە کــن ڕەشەخەڵك گەورەیان کردووە و وایان بۆ وێنا دەکەن کــە بکــەری ئەمــە لــە ئیمــامی شافیعی و ئەحمەد پلەبەرزترن!

سوێند بە خودا بەڕاستی ئەمە لە تاوانە هەرەگەورەو نەنگییە زۆر کرێتەکانە چونکە خــودای مــەزن دەفــەرموێت: ﴿وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمْ﴾ (النســاء: ٢٩) واتــە: خۆتــان مەکوژن.

هــەروەها پەیامبــەر فەرموویــەتی: ((إنَّ لنفســك عليــك حقــا)) بوخــاری و موســلیم گێڕاپیتیانەوە واتە: نەفست مافی بەسەرتەوە هەیە.

لە کاتی کۆچکردن بۆ مەدینە، ئیمــامی ئەبووبــەکر بــەدوای ســێبەرێك بــۆ پێغەمبــەر (صلى الله عليه وسلم) گەڕا تا تاوێرێکی دۆزییەوە و لە سێبەرەکەیدا ڕایــەخێکی بــۆ ڕاخست.

سەرەتاکانی ئەم کەمتەرخەمییە لە هەندێ لە پێشــینانی ئــەم ئوممەتــەوە هــاتووە، هۆیەکەشی لە دوو ڕووەوە بووە: یەکەمیان: نەزانین و نەبوونی زانیاری. دووەمیان: نزیکبوونی لە سەردەمی ڕەهبانییەت.

(حەسەنی بەسری) لەبارەی زوهدەکەیانەوە ڕەخنەی لە (فەرقەدی سەبخی) و (مالیکی کوڕی دینار) دەگرت، ڕۆژێك خواردنێکی لەکن دیترا کە گۆشتی تێدابوو، وتی: نە دوو کولێرەکەی مالیك و نە دوو قاپەکەی فەرقەد.

ڕۆژێکیان کراسێکی بەبەر فەرقەدەوە بینی، پێی وت: ئەی فەرقەد! زۆربەی ئەهلی دۆزەخ ئەوانەن کراسیان لەبەرە!

چەندان چیرۆکخوان کۆڕەکەی بە باسکردنی ئەو خەڵکانە ڕازاندۆتەوە کە بێ هیچ توێشوو و ئاوێك چوونەتە گەڕان بێ ئەوەی بزانێ کە ئەمە لە ناشیرینترین کردارەکانە و خوای گەورە تاقی ناکرێتەوە، ڕەنگە نەزانێکی تۆبەکار گوێی لێ بێت و دەرچێت و لە ڕێگا بمرێت، ئیتر چیرۆکخوان بەشی خۆی لەم گوناه و تاوانە وەبەر دەکەوێ!

چەندان جار و چەندین کەس لە (ذي النون) دەگێڕنەوە کە لە کاتی گەڕاندا تووشی ژنێك بووە و قسەیان لەگەڵ یەکتردا کردووە، ئەو فەرمووده ڕاستانە لەبیردەکەن کە دەڵێ: (( لايَحِلُّ لامرأةٍ أن تسافِرَ يوما و ليلة إلا بِمَحرَم)) بوخاری و موسلیم گێڕاپتیانەوە. واتە: بۆ هیچ ژنێك دروست نییە کە شەو و ڕۆژێك سەفەر بکات مەگەر لەگەڵ مەحرەمێك نەبێ.

چەندان جار ئەوە دەگێڕنەوە گوایە کەسانێك لەسەر ئاو ڕۆیشتوون، (ئیبراهیم ئەلحەربی) وتوویە: هەرگیز ڕاست نییە هیچ کەسێك بەسەر ئاوەوە ڕۆیشتبێت! ئەگەر گوێبیستی ئەم قسەیە ببن دەڵێن: ئایا نکوولی لە کەراماتی پیاوچاکان

دەکەن؟! دەڵێین: ئێمە نکوولّی لە کەرامات ناکەین بەڵکوو شوێن ئەوە دەکەوین کە ڕاست و دروستە، پیاوچاکان ئەوانەن کە شوێن شەرع دەکەون و نابنە کۆیلەی ڕاوبۆچوونەکانیان. لە فەرموودەدا هاتووە: بەنی ئیسرائیل دینیان لەسەر خۆیان توند کرد خوداش لەسەری توندکردن.

چەندە هانی هەژاری دەدەن تا ئەوەی خەڵکانێکیان ناچارکرد ماڵ و دارایيان هەموو ببەخشن پاشان چارەنووسیان ئەوە بوو: لە کاتی پێویستیدا توورە بن یان دەرۆزە (سواڵ) لە خەڵك بکەن!

چەندان موسڵمان بە هۆی فەرمانکردنی ئەوان بە خەڵك تا کەمخۆری (تقلل) بکەن ئازاری پێ گەیشت! لە کاتێکدا پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: ((سێیەك بۆ خۆراك، سێیەك بۆ ئاو، سێیەك بۆ هەناسە)) ئیبن ماجە و تیرمیزی گێڕاویتیانەوە...بەوەندەش قەناعەتیان نەکرد تا فەرمانیان بە زیادەڕەوی لە کەمخۆری کرد.

(ئەبوو تالیب ئەلمەککی) لە (قوت القلوب)دا دەڵێ: کەسی وایان تێدا بوو شتێکی زۆر کەمی دەخوارد و هەموو شەوێك کەمێك لە تەڕایی جەستەی دەڕۆیشت! منیش یەکێك بووم لەوانەی لە گچکەییدا پەیڕەویم لە قسەی وی دەکرد، ئیتر ڕیخۆڵەم تەسك بووەوە و ئەوەش بووە هۆی نەخۆشکەوتنی چەندین ساڵەم!

ئایا پێتوایە ئەمە شتێکە دانایی دەیخوازێ یان شەرع بانگهێشتی بۆ کردووە؟!

ئـەو شـتەی مـرۆڤ پشـتی پـێ قـاییم دەبـێ هێـز و توانایـەتی، ئەگـەر هـەوڵی کەمکردنەوەیدا ئەوا لە خواپەرستیش سست دەبێ.

مەلێ: دەسکەوتنی حەڵاڵی پەتی ئەستەمە لەبەرئـەوە بـۆ دوورکەوتنـەوە لـە شـتی گوماناوی زوهد پێویست بووە، ئەوەندە بۆ ئیماندار بەسە کە لە کـار و پەیـداکردنی بژێویدا بەدوای حەڵاڵدا بگەڕێ و لەسـەری نییـە بـەدوای ڕەگ و ڕیشـەی ئـەو مـاڵ و داراییانەی لێوە هاتووە بگەڕێ، ئەگەر ئێمە چووینە وڵاتی بێباوەڕان نرخی ئارەق و کرێی بەدکاریمان دەست کەوت بە وەسفی دەسکەوت(الغنیمة) بۆمان حەڵاڵە.

ئایا حەڵاڵێکت بەو واتایە دەوێت کە دەنکە زێڕێك لەو دەمـەی لـە سەرچـاوەکەیەوە هاتووە بە هیچ چەشنێك نەکەوتۆتە دەستێکی نادروستەوە؟ ئەمە شتێکە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هەرگیز بایەخی پێ نەداوە.

ئایا گوێت لێ نەبووە کە صەدەقە بۆ ئەو حەرام بووە بەڵام کاتێ گۆشـتی صـەدەقە بۆ (بەریرە) هات ئەویش وەکوو دیاری بـۆ پێغەمبـەری بـرد خـواردنی بـۆی دروسـت بوو چونکە وەسفەکەی لە صەدەقەوە بۆ دیاری گۆڕا.

ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دەڵێ: کەمخۆریم پێ خۆش نییە چـونکە خـەڵکێك کەمخۆرییان کرد لە ئەنجامدانی فەرزەکان دەستەوسان بوون.

ئەمـە ڕاسـتە چـونکە کـەمخۆر هـەر کـەمتری دەکاتـەوە تـا ئـەوەی نـاتوانێ نوێـژە سـوننەتەکان بکـات پاشـان فـەرزەکان و پاشـان لـە چـوونە لای هاوسـەرەکەی

دەستەوسان دەبێ و توانای کارکردن و نان پەیداکردنی نامێنێ و تاقەتی ئەو کارە خێرانەشی نامێنێ کە پێشتر دەیکردن.

ئەو فەرموودانە نەتترسێنن کە هانی برسێتی دەدەن چونکە مەبەست لێیان: یان هاندانە لەسەر ڕۆژووگرتن یان نەهیکردنە لە زۆرخۆری و چلێسی، بەلاّم کەمکردنەوەی خواردن بەبەردەوامی ئەوا کاردەکاتە سەر هێز و تواناکانی مرۆڤ بۆیە دروست نییە.

پاشان لەم جۆرە کەسە زەمکراوانە کەسانێك هەن کە پێی وایە گۆشت خواردن تەرك بکرێ کەچی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) حەزی دەکرد هەموو ڕۆژێك گۆشت بخوات.

بەڕاشکاوی و بێ پێچوپەنا گوێت لێم بێت: هیچ کەسێك ناوی پیاوانم بۆ نەکاتە بەلگە و بلێ: (بیشر ئەلحافی) وای وت و (ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم) وای وت، هەر کەسێ قسە و ڕەفتاری پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) و هاوەلاّنی بکاتە بەلگە ئەوا ئەوە بەهێزترین بەلگەیە.

کردەوەی ئەوانە چەند ڕوویەکی هەیە ئێمە بە گومانی باشەوە لێکدانەوەیان بۆ دەکەین:

لەگەلّ هەندێ لە پیرەکانمان وتووێژم کرد لەبارەی کۆمەلێك لە سادات سەبارەت بەوەی کتێبەکانیان خستۆتە ژێر خاکەوە! پێم وت: ئەمە واتای چییە؟ گوتی:

باشترین شتێك لەوبارەوە بیلێین ئەوەیە بێدەنگ بین! ئاماژەی بۆ ئەوە كرد كە ئەمە نەزانییەكی بكەرەكەی بووە.

منیش بۆم تەئویل كردوون و وەها لێكمداوەتەوە و گوتم: ڕەنگە ئەو كتێبانەی ژێرخاكیان ناوە شتێك لە ڕاوبۆچوونی تێدابووە كە پێیان باش نەبووە خەڵك كاریان پێ بكات.

لە (ئەحمەد كوڕی ئەبی ئەلحەواری) گێڕدراوەتەوە كە كتێبەكانی دەست داوەتێ و هەمووی تووڕ داوەتە نێو دەریاوە و وتوویەتی: ئێوە باشترین ڕێبەر(دلیل) بوون ئێستاش دوای گەیشتن بە مەدلوول پێویستمان پێیان نەماوە!. ئەمە ئەگەر گومانی باشمان پێی برد دەڵێین: لەو كتێبانەدا هەندێ قسە هەبووە كە جێی ڕەزامەندی نەبووە. بەڵام ئەگەر زانست و زانیاری ڕاست و دروست بن ئەوا ئەمە لە قێزەونترین ونكردن و بەفیڕۆدانە.

من كە ئەمەم بۆ تەئویل كردن لێكدانەوەیەكی دروستە لە هەمبەر زاناكانیان چونكە لە (سوفیانی ئەلثەوری)ش گێڕدراوەتەوە كە وەسییەتی كردووە كتێبەكانی ژێرخاك بكرێن چونكە لەو شتانە پەشیمان ببۆوە كە لەبارەی هەندێ كەسی نووسیبوو و وتوویە: ئارەزووی فەرمووده هانیدام. ئەمە چونكە ئەو قسەی لە زاری لاواز و تەرككراوەكان (الضعفاء و المتروكين)یش دەنووسی، وا دیارە كاتێ كە نەیتوانیوە ڕاست و ناڕاست لێك جیاكاتەوە ڕایسپاردووە هەموو كتێبەكانی ژێرگڵ بكرێن. هەروەها هەر كەسێك ڕاوبۆچوونێكی هەبووبێت و پاشان لێی پاشگەز بووبێتەوە

ئەوا دروستە ئەو کتێبانە بخاتە ژێر خاکەوە کە ئەوانەی تێدا بووە. ئەمەش هۆکاری تەئویلکردنە بۆ زانایان.

بەلام ئەو زاهیدانەی ڕەفتاری زاناکانیان بینی کە لەبەر سەرقاڵنەکردنیان لە خواپەرستی کتێبە باشەکانیان لەبن خاك نا ئەوا ئەوە نەزانییەکە لەوانەوە چونکە چرایەکیان کوژاندەوە کە ڕێیان بۆ ڕووناك دەکاتەوە، هەروەها ماڵ و داراییەکیشیان بەفیڕۆ داوە کە بەفیڕۆدانی دروست نییە.

یەکێك لەوانەی کتێبەکانیان ژێرخاك نا (یوسف کوڕی ئەسباط)ە کە پاشان نەیتوانی واز لە قسەکردن بۆ خەڵك بێنێ، ئیتر تێکەڵ و پێکەڵی کرد و خرایە ڕیزی لاوازەکانەوە.

پرسیار لە(یوسف کوڕی ئەسباط) کرا چیت لە کتێبەکانت کرد؟ وتی: هاتمە جەزیرە و کاتێ ئاو ڕۆچوو ژێرخاکم کردن تا ئاوی بارانی بەسەردا هات و لەناوچوون. وترا: چ شتێك بۆ ئەو کارە هەڵێنای؟ وتی: ویستم خەمەکە یەك خەم بێت.

(ئەلعوقەیلی) وتوویە: (ئادەم) بۆی باسکردم کە گوێی لە بوخاری بووە وتوویەتی: (صەدەقە) وتوویە: (یوسف کوڕی ئەسباط) کتێبەکانی لە بن خاك نا و، دوای ئەوە تووشی هەڵە و پەڵە دەبوو و وەکوو پێویست بە زانست و زانیارییەوە نەدەدوا.

وتم: بە ڕواڵەت ئەم کتێبانە زانست و زانیاری سوودبەخشیان تێدا بووە بەلام کەم زانستی بووە هۆی ئەم کەمتەرخەمییەی کە مەبەست لێی خێر بوو کە خراپەش

بوو، ئەگەر کتێبەکانی هاوشێوەی کتێبەکانی (ئەلئەوری) بووایە کە فەرموودەی لە کەسانی لاواز تێدا بوو و بۆی جیانەکرابۆوە ئەوا حاڵەتەکەی ویش لە هی ئەو نزیك دەبوو، بەڵام پاساودانی بە کۆکردنەوەی خەم ئەوا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە وانییە!

سەیری کەم زانستی بکە چ کاریگەرییەکی بەسەر ئەهلی خێرەوە هەیە؟!

لە هەندێك لەوانەی بە گەورەیان دەگرین و سەردانیان دەکەین پێمان گەیشتووە کە لەسەر کەناری ڕووباری دیجلە بووە، میزی کردووە و پاشان تەیەمومی کردووە! پێی وتراوە: ئەوە خۆ ئاوت لێ نزیکە! وتوویە: ترسام نەیگەمێ(و بمرم)!

ئەمە ئەگەر نیشانە بێت بۆ هیواکورتی وەلێ ئەگەر زانایان ئەم جۆرە وتانەیان گوێ لێ بێت ئەوا گەمە و گاڵتەی پێ دەکەن لەو ڕووەوە کە تەیەمموم لە کاتی نەبوونی ئاودا دروستە، ئەگەر ئاو هەبوو تەیەمموم کردن گەمە و گاڵتەیە، مەرج نییە ئاوەکە بە تەنیشت کەسی بێدەسنوێژەوە بێت بەڵکوو ئەگەر چەند گەزێکی زۆریش ئاوی لێ دوور بوو هێشتا هەر بۆی نییە تەیەمموم بکات.

هەر کەسێ لەم شتانە وردبێتەوە دەزانێ کە تاکە زانایەك باشترە لە هەزاران کەس لەوانەی خەڵك بە پیرۆز و موبارەکیان دەزانێ و بۆ بەرەکەت و پیرۆزی دەستیان پێدا دێنێ و خەڵکێکی بێشوماریش بەدوای جەنازەکانیانەوە دەڕۆن!

خەڵکیش یان شوێن خاوەن نیشانەیەك(أثر) دەکەون یان زانایەك کە لە مەبەستی شەرع تێ دەگات و فەتوای پێ دەدات؟!

پەنا بە خوا لە نەفامی و گەورەکردنی پێشینان و چاولێکردنیان بێ هیچ بەڵگەیەك! چونکە هەر کەسێ بچێتە سەر یەکەم سەرچاوەوە ئەوا هەموو سەرچاوەکانی تر بە لێڵ دەبینێ.

گرفت و مەینەتی هەرە گەورە ستایشی ڕەشەخەڵکە کە بۆتە هۆی لەخۆباییبوونی چەندان کەس! هەروەك ئیمامی عەلی (خودا لێی ڕازی بێت) وتوویەتی: (ما أبقى خَفقُ النّعال وراء الحمقى من عقولهم شيئا).

واتە: (تەقەتەقی پێڵاوی شوێنکەوتەی گەمژەکان هیچ شتێکی لە هۆشدا نەهێشتوون!) (مەبەستی ئەوەیە: کەسێك شوێنکەوتەی نەزانی زۆری بەدواوە بێت لەخۆبایی دەبێت و عەقڵ لە کەللەیدا نامێنێ.)..

لە خەڵکی ڕەشۆکیمان بینیوە و بیستووە کە بە شان و باڵی یەکێکدا هەڵدەدەن دەڵێن: شەو خەو ناچێتە چاوی و هەموو ڕۆژێ بەڕۆژووە و نازانێ ژن و هاوسەر چییە و شتێك لە خۆشی و چێژەکانی دونیا تام ناکات، بۆیە لاواز و سیس بووە و ئێسکی باریك بووە تەنانەت وای لێهاتووە بەدانیشتنەوە نوێژ دەکات، ئەم کەسە باشترە لەو زانایانەی دەخۆن و چێژ وەردەگرن و خۆش دەگوزەرێنن!..ئەوە ئاستی زانیارییانە و هەر ئەوەندەی لێ دەزانن! ئەگەر تێگەیشتبان دەیانزانی کە ئەگەر دونیا لە پاروویەکدا کۆببووایەتەوە و زانایەك بیخواردبایە کە لەبارەی خوداوە فەتوا دەدات و باسی شەریعەتەکەی دەکات ئەوا فەتوایەکی وی کە ببێتە هۆی ڕێنماییکردن بەرەو لای خودا ئەوا باشتر و چاکترە لە خواپەرستیی هەموو تەمەنی ئەو خواپەرستە.

(ئیبن عەبباس) (خودا لێی ڕازی بێت) وتوویە: یەك زانا لەسەر شەیتان توندتر و دژوارترە لە هەزار خواپەرست (عابد)..

هەر کەسێ ئەم قسەیە ببیستێ با وا گومان نەبات کە ئەز ستایشی کەسێ دەکەم کە بە زانستەکەی کار ناکات، بەڵکوو من مەدحی ئەوان کەسان دەکەم کە بە زانستەکانیان کاردەکەن، ئەوان سوود و بەرژەوەندی خۆیان باشتر دەزانن، تێیاندایە لەسەر ژیانی سەخت و ناخۆش دەسازێ و ڕادێت وەکوو ئەحمەدی کوڕی حەنبەل، تێیاندایە بەخۆشی دەژی و گوزەرانی تەڕ و پاراوە وەکوو سوفیانی ثەوری هاوشانی خۆپارێزییەکەی(ورع)، مالیك هاوشانی دینداریيەکەی، شافیعی هاوشانی هێزی تێگەیشتن و زاناییەکەی.

نابێ داوای شتێك لە مرۆڤ بکرێ کە غەیری وی توانای بەسەردا هەیە و ئەو پێی ناکرێ چونکە مرۆڤ باشتر شیان و توانای خۆی دەناسێ.

ڕابیعەی عەدەوییە وتوویەتی: ئەگەر ساغ و سەلامەتیی دڵت لە خواردنی فالودە(شیرینی)دایە ئەوا بیخۆ.

ئەی بیسەر(خوێنەر) لەو کەسانە مەبە کە تەنها ڕووکەشی زوهد دەبینن، ڕەنگە خۆشگوزەرانێك خۆشگوزەرانی گەرەك نییە بەڵکوو مەبەستی بەرژەوەندێکە و هەموو جەستەیەکیش بەرگەی سەختی و زبریی ژیان ناگرێ بەتایبەتی کەسێ ماندوو بووبێت و بیرکردنەوە شەکەتی کردبێت یان هەژاری ئێشاندبێتی، ئەو کەسە

ئەگەر بەزەیی بەخۆدا نەیەتەوە ئەوا واجبێك تەرك دەكات كە دەبووایە لەگەڵیدا بەسۆز بووایە.

ئەم ڕستەیە ئەگەر بە باسوخواس و وتە و بابەت ڕوونم كردبایەوە ئەوا درێژ دەبۆوە بەڵام من كاتێ بە خەیاڵمدا هات بەپەلە نووسیمەوە...

## ٢٠- ڕۆح چییە و چی بەسەردێت؟

لەگەڵ ئەوەی هەمووان کۆدەنگن لەسەر بوونی، بەڵام بابەت و چییەتیی نەفس (ڕۆح) لای خەڵك ئاڵۆز و لێڵ بووە، نەزانین بە خودی شتێك هاوشان لەگەڵ سەلماندن و باوەڕپێهێنانی زیانی نییە.

پاشان چارەنووسی ڕۆح دوای مردنیش هەر لە لایان ئاڵۆز و تێکەڵ و پێکەڵ بوو.

ڕێباز (مذهب)ی هەقخوازان (أهل الحق) ئەوەیە کە ڕۆح دوای مردن بوونی هەیە و هەم لە خۆشیدایە و هەمیش سزا دەدرێت.

ئەحمەدی کوڕی حەنبەل وتوویەتی: ڕۆحی ئیمانداران لە بەهەشتە و هی بێباوەڕانیش لە دۆزەخ.

لەو فەرموودەیەی باسی شەهیدان دەکات هاتووە: ((أنها في حواصل طيرِ خُضــرِ تعلق من شجر الجنة))..

واتە: ((ڕۆحی شەهید لە هەناوی باڵندەیەکی سەوزدایە کە بە درەختێکی بەهەشتدا هەڵواسراوە)) موسلیم گێڕایتییەوە.

هەندێ لە نەزانەکان تەنها ڕووکەشی فەرموودەکانیان لەبارەی خۆشییەکانی گۆڕەوە وەرگرتووە و وتوویانە: مردووەکان لە گۆڕەکانیاندا هەر خەریکی خواردن و پەڕینن!!

ڕاستییەکە ئەوەیە کە نەفس (ڕۆح) دوای مردن دەردەچێت بۆ خۆشی یان ئەشکەنجە و، تا ڕۆژی هەستانەوە (القیامة) وەها دەمێنێتەوە، کە قیامەت داهات ئەوا بۆ جەستە دەگەڕێنرێتەوە تا خۆشییەکان (یان ناخۆشییەکان)ی بە هۆی هۆکارەکانەوە(بەهەشت یان دۆزەخ) بۆ تێروتەواو بێت.

ئەو وتەیەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کە دەفەرموێ ((في حواصل طيرٍ خُضرٍ.)) بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە نەفس تەنها بە هۆکارێك چێژ وەردەگرێ ئەگەر ئەو چێژە چێژی خواردن یان خواردنەوە بێت بەڵام چێژی زانست و زانیارییەکان ڕێی تێدەچێ بە بێ بوونی هۆکار و تەنها بە خودی خۆی چێژیان لێ وەربگرێ.

مەبەستم لەم باسە ئەوەیە: من دیتم و تێبینیم کرد نەفس هەندێك لە مردن قەڵسە بۆیە پێم وت: ئەگەر ئەتوو باوەڕت بە شەریعەت هەیە ئەوا دەزانی چیت پێ وتراوە و بوارێك نییە بۆ نکوڵیکردن، ئەگەریش لێرەدا گومانێك لە هەواڵەکانی شەریعەت هەیە ئەوا دەبێ قسە لەبارەی ڕاستودروستیی شەریعەت بکرێ. نەفسم گوتی: هیچ گومانێکم نییە. منیش وتم: هەوڵی ڕاستکردنەوەی ئیمان و هێنانەدی تەقوا بدە و ئەو کات مژدەت لێبێ لە ساتی مردن ئاسوودە بوویت، من تەنێ لەوە لێت دەترسم لە کارکردن کەمتەرخەمی بکەیت، بشزانە جیاوازیی خۆشییەکانی بەهەشت بە ئەندازەی ئاست و پلەکانی چاکەکانە، ئیتر بە باڵەکانی کۆشش بەرەو بڵندترین قوللەکانی بەرزبەوە و لە ڕاوچیی ئارەزوو یان تەڵەی بێئاگایی وریابە.

## ٢١- گەورەیی زانست

ڕۆژێکیان لە کۆڕەکەمدا وتم: ئەگەر ئەوەی من هەڵمگرتووە چیاکان هەڵیانگرتبایە ئەوا دەستەوسان دەبوون.

کاتێ گەڕامەوە ماڵەوە نەفس پێی وتم: چۆن ئەمەت وت؟! ڕەنگە خەڵك وەها خەیاڵ بکەن کە تۆ گرفتاری بەڵایەك بوویت لە کاتێکدا تۆ خۆت و کەسوکارت ساغ و سەلامەتن؟! ئایا ئەوەی خراوەتە سەر شانم و هەڵمگرتووە هەر ئەو تەکلیفە نییە کە هەموو خەڵك هەڵیانگرتووە؟! ئیتر ئەم سکاڵایە لەپای چی؟

وەڵامی نەفسم دایەوە: کاتێ من لە هەڵگرتنی ئەوەی خراوەتە سەر شانم دەستەوسان بووم ئەم قسەیەم وت ئەوەش نەك وەکوو سکاڵایەك بەڵکوو بۆ پشوودان و هەناسەوەرگرتنێك، زۆرێك لە هاوەڵان و شوێنکەوتووان (التابعین)ی پێش من وتوویانە: بریا خەڵق نەکراباین!! ئەوەش تەنێ لەبەر ئەو بارە گرانانەی لە هەڵگرتنی دەستەپاچە بوون. پاشان ئەوەی گومانی وایە کە تەکلیفەکان ئاسانن ئەوا نەیناسیون و لەبارەیانەوە نازانێ.

ئایا ئەو جۆرە کەسانە گومانیان وایە تەکلیفەکان هەر شووشتنی ئەندامەکانە بە ڕەتڵێك ئاو یان ئەنجامدانی دوو ڕەکات نوێژە؟!چەندە لێك دوورن! ئەمە ئاسانترین تەکلیفە! تەکلیف(ی ڕاستەقینە) ئەوەیە کە چیاکان لە ئاستیدا دەستەوسان بوون،

لەوانە ئەوەیە: کە ئەگەر من دیتم قەدەر بە جۆرێك دەگوزەرێ کە عەقڵ سەری لێ دەرناکات ئەوا عەقڵم ناچار و پابەند بکەم بە ملکەچبوون بۆ قەدەرساز(خودا)، ئەوە لە سەختترین تەکلیفەکانە بەتایبەتی ئەوەی کە عەقڵ لە واتاکەی تێ ناگات وەکوو ئازاردانی منداڵ و سەربڕینی ئاژەڵ لەگەڵ باوەڕبوون بەوەی قەدەرسازی ئەوە و فەرماندەر بەوە بەسۆزترینی بەسۆزەکانە(أرحم الراحمين)، ئەمە ئەوەیانە کە عەقڵ تێیدا سەرسام دەبێ و تەکلیفەکەی دەبێتە تەسلیمبوون و وازهێنان لە پەلپێگرتن.

لە نێوان تەکلیفی جەستە و تەکلیفی عەقڵدا چەندە جیاوازی هەیە؟!

ئەگەر ئەمەم ڕوونکردبایەوە ئەوا درێژ دەبۆوە بەڵام من لەوەی وتم عوزرخوایی دەکەم و لەبارەی خودی خۆمەوە دەڵێم:

من پیاوێکم هەر لە سەردەمی منداڵییەوە زانستم لە کن خۆشەویست کرابوو ئیتر پێوەی سەرقاڵ بووم.

پاشان تەنێ یەك هونەری زانستم لەلا خۆشەویست نەبوو بەڵکوو هەموو هونەرەکانی.

پاشان لە هونەرێکیشدا بە هەندێکی ڕازی نابم و دڵم ئاو ناخواتەوە بەڵکوو دەمەوێ بچمە نێو وردەکاری و بنج و بناوانییەوە، کاتیش بەش ناکات و تەمەنیش کورت و کەمە و پەرۆشیم بۆ زانست هەر لە بەهێزبووندایە و پیربوون و دەستەپاچەییش دەردەکەوێ، ئیتر نەهاتنەدی هەندێ هیوا و ئاوات دەبێتە خەم و کەسەری دڵ.

پاشان زانست ناسینی پەرستراو(خودا)ی پێ نیشاندام و هانی خزمەتکردنی دام.

پاشـان بەڵگـە و ڕێنیشـاندەرەکان بـەرەو لای ئـەویان بـردم و منـیش لەبەردەسـتی وەسـتام، ئـەوم لـە سـیفەتەکەیدا دیـت و بـە سـیفەتەکانییەوە ناسـیم و چـاوی دڵـم ئەوەنـدە لوتـف و چـاکەی وی بینـی وایلێکـردم شـێت و شـەیدای بم و لـە عەشـقیدا بتوێمەوە و بزواندمی بۆئەوەی خۆی بـۆ خزمـەتکردنی تـەرخان بکـەم و هـەر کـاتێ باسی بکـەم شـتێك وەکـوو ئـەوینێکی بـەهێز دامبگـرێ، وام لێهـات تەنیابوونـەوە و خەڵوەتیم لە خزمەتی ئەودا لەلا لە هەموو شیرینییەك شیرینتر بێت.

هەر کاتێ لە سەرقاڵییەکان دابڕابم بەرەو لای خەڵوەت و تەنیایی چووبم ئەوا زانست هاواری لێ کردووم: بۆ کوێ دەڕۆیت؟! ئایا پشت لە مـن دەکـەیت کـە مـن هۆکـاری ناسینی خودا بوویت؟! منیش پێی دەڵێم: بـەڵکوو تـۆ تـەنها ڕێنیشـاندەر بوویـت و دوای گەیشتن مرۆڤ لـە ڕێنیشـاندەر بێنیـاز دەبێـت. وتـی: سەرچـیغ چوویت! هـەر چـەند زیـاتر زانسـتت وەدەسـهێنا ئـەوا خۆشەویسـتەکەت زیـاتر دەناسـیت و تـێ دەگەیت چۆن لێی نزیك ببیتەوە. بەڵگەی ئەمەش: تۆ سبەی دەزانیت کە ئـەمڕۆ لـە کەمبوونەوەدایت. ئەدی نەتبیستووە کە بە پێغەمبەرەکەی (صلى الله عليـه وسـلم) دەفەرموێت: ﴿وَقُل رَّبِّ زِدْنِي عِلْمًا﴾ (طه: ١١٤) واتـە: بڵـێ خودایـە زانسـت و زانیـاریم زیادکە...

پاشان گەرەکت نییە لەو نزیك بیتەوە؟ دە ئیتر بە ناساندن و نیشـاندانی بـە خـەڵك سەرقاڵ بە، ئەمـە حاڵوبـاری پێغەمبـەران بووە! ئـەدی نـەتزانیوە ئـەوان فێرکردنـی خەڵکیان لە تەنیایی و خەڵوەتی خواپەرستی پێ باشتر بووە لەبەرئەوەی زانیویانـە کە ئەوە لە کن خودای خۆشەویستیان پەسندترە؟! ئەی پێغەمبەری خوا(صلى الله

علیه وسلم) به ئیمامی عەلی نەوت: ((لأن يهدي الله بك رجلا خير لك من حمر النعم)) بوخاری گێڕایتییەوە. واتە: ئەگەر بە هۆی تۆوە خودا هیدایەتی کەسێك بدات ئەوا بۆت باشترە لە وشتری سوور..

کاتێ لە ڕاستێتیی ئەم وتەیە گەیشتم لەسەر ئەو حاڵەتە مامەوە و هەر کاتێ بە کۆکردنەوەی خەڵك سەرقاڵ دەبووم زەین و هۆش و دەروونم پەرتوبڵاو دەبوو، ئەگەریش مەبەستی خۆم لە سوود پێگەیاندنیان بدیتبایەوە ئەوا خۆم لاواز و سست دەبووم، ئیتر بەدوودڵییەوە لە شوێنی پەشۆکان و تێداماوی دەمامەوە، نەمدەزانی پشت بە کام قاچ ببەستم؟!

کاتێ پەشۆکاو و سەرگەردان وەستام زانست هاواری کرد: هەستە کار بۆ ماڵ و منداڵت بکە و پارووە نانێکیان بۆ پەیداکە و، بەردەوام بە لە خستنەوەی منداڵێك کە یادی خودا بکات!

کاتێ دەستم بەوە دەکرد گوانی دونیا لە کاتی دۆشیندا وشکی دەکرد و دیتم دەرگای بژێوی بە ڕوومدا داخراوە چونکە زانستسازی و کۆکردنەوەی زانیاری لە فێربوونی پیشە و پیشەسازییەك مەشغوولی کردبووم.

کاتێکیش ئاوڕم دایەوە بۆ لای دونیاویستان دیتیانم هیچ شتێك لە کاڵاکانی دونیا نافرۆشن مەگەر بە دینی کڕیار نەبێ! خۆزگە ئەوەی دووڕوویی یان ڕووپاماییان بۆ دەکات دونیای ئەوانی دەست کەوتبایە، بەڵکوو ڕەنگە دینەکەشی لەدەست چووبێت و نیاز و مەبەستەکەشی نەهاتبێتەدی!

ئەگەر (بێزاری – الضجر) وتوویە: ڕاکە! ئەوا شەرع وتوویەتی: ((كفى بالمرء إثماً أن يُضيِّع من يقوت)) موسلیم ڕیوایەتی کردووە. واتە: ئەوەندە گوناه و تاوانە بۆ مرۆڤ بەسە کە ئەوانەی بژێوی و بەخێوکردنیان لەسەرشانی وییە پشتگوێ بخات.

ئەگەر بڕیاریش گوتی: کەنارگیربە! شەرع وتی: ئەدی ئەوانەی نانیان بۆ پەیدا دەکەیت؟!

مەبەست ئەوەیە کە من دەست دەکەم بە کەمکردنەوە لە خۆشییەکانی دونیا و خۆشم لەنێو خۆشییەکانیدا پەروەردە بووم و شیری ویم خواردووە و میزاجم نەرم و ناسك بووە، ئەگەر جلوبەرگی زبرم لەبەرکرد و خواردنی ناخۆش و نانەڕەقم خوارد لەبەرئەوەی خۆراك بەرگەی سادەبوونەوە ناگرێ بۆیە سروشت لە دابڕانی لە نەریتی ڕۆژانە بێزار و قەڵس دەبێ، ئیتر نەخۆشی هات و لە ئەرك و واجیباتەکان دابڕا و کەوتە نێو دەرد و نەخۆشییەوە! دیاریشە کە دەسکەوتنی پارووی چەور و خۆش لە ڕێگای دروست و حەڵاڵەوە و پاشان سادەکردنەوە و ناخۆشکردنی خواردن بۆ کەسێك کە ڕانەهاتووە هەوڵدانە بۆ لەناوبردنی نەفس. دەڵێم: چی بکەم؟! خۆم کەنارگیر دەکەم و دەچمە خەڵوەتەوە و بۆ کەموکورتی حاڵەت و دۆخەکانم دەگریم و دەبێژم: وەسفی حاڵ و باری زانایان دەکەم و جەستەشم توانای دووبارەکردنەوە و وتنەوەی زانستی لاواز بووە!! باسی حاڵی زاهیدەکان دەکەم و جەستەم توانای زوهدی نییە!! باسی حاڵی ئەوینداران دەکەم و تێکەڵبوونی خەڵك بیر و ئەندێشەم پەرشوبڵاو دەکات و وێنەی دڵخوازەکانی ئارەزوو لە دەروونمدا دەکێشێ و ئاوێنەی

دلّم ژەنگ دەكات!! درەختى خۆشەويستى لە خاكێكى باش و پاكدا كە بە ئاوى خەڵوەت و لە دۆلابى بيرۆكە ئاودرابێت پێويستى بە پەروەردەكردنە.

ئەگەر كاركردنيشم هەڵبژارد ئەوا ناتوانم! ئەگەريش ڕووبەڕووى دونياويستان بوومەوە، لەگەڵ ئەوەى سروشتم ڕازينەبوونە بە زەليلى و ديندارِيشم ڕێگريم لێ دەكات، ئەوا لەگەڵ ئەم دوو ڕاكێشەرە(جاذِبَين) شوێنەوارى هيچ ئارەزوويەك نامێنێتەوە و تێكەڵاوبوونى خەڵكيش ئازارى نەفس لەگەڵ نەفسەكان دەدات، نە دەتوانم تەوبەيەكى ڕاست و دروست وەدى بێنم، نە وەدەسهێنانى ئاستێك لە زانست يان كردەوە يان خۆشەويستيم بۆ دەسازێ.

ئيتر دەمبينى وەكوو ئەو كەسەم لێ هاتووە كە شاعير باسى دەكات:

أَلقاهُ فِي اليمّ مكتوفا وقال له     إيّاك إيّاك أن تبتلّ بالماء

واتە: بە دەستبەستراوى فڕێى داوەتە ناو دەريا و پێى وتووە: نەكەى نەكەى بە ئاو تەڕ بيت!

لە كاروبارى خۆم سەرم سوڕما و بۆ تەمەنم گريام و لە كاتى تەنيايى و خەڵوەتمدا ئەم شيعرە دەڵێمەوە كە كتومت باسى حاڵى منە:

وا حسرتا كم أُداري فيك تعثيري
مثل الاسير بلا حبل ولا سَيري
ماحيلتي في الهوى قد ضاع تدبيري
لما شَكَلْتَ جناحي قلت لي طيري

## ٢٢- دەرمانی دڵ

لە کاری دونیا و ئاخیرەت رامام، دیتم ڕووداوەکانی دونیا بەرھەستی نەخشێنراوە و ڕووداوەکانی ئاخیرەتیش ئیمانیی یەقینیین. بۆ کەسێك زانست و یەقینی بەھێز و پتەو نەبێ بەرھەستەکان ھێزی ڕاکێشانیان زیاترە.

ڕووداوەکان بە ھۆی زۆریی ھۆکارەکانیەوە دەمێننەوە: تێکەڵبوونی خەڵك و بینینی شتە جوانەکان و خۆشی وەرگرتن لە چێژەکان ڕووداوەکانی بەرھەست بەھێز دەکەن. کەنارگیری و بیرکردنەوە و، لێکۆڵینەوە لە زانست ڕووداوەکانی ئاخیرەت بەھێز دەکەن.

ئەمە ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە ئەگەر مرۆڤ لە ماڵ چووە دەرێ و بە بازاڕدا سووڕایەوە و جوانییەکانی دونیای دیت پاشان چووە گۆڕستانەکان و بیری کردەوە و دڵی نەرم بوو ئەوا ھەست بە جیاوازییەکی ڕوون لەنێوان دوو حاڵەتەکەدا دەکات، ھۆکاری ئەوەش خۆدانەبەر ھۆکارەکانی ڕووداوەکانە.

ئیتر لەسەرتە ڕووبکەیتە کەنارگیری و زیکر و لێکۆڵینەوەی زانست، کەنارگیری خۆپارێزییە و بیرکردنەوە و زانستیش دەرمانن، دەرمان لەگەڵ تێکەڵکردن سوودی نییە، تێکەڵەی تێکەڵاوبوون لەگەڵ خەڵك و تێکەڵوپێکەڵی لە کردەوەکان بەسەرتدا

زاڵ بووه و كۆنترۆڵی كردوویـت، هـیچ دەرمانێكـت بـۆ نییـه جگـه لـەوەی بـۆم بـاس كردی.

بەڵام ئەگەر تێكەڵاوی خەڵك بوویت و خۆت دایە بەر ئارەزووەكان پاشان چاكبوونی دڵت ویست ئەوا شتێكی مەحاڵت ویستووە.

## ٢٣- مرۆڤ حەزی بەو شتەیە کە لێی قەدەغە کراوە

لــە ســووربوونی نــەفس لەســەر ئــەو شــتەی لێــی قەدەغــە کــراوە ڕامــام، دیــتم سووربوونەکەی بە ئەندازەی هێزی قەدەغەکردنەکە زیاد دەبێت.

لە دەستەی یەکەمدا دیتم کە: کاتێ (ئادەم) نەهی لێ کرا لە درەختەکە بخوات کەچی لەگەڵ بوونی درەختگەلێکی زۆر کە لەم درەختە بێنیازی دەکرد کەچی هەر لەسەر وی سووربوو.

لە پەندەکاندا هاتووە: مرۆڤ لەسەر ئەو شتە سوورە کە لێی قەدەغە کراوە و پەرۆشی ئەو شتەشە کە بەدەستی نەهێناوە.

دەوترێ: ئەگەر فەرمانی برسێتی بە خەڵك کرا ئەوا ئارام دەگرن، ئەگەر نەهی کران لە وردکردنی پشقل ئەوا حەزی پێ دەکەن و دەڵێن: لەبەر شتێك نەهیمان لێ کراوە.

وتراوە: خۆشەویسترین شت لای مرۆڤ ئەوەیانە کە لێی قەدەغەکراوە.

کاتێ بەدوای هۆکاری ئەوەدا گەڕام دوو هۆکارم دۆزیەوە:

یەکەمیان: نەفس ئارام لەسەر بەرتەسککردنەوە و قەتیسکردن ناگرێ، قەتیسکردنی لەنێو جەستەی بەسە، ئەگەر لە ڕووی واتاییەوە بە قەدەغەکردنێك قەتیس کرا ئەوا سەرەڕۆیی و لاپرەسەنی زیاتر دەبێ. لەبەرئەمە ئەگەر مرۆڤ

مانگێك له ماڵەوه دانیشێت بەلایەوه سەخت نییه بەڵام ئەگەر پێی وترا: بۆ ماوەی ڕۆژێك له ماڵەوه دەرمەچوو ئەوا ئەو ڕۆژەی پێ زۆره و هەر تەواو نابێ.

دووەم: نەفس بەلایەوه دژواره بچێته ژێر بڕیار و فەرمانێکەوه، بۆیه چێژ له حەرام وەردەگرێت و تام له حەڵاڵ و ڕێپێدراو ناکات. لەبەرئەوه خواپەرستیکردنی بەو شێوەیەی پێی خۆشه بەلاوه ئاسانه نەك بەو شێوەیەی گێڕدراوەتەوه.(مەبەست ئەوەیه خواپەرستی به ئارەزووی خۆی بەبیدعه و هەوەس دەکات بەڵام پابەندبوون به سوننەت بەلایەوه دژواره).

## ٢٤- حەقیقەتی کەنارگیری

بـه هـۆی کاریگـەریی کـۆڕی ئامۆژگـاری و تـەوبـەی تـەوبـەکاران و بینینـی زاهیـدان، نەفسـم بـەرەو لای زوهـد و دابـڕان لـە خـەڵق و خۆتـەرخانکردن بـۆ ئـاخیرەت رادەکێشێت.

لەوە وردبوومەوە و ڕامام، دیتم گشتی لە شەیتانەوەیە: شەیتان دەبینـێ خـەڵکێکی زۆر لە کۆڕەکانم ئامادە دەبن، دەگرین و شین و واوەیلا بۆ گوناهـەکانیان دەکـەن و زۆربـەی جـار کۆمـەڵێك لەوانـە تـەوبـە دەکـەن و واز لـە کـاری هەرزەکارانـە دێـنن، لەوانەیە سەت و پەنجا کەس بوونە، هەنـدێ ڕۆژ زیـاتر لـە سـەت کـەس لـە کـن مـن تەوبەیان کردووە و زۆربەیان هەرزەکار بوونە و خەریکی گەمە و یاری و ڕۆچوون لـە گوناه و سەرپێچی بوون.

وەکـوو ئـەوەی شـەیتان لەبـەر ڕۆچـوونی لـە خراپـەدا بینیـومی ئەوانـەی لـە چـنگ دەردێــنم کــە بــۆ خــۆی ڕاکێشــاون بۆیــە ویســتوویەتی بــە ڕازاندنــەوە و جوانکارییەکانی(لەبارەی کەنارگیری و زوهدەوە) مەشغوولم بکات تا خۆی خـەریکی گومڕاکردنی ئەوانە بێت کە من لە دەستیڕا دەستێنم.

دابڕان لە کۆڕ و مەجلیسەکانی لە لا جـوان کـردم و گـوتی: ئـەو کـۆڕ و کۆبوونەوانـە خاڵی نین لە ڕووپامایی و ڕیاییکردن بۆ خەڵق!

منیش وتم: جوانکردن و ڕازاندنەوەی وشە و دەستەواژەکان و دەربڕینیان بەجوانی چاکەیە نەك خراپە، بەڵام ئەگەر بە شتێك کە لە شەرعدا ڕێپێدراو نییە ڕوو لە خەڵك بکەم ئەوا پەنا بە خودا.

پاشان دیتم لە زوهددا پچڕاندنی ئەو هۆکارانەی نان پەیداکردن و کەسابەتم پێ نیشان دەدات کە ڕێپێدانیان دیار و ئاشکرایە.

پێم وت: ئەگەر زوهدم لە کن خۆش و باش بوو و توانیم کەنارگیری بکەم ئەوا ئەو داهاتەی بەدەستمەوەیە تەواو دەبێ یان خاووخێزانم ئاتاج دەبن، ئایا پاشەوپاش ناگەڕێمەوە؟! لێمگەڕێ با ئەوەندە داهات کۆبکەمەوە تا پێویستییەکانم پێ دابین بکەم و لە سواڵی خەڵك بمپارێزێ، ئەگەر خودا تەمەنی دام ئەوا باشترین هۆکار و پاڵپشتە، ئەگەریش نا ئەوا بۆ خاووخێزان دەمێنێتەوە، با وەکوو ئەو سوارە نەبم کە بە هۆی دیتنی تراویلکە(سەراب)ەوە ئاوەکەی ڕژاند و کاتێکیش کار لە کار ترازا و پەشیمان بوویەوە پەشیمانییەکەی دادی نەدا...بەڵکوو کاری ڕاست ئەوەیە بەر لە نووستن جێخەو خۆش بکەیت و، ئەوەندە پارە و ماڵ کۆبکەیتەوە کە لە کاتی پیریدا بە کەڵکت بێت و کەلێنی هەژاریت بۆ بگرێ، ئەوەش وەکوو دەسگرتن بە بڕیاری توند و دووربینییەوە، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (( لأن تترك وَرَثَتَكَ أغنياء خير لك من أن تتركهم عالةً يتكفَّفون الناس)) رواه البخاري و مسلم.. واتە: ئەگەر میراتگرانەکانت(ماڵ و منداڵەکەت) بە دەوڵەمەندی بەجێ بێڵیت باشترە لەوەی بە هەژاری و نەداری بەجێیان بهێڵیت و دەست لە خەڵك پان بکەنەوە.

هەروەها فەرموویەتی: ((نِعمَ المالُ الصالح للرجلِ الصالح)) رواه أحمد و البخاري و ابن حبان و الحاكم..

واتە: باشترین ماڵی چاك بۆ پیاوی چاكە، یاخود ماڵی چاك هەر شیاوی پیاوی چاكە..

بەڵام دابڕان، پێویستە كەنارگیری لە خراپە بێت نەوەك چاكە، كەنارگیری لە خراپە لە هەموو بارێكدا پێویست و واجیبە.

بەڵام فێركردنی زانستخوازان و ڕێنیشاندانی ئەوانەی خواستی گرتنەبەری ڕێی ڕاستیان هەیە ئەوا خواپەرستیی زانایە.

ئەوە لە بێئاگاییی هەندێ زانایە كە نوێژ و ڕۆژووی سوننەتیان پێ پەسندتر و باشتر بووە لە دانانی كتێب یان فێركردنی زانستێكی بەسوود، چونكە ئەمەی دوایی تۆوێكە بەرهەمی زۆرە و كاتی سوودیشی درێژخایەنە.

لەبەر دوو هۆكار نەفس مەیلی بەرەو لای ئەوەوە (باودانی نوێژ و ڕۆژووی سوننەت بەسەر زانست) دەچێت كە شەیتان دەیڕازێنێتەوە:

یەكەم: حەز و ئارەزووی تەنبەڵی و دەسبەتاڵی چونكە دابڕان لەوێ ئاسانترە.

دووەم: حەز و ئارەزووی پیاهەڵدان و ستایشكردن، ئەگەر ئەو كەسە بە زوهد و تەركی دونیا ناسرا ئەوا ڕووتێكردنی خەڵك بۆی زیاتر دەبێت.

تۆ پێویسته سەیری دەسته و نەوەی یەکەمی موسڵمانان بکەیت، لەگەڵ ئەوانەی پێشوو بە کە ئەوانیش پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و هاوەڵەکانی بوون(خودا لێیان ڕازی بێت).

ئایا هیچ هەواڵ و شتێ لەوان گواستراوەتەوە کە لە زانست و زانیاری دابڕابن و لە خەڵك دوورەپەرێز بووبن هەروەك خۆبەزاهیدزان و سۆفییەکان دایانهێناوە؟!

ئایا ئیشوکاری پەیامبەران تەنها کێشە و گرفتی خەڵك و هاندانیان لەسەر خێر و جڵەوگیریکردنیان لە خراپە نەبووە؟!

مەگەر کەسێك کە زانا نییە و بە مەبەستی خۆدوورگرتن لە خراپە خۆی کەنارگیر و دابڕاو بکات، ئەوەش کەسێکە لە ترسی خراپەی تێکەڵ و پێکەڵکردن خۆی پەناداوە و دوورەپەرێز بووە، بەڵام پزیشکی زانا بەوەی دەیخوات سوود لەو شتە وەردەگرێ کە دەستی دەکەوێ.

## ٢٥- زانين و كردەوە

لە مەبەست و ئامانجى خەڵق و خوڵقاندن وردبوومەوە دیتم بریتییە لە ملكەچى و باوەڕبوون بە كەمتەرخەمى و دەستەپاچەیى..زانایان و زاهیدە كاراكانم كردە دوو بەش: ئەمانەم لە ڕیزى زاناكان دانا: مالیك، سوفیان، ئەبوو حەنیفە، شافیعى، ئەحمەد.. ئەمانەشم لە ڕیزى عابید و خواپەرستەكان دانا: مالیكى كوڕى دینار، ڕابیعە، مەعروفى كەرخى، بیشرى كوڕى حاریث.

هەرچەند عابیدەكان لە عیبادەت و خواپەرستیدا خۆ ماندوو بكەن ئەوا زمانى حاڵ پێیان دەڵێ و هاواریان لێ دەكات: سوودى خواپەرستى و عیبادەتەكانتان لە خۆتان زیاتر تێ ناپەڕێ بەڵكوو سوودى زاناكان لە خۆیان تێدەپەڕێ و خەڵكى تریش دەگرێتەوە، ئەوان میراتگرانى پێغەمبەران و خەلیفەى خودان لەسەر زەوى، هەر ئەوان پشتیان پێ دەبەسترێ و خاوەنى فەزڵن..مالیكى كوڕى دینار هاتە كن حەسەن زانستى لێوە فێربێت و دەیوت: حەسەن مامۆستامانە.

ئەگەر زانایان پێیان وابوو بە هۆى زانستەوە فەزڵیان هەیە ئەوا زمانى حاڵ هاوار لە زانایان دەكات و پێیان دەڵێ: ئایا مەبەست و ئامانج لە زانست هەر كارپێكردن نییە؟!

ئەحمەدی کوڕی حەنبەل وتوویە: ئایا مەبەست لە زانست هەر ئەوە نییە کە مەعروف پێی گەیشتووە؟!

لە زاری سوفیانی ثەوری گێڕدراوەتەوە کە وتوویەتی: حەزم دەکرد دەستم ببڕدرایەتەوە و فەرموودەم نەنووسیبایەوە!

ئوم دەرداعبە پیاوێکی گوت: بەوەی دەیزانیت کارت کردووە؟ گوتی: نا...گوتی: ئەی کەواتە بۆچی بەڵگەی خودا بەسەر خۆتەوە زیاد دەکەیت؟!

ئەبوو دەرداءوتوویەتی: جارێك واوەیلا بۆ ئەو کەسەی نەیزانیوە و کاری نەکردووە بەڵام حەفتا جار واوەیلا بۆ ئەو کەسەی زانیویەتی و کاری نەکردووە!!

فوضەیل وتوویە: بەر لەوەی لە گوناهێکی زانا ببووردرێ لە حەفتا گوناهی نەزان دەبووردرێ.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿قُلْ هَلْ يَسْتَوِي ٱلَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ۗ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُوْلُواْ ٱلْأَلْبَٰبِ ۝٩﴾ (الزمر: ٩) واتە: بڵێ: ئایا ئەوانەی دەزانن و ئەوانەی نازانن وەکوو یەکن؟!

سوفیان هاتە لای ڕابیعە و لەبەردەستی دانیشت تا سوود لە قسەکانی وەربگرێت.

زانست ڕێی بە زاناکان پیشاندا و پێی ڕاگەیاندن کە مەبەست لە زانست کارکردنە پێی و ئەو تەنها ئامرازێکە، بۆیە ئیتر ملکەچ بوون و دانیان نا بە کەمتەرخەمی و کەمایەسییان..

هەمووان دانپێدانان و ملکەچییان دەست کەوت و بە دانپێدانانیان زانست و زانیـاری حەقیقەتی بەندایەتی لێ دەرهێنان، هەر ئەوەش مەبەست و ئامانجی تەکلیفە.

## ٢٦- پلەوپایەی خۆشەویستی

لەم ئایەتەی خوای گەورە وردبوومەوە و سەرنجم دا کە دەفەرمووێت: ﴿ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُۥٓ ﴾ (المائدة: ٥٤) واتە: خودا ئەوانی خۆشدەوێت و ئەوانیش ئەویان خۆشدەوێت...دیتم نەفس بە سەلماندنی خۆشەویستییەك بۆ خودای بەدیهێنەر ڕازی نابێ کە نیگەرانی و هەڵچوونی سۆزداری بەدواوە بێت و نەفس گوتی: خۆشەویستیی خودا واتە گوێڕایەڵیکردنی.

لەوە وردبوومەوە دیتم لەبەر زاڵبوونی هەست ئەوەی نەزانیوە..

ڕوونکردنەوەی ئەمە بەم شێوەیەیە: خۆشەویستیی بەرهەست لە وێنە و شێوەی زاتی تێ ناپەڕێ و خۆشەویستی بە زانست و کردەوە وێنە و شێوە مەعنەوییەکان دەبینێ ئیتر خۆشی دەوێت.

ئێمە خەڵکێك دەبینین ئەبووبەکریان خۆشدەوێ، خەڵکێکی تر عەلییان خۆش گەرەکە، هەندێکی تر لایەنگری ئەحمەدی کوڕی حەنبەلن، هیتر لایەنگری ئەشعەریین، ئیتر لەو پێناوەدا شەڕ دەکەن و گیان بەخت دەکەن و لەوانەش نین کە وێنە و شێوەی ئەوانەیان بینیوە، وێنە و شێوەشیان خۆشەویستی لێ ناکەوێتەوە بەڵام کاتێ واتا و مانای ئەوانیان هاتە بەرچاو، ئەوە تێروتەواویی ئەوانی لە بواری زانست و زانیاریدا پێ نیشاندان، ئیتر خۆشەویستی بۆ ئەو وێنە و شێوانە کە بە چاوی بەسیرەت بینراون هاتەئاراوە..

ئەی سەبارەت بەو زاتەی کە ئەو وێنە و شێوە مەعنەوییانەی دروست کردووە و بەخشیویەتی چی؟!

چۆن ئەو زاتەم خۆش ناوێت کە چێژبەخشە بەرهەستەکانی پێ بەخشیوم و چێژبەخشە زانستییەکانی پێ ناساندم؟! چێژبینین لە زانست و دەرککردنی زانستەکان لە هەموو چێژە بەرهەستەکان لەپێشترە، هەر ئەو زاتەیە فێری کردووم و ئیدراکێکی بۆ خوڵقاندووم و ڕێنمایی کردووم بۆ ئەو شتەی زانیومە. پاشان ئەو لە هەموو ساتێکدا لە مەخلووقێکی نوێ بۆم دەردەکەوێ و نمایان دەبێ، بە وردەکاری و جوانیی ئەو دروستکردن و دروستکراوە دەیبینم. هەموو خۆشەویستە بەرهەست و مەعنەوییەکانی من لەو و لەبارەی ئەو و بە هۆی ئەوەوەیە، هەروەها ئاسانکاری ئیدراککردن بەو و ئیدراکپێکراوەکانیش لەوەوەیە، خۆشتر لە هەموو چێژێك ناسینی ئەوە کە ئەگەر فێرکردنی ئەو نەبووایە نەمدەناسی.

چۆن زاتێکم خۆشناوێ کە من بە هۆی ئەوەوە هەم و مانەوەم لەوەوەیە و کاروبارم بە دەستی ئەوە و گەڕانەوەم بۆ لای ئەوە، هەموو شتێکی جوان و خۆشەویست ئەو چێی کردووە و جوانی کردووە و دەروونەکانی بەرەو لای کەمەندکێش کردووە؟!

ئەو خودایەی خاوەنی توانای تەواوە جوانترە لەو شتەی تەقدیری کردووە، دروستکاری شتە سەیروسەمەرەکان کاملترە لە دروستکراوەکە، واتای ئیدراك و تێگەیشتن ناسینی شیرینترە لە دەرکپێکراو.

ئەگەر ئێمە نەخش و نیگارێکی جوان و سەیرمان دیت دەسرپەنگینی و وەستایی نیگارکێشەکەمان لە نیگارەکە پێ گەورەترە و سەرنجراکێشترە و زیاترمان خۆش گەرەکە.

ئەگەر تێڕوانینی بیر و هزری ساف و خاوێنیش شتە بەرهەستەکان تێپەڕێنێ و بچێتە دواوەی ئەو بەرهەستانە ئەوا ئەو کات بە زەروورەت خۆشەویستیی بەدیهێنەر دێتە ئاراوە.

بە ئەندازەی دیتنی دروستکار لە دروستکراو خۆشەویستی بۆی دێتە ئاراوە: ئەگەر بەهێز بوو شەوق و پەرۆشی دروست دەبێ، ئەگەریش عاریف و خواناس بەرەو پلەوپایەی شکۆ و هەیبەت ببات ئەوا ترس دروست دەبێ، ئەگەریش بەرەو دیتنی بەخشندەیی بیبات ئەوا ئومێد و هیوایەکی بەهێز دروست دەکات ﴿قَدْ عَلِمَ كُلُّ أُنَاسٍ مَّشْرَبَهُمْ﴾ البقرة: ٦٠) واتە: هەموو کەسێ چاوگەی خۆی زانی..

## ٢٧- تەسلیمبوون بە حیکمەتی خودا

لە حالّ و بارێکی سەیر وردبوومەوە و ڕامام کە بریتییە لەوەی خوای گەورە ئەم تەن و جەستانەی لەسەر یاسای حیکمەت زۆر بەوردی و جوانی بنیات ناوە، بەو دروستکراوانە تێروتەواویی توانا و وردیی حیکمەتی خۆی نیشاندا، پاشان هات ئەم تەن و جەستانەی لێك هەڵوەشاند.

عەقڵ و هۆشەکان دوای تەسلیمبوونیان بۆ حیکمەتی خودا لە نهێنیی ئەم کردەوەیە سەرسوڕماو بوون؟!

بە عەقڵەکان ڕاگەیەندرا کە ئەم جەستانە بۆ دواڕۆژ دەگەڕێندرێنەوە و ئەم جەستەیەش تەنێ بۆ ئەوە خوڵقاوە تا لە ڕاڕەوی مەعریفەت تێپەڕێ و لە وەرزی مامەڵە و سەودادا بازرگانی بکات، ئیتر عەقڵ و ئاوەزەکان بۆ ئەوە ئارام و ئەرخەیان بوون.

پاشان هەندێ شتی لەم چەشنەم دیت کە لەو سەرنجڕاکێشتر بوو وەکوو: نەخۆشکەوتن و مردنی لاوێك کە هێشتا جەستەی نەگەیشتووە بە هەندێ مەبەست! لەوە سەیرتر دەرهێنانی منداڵێکە لە دەستی باوانی و مراندنیەتی، داکوبابەکە لە خەفەتان جێ بەخۆ ناگرن و هەر جینگڵ دەدەن، خودا کە هیچ پێویستی بە بردنەوەی ئەو منداڵە نییە و داکوبابەکەشی زۆر پێویستیان بە مانەوەی هەیە و

نهێنی ئەم بردنەوەیەش دیار نییە، سەرنجڕاکێشتر لەمە هێشتنەوەی پیرێکە کە واتای مانەوە نازانیّ و ئەو مانەوەیە تەنها ئازارێکە بۆی! لەم چەشنە کارانەی خودا کە مرۆڤ سەری لیّ دەرناکات: بەرتەسك کردنەوەی ڕۆزییە لەسەر ئیمانداری دانا و فراوانکردنیەتی لەسەر بێباوەڕی گەمژە..لە هاوشێوەی ئەمانەی باسکران عەقلّ و هۆش لە لێکدانەوە و پاساو بۆ هێنانەوەیان سەرسوڕماو دەبیّ و هیچی بۆ ناگوتریّ..

لە کۆمەڵێك تەکلیف سەرنجمدا و وردبوومەوە، ئەگەر هێزی عەقلّ نەیتوانی دەرك بە حیکمەتیان بکات و بێگومان سەلماوە کە خودا حیکمەتی لەمەدا هەیە ئیتر عەقلّ زانی کە لە پەیبردن بە هەموو بابەتەکان دەستەپاچەیە، دانی نا بە دەستەپاچەیی خۆی و ملکەچ بوو، بەوەش ئەو تەکلیفەی لەسەریەتی جێبەجیّ دەکات.

ئەگەر بە عەقلّ وترا: لای تۆ حیکمەتی خولقێنەر لە دروستکردنی شتەکان سەلماوە، ئایا دروستە ڕەخنە لە حیکمەتی بگریت لەبەرئەوەی شتەکانی لەبەریەك هەڵوەشاندۆتەوە؟ دەیوت: لەبەرئەوەی من بە بەڵگەوە زانیومە کە ئەو حەکیم و دانایە و من لە دەرککردنی هۆکارەکانی حیکمەتی وی دەستەوسانم بۆیە تەسلیم دەبم و دان بە دەستەوسانی خۆم دەنێم.

# ٢٨- واتا و سوودەكانی هاوسەرگیری

لە بابەت و واتا و سوودەكانی هاوسەرگیری رامام و وردبوومەوە دیتم ئەسڵ و بنچینەی هەرە گەورە لە دانانی بریتییە لە بوونی وەچە، چونكە ئەم گیانلەبەرە(مرۆڤ) بەردەوام لەبەریەك هەڵدەوەشێتەوە، پاشان خۆراك شوێنی شتە لەبەریەك هەڵوەشاوەكان دەگرێتەوە، پاشان لە بەشە بنچینەییەكان شتگەلێك لەبەریەك هەڵدەوەشێنەوە كە هیچ شتێك شوێنیان ناگرێتەوە، جا ئەگەر مرۆڤ هەر دەبێ لەناوبچێت و مەبەستیش ئەوە بێت دونیا هەر بەردەوام بێت ئیتر بۆ ئەم مەبەستە وەچە دانراوە بە جێگرەوەی بنچینە و ئەسڵەكەی.

لەبەرئەوەی مرۆڤە بەرێزەكان خۆشییان لە وێنە و شێوەی پەڕین و جووتبوون نایەت هەر لە عەورەت هەڵماڵین و بەیەككەیشتنی ڕووت بۆیە شەهوەت و ئارەزوو كراوە بە هاندەری بەیەككەیشتن تاوەكوو ئامانج و مەبەستەكە بێتەدی.

پاشان دیتم ئەم مەبەست و ئامانجە بنچینەییە شتێكی تری بەدوادا دێت كە بریتییە لە بەتاڵكردنی ئەو ئاوەی كە هەڵگرتن و بەردەوام هێشتنەوەی دەبێتە مایەی ئازار، ئاوی پیاو (المنی) لە هەرسی چوارەم جودا دەبێتەوە كە لە باشترین و پاكترین كاكڵەی خۆراكە، پاشان كۆدەبێتەوە و یەكێكە لە توێشووەكانی نەفس، بۆ مانەوە و هێزی مرۆڤ خوێن هەڵدەگرێ پاشان مەنی، پاشان ئەو لیكە هەڵدەگرێ كە لە

کۆڵەگەکانی جەستەیە وەکوو ترسێك لە نەبوونی غەیری وی، کاتیّ کۆبوونەوەی مەنی زۆر بوو وەکوو کەسێك میزی ڕاگرتبیّ دەبێتە مایەی نیگەرانی، لە ڕووی وێنە و شێوەوە نیگەرانکردنی ئەو لە نیگەرانکردنی میز زیاترە، زۆر کۆبوونەوە و ڕاگرتنی بۆ ماوەیەکی درێژ چەندان نەخۆشیی سەختی لیّ دەکەوێتەوە چونکە هەڵمەکەی بەرەو مێشك بەرز دەبێتەوە و ئازاری دەدات و ڕەنگە ببێتە مایەی ژەهراوییبوون و ببێتە ژەهری نێو جەستە.

هەرکات میزاج ساغڵەم بوو سروشتی مرۆڤ داوای دەرکەوتنی مەنی دەکات ئەگەر کۆبۆوە هەروەك داوای دەرکەوتنی میز دەکات.

هەندیّ میزاج تووشی لادان دەبیّ بۆیە کۆبوونەوەی مەنی لە کن کەم دەبیّ و خواستی فرێدانیشی دەگمەن دەبیّ، ئێمە باس لە میزاجی ساغ و دروست دەکەین و دەڵێم: ڕوونم کردۆتەوە کە ئەگەر مەنی قەتیس کرا و فڕیّ نەدرایە دەرەوە ئەوا دەبێتە هۆی نەخۆشی و ئەندێشەی بەد بە هزردا دێنیّ و عیشق و وەسوەسە پەیدا دەکات، هەروەها دەرد و ئافەتی تریش..

دەبینین کەسێك میزاجی ساغڵەمیشە کەچی کە مەنییە کۆبۆوەکەشی فڕیّ دەدا بەڵام هێشتا پەشۆکاوە وەکوو کەسێکی بخۆر کە هەرگیز تێر نابیّ! لەوەشم کۆڵییەوە دیتم کێشە و کەموکورتییەکە لە ژنەکەیە: یان لەبەر ناشیرینی و ڕەزا قورسی، یان نەخۆشی و دەردێکی تێدایە، یان نەفس حەزی پیّ ناکات، ئەو کات هەندیّ مەنی لیّ دێتەدەر و هەندێکی دەمێنێتەوە.

ئەگەر ویستت بەڵگەی ئەوە بزانیت ئەوا ئەندازەی هاتنەدەرەوەی مەنی لە شوێنە خۆشەکە بەراورد بکە بەو شوێنەی لەو خوارترە وەکوو: نێوان دوو ڕان بەراورد بە کونی پێشەوە، هەروەها وەکوو جووتبوون لەگەڵ کچ بەراورد بە بێوەژن! ئەو کات دەزانرێ هەڵبژاردنی ژن دەبێتە هۆی دەرچوونی هەموو مەنییەکە و نەفس هەست بە چێژی تێروتەواو دەکات لەبەرئەوەی ئەو شوێنەی دەبێتە هۆی دەرچوونی مەنی تێروتەواوە.

پاشان ئەمە کار لە منداڵیش دەکات، ئەگەر منداڵەکە لە دوو ژن و پیاو بکەوێتەوە کە ماوەیەکی زۆر خۆیان لە جووتبوون گرتبێت ئەوا منداڵی غەیری ئەوان بەهێزتر دەبێ یان لە هی کەسێك کە زۆر دەپەڕێ.

لەبەرئەمە خواستنی خزم و خوێش پەسند نییە چونکە دڵ پێی دەگوشرێ و ناکرێتەوە و مرۆڤ وا خەیاڵ دەکات کە لەگەڵ بەشێکی خۆی جووت دەبێ، لەبەر ئەم واتایەشە خواستنی بێگانە ستایش کراوە.

لەم هونەرەوە بە هۆی ژنێکی نوێ و تازەوە زۆر مەبەست لە فڕێدانی ئەم مەنییە زیادە ئازاردەرە دێتەدی جا ئەگەر ئەو ژنە ناشیرینیش بێت. بۆ نموونە: کەسێك تێروپڕ نان و گۆشت بخوات بە جۆرێك لە گەدەیدا جێی پارووەکی تر نەمابێتەوە ئەگەر شیرینی پێشکەش بکرێ ئەوا دەیخوات، ئەگەر لە شیرینی سەیرتری پێشکەش کرا دیسان دەیخوات چونکە تازەیی واتایەکی سەیری هەیە چونکە نەفس ئارەزووی ئەو شتانە ناکات کە لێیان ڕاهاتووە و دەقی پێوە گرتوون بەڵکوو شتی نەناسراو دەخوازێ و لە شتی نوێدا ویست و مەبەستی دەروونی دێتە بەرچاو، جا

ئەگەر ویست و مەبەستی نەدیتەوە و دەست نەکەوت ئەوا ڕوودەکاتە نوێ و تازەیەکی تر وەکوو ئەوەی بە بوونی مەبەستێکی تەواوی بێ کێشەی زانیبێت و خەیاڵی بۆ دەکات و دەیهێنێتە بەرچاوییەوە.

لەم واتایەشدا بەڵگەیەکی شاراوە لەسەر زیندووبوونەوە هەیە چونکە لە خوڵقاندنی کەسێك کە هیممەتی بەستراوە بە شتێکی ناکۆتا جۆرێك لە پووچگەرایی هەیە، لەمە تێ بگە! ((مەبەستی نووسەر ئەوەیە کە نەفسی مرۆڤ بەردەوام داوای زیاتر و زیاتر دەکات بۆیە دەبێ زیندووبوونەوە و بەهەشت و دۆزەخ هەبێ تاوەکوو بگاتە مەبەست و ئامانجی کۆتایی کە دوای ئەوە بە دوای هیچ زیادەیەکی ترەوە نەبێ وەگەرنا ئەم زنجیرە خواست و داواکاریی زیاترە لە دونیا کە کۆتایی نییە پووچگەراییەکە کە لە خودا ناوەشێتەوە.)).

ئەگەر نەفس خەوش و نەنگی ئەو شتانەی دونیای بینی کە لە دەوروبەریدان دووبارە داوای شتی نوێ دەکات. لەبەرئەوە دانایان وتوویانە: عیشق واتە: کوێربوون لە ئاست خەوش و نەنگییەکانی خۆشەویست، هەر کەسێك لە کەموکورتییەکانی خۆشەویستەکەی وردبێتەوە پشتی تێ دەکات و لەبیری دەکات.

لەبەرئەوە بۆ ژن وا باشە ئەوەندە لە پیاوەکەی دوور نەکەوێتەوە لەبیری بکات و ئەوەندەش لێی نزیك نەبێتەوە لێی بێزار بێت، بۆ پیاویش بە هەمان شێوە نەوەکوو لێی بێزار بێت یان عەیبوعارەکانی بۆ دەرکەوێت.

پێویستە پیاو عەورەتی ژن نەبینێ و جگە لە بۆنی خۆش هیچ بۆنێکی تری لێ نەکات..ئەمانە و چەندان سیفەتی تر کە ژنی دانا و هۆشمەند بەکاریان دێنێ، ژنان ئەوانە بە سروشتی خۆیان دەزانن بێ ئەوەی پێویست بە فێرکردن بکات، بەڵام ژنە نەزانەکان گوێ بەم شتانە نادەن و ئیتر پیاوەکانیان ڕوویان لێ وەردەگێڕن.

هەر کەسێك منداڵی ڕەسەن و باش و، دامرکاندنەوەی ئارەزووی سێکسی دەوێ با لە هەڵبژاردنی ژندا وریا بێت: با سەرەتا سەیری بکات ئەگەر بەدڵی بوو مارەی بکات و با سەیری چۆنییەتیی بەدڵبوونەکەشی بکات، نیشانەی بەدڵبوون ئەوەیە چاوی لەسەر هەڵنەگرێ، ئەگەر چاویشی لەسەر هەڵگرت دیسان دڵ داوای سەیرکردنی بکاتەوە، ئەمە ئەوپەڕیەتی، خوارتر لەمە ئاستی تر هەیە کە بە ئەندازەی خۆشەویستییەکە دەگاتە ئامانج و مەبەست.

هەر کەسێکیش توانی قسە لەگەڵ ژنەکە بکات یان بیدوێنێ کە ببێتە هۆی ئاگادارکردنەوە ئەوا باشە چونکە جوانی لە دەم و چاوەکاندایە.

ئیمامی ئەحمەد ڕێی داوە بەوەی کە پیاو دەتوانێ جگە لە دەست و دەموچاوی ئەو ژنە ببینێ کە دەیەوێ بیخوازێ و مارەی بکات..

پیاو ئەگەر توانی گرێبەستی هاوسەرگیرییەکە دوا بخات تا ئەوەی بزانێ پەرۆشی و جۆش و خرۆشی دڵی چۆنە، چونکە لای کەسی هۆشمەند ئاشکرایە کە نەفس جۆش و خرۆشی بۆ شتی نوێ و لەپێناو خۆشەویستیدا هەیە، ئەگەر هەستی بە جموجۆڵی خۆشەویستی کرد ئەوا با هەنگاو بنێ، عەتای خوراسانی وتوویە: لە تەوراتدا

نووسراوه: هەر هاوسەرگیرییەك لەسەر خۆشەویستی نەبوو ئەوا تا ڕۆژی قیامەت هەر خەم و پەژارە و پەشیمانییە.

پێویستە ئەو کەسەی بەدوای هاوسەرگیرییەوەیە لە ڕەوشتی کەسەکە وردبێتەوە چونکە ئەمە لە شتە شاراوەکانە، ئەگەر شێوە لە واتا خاڵی بوو ئەوا وەکوو گژوگیایەك وایە کە لەسەر زبڵدان و تەپاڵە ڕووابێت و مەبەست لە وردبوونەوە لە ڕەوشتیش ڕەسەنێتیی منداڵە.

دڵئارامی و دڵنیایی دەروون و نەبوونی دڵەڕاوکێ بنەمایەکی گەورەیە وا دەکات دڵ ڕوو بکاتە کارە گرینگەکان، هەر کەسێك لە کار و ئەرکە لاوەکییەکان بۆوە و دەستی خاڵی بوو ئەوا ڕوو دەکاتە کار و ئەرکە بنەڕەتی و گرینگەکان، بۆیە لە فەرموودەدا هاتووە: ((لا يقضي- القاضي بين اثنين وهو غضبان)) رواه البخاری و مسلم..واتە: ئەو کاتەی دادوەر تووڕەیە نابێ داوەری لەنێوان دوو کەسدا بکات.

هەروەها هاتووە: (( إذا وضع العَشاء وحضرت العِشاء فابدؤوا بالعَشاء)) رواه البخاری و مسلم.. واتە: کاتێ نانی ئێوارە دانرا و بانگی نوێژی عیشای دا ئەوا نانی ئێوارەتان بخۆن..

هەر کەسێك توانی ژنێك بکاتە هاوسەر کە لە شێوە و واتادا باش بوو با چاوپۆشی لە خەوش و نەنگییەکانی بکات و ئەویش با هەوڵ بدات پیاوەکەی ڕازی بکات بێ نزیکبوونەوەیەکی وەها لێی بێزار بێت و دوورییەکیش لەبیری بکات، با خۆی بۆ بڕازێنێتەوە، لەم نێوەندەدا دوو مەبەست و ئامانج دێنەدی: منداڵ و تێرکردنی

ئارەزوو. لەگەڵ ئەو خۆپارێزییەی باسم کرد دۆستایەتی بەردەوام دەبێت و پیاویش جگە لەو ژنە چاو نابڕێتە هیچی تر و بێنیاز دەبێ.

ئەگەر توانی ژنی زیاتر بێنێ و هێناشی و زانی بەوە دەگاتە ئەو مەبەستەی زیاتر دڵی لە خەیاڵ و بیر و هزر بەتاڵ بێت ئەوا بۆ حاڵی وی باشترە. ئەگەر ترسا لە بوونی غیرەیەك کە دڵ مەشغوول دەکات یان ترسا بوونی ژنێکی جوان دڵی لە یادی ئاخیرەت بێئاگا دەکات یان داوای شتێکی لێ دەکات کە لە خۆپارێزی (الورع) دووری دەخاتەوە ئەوا یەك ژنی بەسە.

هەندێ جار وا ڕوودەدات ژنە جوانەکان دوورن لە داوێنپاکی، ئەو کەسەی ئەو جۆرە ژنە جوانانەی هەیە با زیاتر هەوڵی داپۆشین و پاراستنیان بدات، ئەگەر شتێکی بینی کە پێی ڕازی نەبوو با خێرا بیانگۆڕێت چونکە ئەو هۆکاری بەجێهێشتن و هیجرانە، ئەگەر توانی بە یەکێك ڕازی بێت و داکەوێت ئەوا یەك ژن باشترە، ئەگەر ئەم یەکە مەبەستی پیاوەکەی دەهێنایەدی ئەوا با قەناعەت بکات ئەگەریش وانەبوو با بیگۆڕێ.

جووتبوون لەگەڵ ژنی خۆشویستراو وا دەکات هەموو مەنی کۆبۆوە بەتاڵ بێت و بێتەدەرەوە، ئەوەش دەبێتە هۆی ڕەسەنی و تەواویی منداڵ و ئارەزوو بەتاڵکردنەوەی تەواو.

## ٢٩- شیرنایی گوێڕایەڵی و نەگبەتیی سەرپێچی

هەر شتێك خودا لە دونیا خوڵقاندوویەتی نموونەیەکە لە ئاخیرەت، هەر شتێك لە دونیادا ڕوودەدات نموونەیەکە لەوەی لە ئاخیرەتدا ڕوودەدات.

بەڵام ئەو شتانەی لە دونیا خوڵقێنراون (ئیبن عەبباس) (خودا لێی ڕازی بێت) لەبارەیانەوە وتوویە: ((شتەکانی بەهەشت و دونیا تەنها لە ناودا بەیەکدەچن.)).

ئەمە لەبەرئەوەی خودای گەورە بە خۆشییەك ئارەزووی مرۆڤی بەرەو لای خۆشییەك بزواندووە و بە ئازار و ئەشکەنجە لە ئەشکەنجەیەکی تری ترساندووە.

بەڵام ئەوەی لە دونیا ڕوودەدات ئەوا هەر ستەمکارێك لەسەر ستەمەکەی هەر لە دونیا و بەر لە ئاخیرەت سزا دەدرێ و هەروەها هەموو تاوانکارێکیش لەسەر تاوانەکەی، ئەوەش واتای ئەم ئایەتەی خودای گەورەیە کە دەفەرموێت: ﴿مَن يَعۡمَلۡ سُوٓءٗا يُجۡزَ بِهِۦ﴾ (النساء: ١٢٣) واتە: هەر کەسێك کردەوەیەکی خراپ بکات سزا دەدرێ.

لەوانەیە سەرپێچیکار و گوناهبار سەلامەتیی جەستە و ماڵی ببینێ و پێی وابێت کە هیچ سزایەك نییە بەڵام بێئاگایی وی لەوەی پێی سزا دراوە خۆی لە خۆیدا سزایە. دانایان وتوویانە: سەرپێچی و تاوان دوای سەرپێچی و تاوان سزای سەرپێچییە، چاکە دوای چاکە پاداشتی چاکەیە.

ڕەنگە سزای دونیا مەعنەوی بێت هەروەك هەندێ زانای بەنی ئیسرائیل وتوویانە: پەروەردگارا! من چەندە سەرپێچیت دەکەم و تۆش سزام نادەیت! پێی وترا: چەندە سزات دەدەم و تۆش نازانیت! ئەدی ئەوە نییە لە شیرنایی موناجات و لاڵانەوەی خۆم بێبەشم کردوویت؟!

هەر کەسێ لەم جۆرە سزایە وردبێتەوە دەبینێ هەمیشە بۆ هەمووان لە بۆسەدایە تەنانەت کاتێ پرسیار لە (وەهەیبی کوڕی ئەلویرد) کرا: ئایا کەسێك تاوان بکات چێژ لە تاعەت و خواپەرستی وەردەگرێ؟ گوتی: نا، تەنانەت ئەوەشی کە هزری تاوانی بەدڵدا دێت!

لەوانەیە کەسێك چاوی بەڕەڵلا بکات خودا لە ڕووناکایی دڵ و ڕۆشنایی بیر بێبەشی بکات، یان بە هۆی زمانشڕییەوە لە پاکیی و خاوێنیی دڵ بێبەشی بکات، یان لە خۆراکیدا شوبهەیەك هەبێ ناخی تاریك بکات و لە شەونوێژ و شیرنایی موناجات بێبەش بکرێت...هیتریش.. ئەمەش بابەتێکە ئەوانەی خەریکی لێپرسینەوە و موحاسەبەی نەفسی خۆیانن باش دەیزانن.

پێچەوانەی ئەمە هەر کەسێك تەقوای خودا بکات هەر لە دونیا پاداشتی چاکەی خۆی وەردەگرێتەوە، لە فەرموودەدا هاتووە کە خودای گەورە دەفەرموێت: ((تەماشاکردنی ژنان تیرێکی ژەهراوییە لە تیرەکانی شەیتان، هەر کەسێك لەپێناو ڕەزامەندیی من وازی لێ بێنێ ئەوا ئیمانێکی وەهای پێ دەبەخشم کە لە دڵیدا هەست بە شیرناییەکەی بکات.))...ئەمەش مشتێکە لە نموونەی خەروارێك و نموونەی تر زۆرە.

بەڵام بەیەکگرتنی ئاشکرا لە ڕوواڵەتدا کەم ڕوودەدات بوەستێ، لەوبارەوەش فەرموودەی پێغەمبەرە (صلی اللە علیە وسلم) کە دەفەرموێ: ((الصُبحة تمنع الرزق)) ضعیف جدا. واتە: ((خەوی بەیانیان دەبێتە هۆی گرتنەوەی ڕۆزی))، هەروەها دەفەرموێ: ((إن العبد لیحرم الرزق بالذنب یصیبه)) رواه أحمد و ابن ماجه.. واتە: مرۆڤ بە هۆی ئەنجامدانی تاوانەوە لە ڕۆزی بێبەش دەکرێ.

نموونەی ئەمە ئەگەر کەسی بیرڕۆشن و دڵڕوون لێی وردبێتەوە سزاکە دەبینێ و تێ دەگات هەروەك (فوزەیلی کوڕی عەیاز) وتوویە: من کە سەرپێچیی خودا دەکەم نیشانەی ئەوە لە خووی کەنیزەك و باربەرەکەم دەزانم..

ئەبی عوسمانی نەیسابووری لە کاتی چوونی بۆ نوێژی هەینی قەیتانی پێڵاوەکەی پسا و دەمێك بۆ چاکردنەوەی دواکەوت پاشان وتی: ئەوە بۆیە قەیتانەکە پسا چونکە سوننەتی خۆشۆرینی هەینیم نەکرد!

لە سەیروسەمەرەکانی سزا و پاداشت لە دونیا ئەوەیە:

کاتێ براکانی یوسف دەستی ستەمیان بۆ یوسف درێژکرد و بە نرخێکی کەم وەکوو کۆیلەیەك فرۆشتیان: ﴿وَشَرَوْهُ بِثَمَنٍ بَخْسٍ﴾ (یوسف: ٢٠) دواجار دەستیان لەبەری پانکردەوە و داوای یارمەتییان لێی کرد و وتیان: ﴿وَتَصَدَّقْ عَلَيْنَآ﴾ ( یوسف: ٨٨) واتە: خێرمان پێ بکە.

کاتێکیش ژنی عەزیزی میسر پەلاماریدا و دواتریش تۆمەتباری کرد و بە هاوسەرەکەی وت: ﴿مَا جَزَآءُ مَنْ أَرَادَ بِأَهْلِكَ سُوٓءًا﴾ (یوسف: ٢٥) واتە: سزای ئەو کەسە چییە کە بیەوێ دەسدرێژی بکاتە سەر هاوسەرەکەت؟!

پاشان دانی بە تاوانەکەیدا نا و وتی: ﴿أَنَا۠ رَٰوَدتُّهُۥ عَن نَّفۡسِهِۦ﴾ ( یوسف: ٥١) واتە: من داوای کاری بەدڕەوشتیم لێی کرد.

ئەگەر کەسێك لەبەر خاتری خوای گەورە وازی لە تاوانێك هێنا ئەوا بەرووبوومی ئەوە دەبینێ، هەروەها بە هەمان شێوە ئەگەر چاکەیەکیشی کرد.

لە فەرموودەدا هاتووە: ((إذا أملقتم فتاجروا الله بالصدقة)) واتە: ئەگەر هەژار کەوتن بە خێر و سەدەقە بازرگانی لەگەڵ خودا بکەن...

بینیومانە خەڵك هەبووە بۆ خۆشی و ئاسوودەیی دونیا ڕێی بە خۆی داوە ئەو کارانە بکات کە شەرع ڕێگری لێ کردووە کەچی دۆخەکەی پێچەوانە بۆتەوە و ژیانی لێ تاڵ بووە و مەبەست و ئامانجەکانی بەرەواژ بوونەتەوە..

## ٣٠- دڵسۆزی بۆ خودا

سەیری ئەو بەڵگانەم کرد کە لەبارەی خودای گەورەوە هەن دیتم لە لم زیاترن و لە سەیرترینیان ئەمەیە:

مرۆڤ شتێك کە خودا پێی ڕازی نییە دەشارێتەوە بەڵام خودا ئاشکرای دەکات تەنانەت ئەگەر دوای ماوەیەکی درێژیش بێت، ئیتر ئەگەر خەڵك نەشیبینیبێت ئەوا دەکەوێتە سەر زاران و ڕەنگە خاوەنەکەی تووشی چورتمێکی وەها بکات لەنێو خەڵکدا ئابڕووتکاو ببێت، ئەوەش دەبێتە وەڵامێك بۆ هەموو ئەو تاوانانەی شاردوونیەتەوە و بۆ ئەوەی خەڵك بزانێ کە خودایەك هەیە لەسەر هەڵە و تاوان مرۆڤ سزا دەدا و هیچ پەردە و خۆشاردنەوەیەك سوودی نییە و هیچ کردەوەیەکیش لە کن وی ون نابێ.

هەروەها جاری وا هەیە مرۆڤ خواپەرستی و تاعەت دەشارێتەوە بەڵام پێوەی دەردەکەوێ و ئاشکرا دەبێ و خەڵك بە زیاترەوە لەبارەیەوە دەدوێن تەنانەت خەڵك وەکوو کەسێکی دوور لە تاوان دەیناسن و تەنێ باسی چاکەکانی دەکەن و هەر بە چاکە ناوی دێنن، ئەوەش بۆ ئەوەیە بزانرێ کە خودایەك هەیە کاری هیچ کەسێك ون ناکات.

دڵی خەڵك حاڵی كەسەكە دەزانێ و خۆشی دەوێ یان ڕووی لێ وەردەگێڕێ و زەمی دەكات، یان بەپێی ئەوەی لەنێوان كەسەكە و خودا لە ئارادایە و دێتەدی پەسن و ستایشی دەكات، خودا لە هەموو خەم و خراپەیەك دەیپارێزێ.

هەر كەسێك بێ ڕەچاوكردنی ڕەزامەندیی خودا نێوانی خۆی و خەڵكی چاك كرد ئیللا مەبەست و ئامانجەكەی بەرەواژ دەبێتەوە و ئەوەی ستایشی دەكرد دەكەوێتە زەمكردنی.

## ٣١- خەڵك وەكوو كانزای زێڕ و زیون

بە هزرێكی وردەوە لە زەوی و ئەوەی لەسەریەتی وردبوومەوە، دیتم وێرانی زیاترە لە ئاوەدانییەكەی.

پاشان لە بەشە ئاوەدانكراوەكەی سەرنجم دا، دیتم بێباوەڕان دەستیان بەسەر زیاتریدا گرتووە و بینیم ئەهلی ئیسلام بەراورد بە بێباوەڕان لەسەر زەوی كەمن. پاشان لە دۆخی موسڵمانان ڕامام دیتم دەسكەوت و ماڵی دونیا زۆربەیانی لە خودای ڕۆزیدەر بێئاگا و مژوول كردووە و وای لێ كردوون پشت بكەن لەو زانستەی بەرەو خودا ڕێنماییان دەكات.

دەسەڵاتدار بە كاری ئەمر و نەهی و چێژ وەرگرتن لێیانەوە سەرقاڵە و مەبەست و ئامانجەكانی دوایيان نایە و كەسیش بە ئامۆژگارییەك ڕووبەڕووی نابێتەوە بەڵكوو هەر بە شان و باڵی هەڵدەدەن كە ئەوەش هەوا و ئارەزووی نەفسی لە كن بەهێزتر دەكات! ! بەڵكوو پێویستە نەخۆشییەكان بە دژەكانیان ڕووبەڕوویان ببینەوە هەروەكوو (عومەری كوڕی موهاجیر) دەڵێ: (عومەری كوڕی عەبدولعەزیز) پێی وتم: ئەگەر دیتمت لە هەق لامداوە ئەوا یەخەم بگرە و ڕامهەژێنە و بڵێ: چیتە ئەی عومەر؟ !

هەروەها (عومەری کوڕی خەتتاب) (خوای گەورە لێی ڕازی بێت) وتوویەتی: ڕەحمەتی خوا لەو کەسەی کەموکورتییەکانی خۆمانمان بە دیاری بۆ دەنێرێ..بۆیە سوڵتان و دەسەڵاتدار لە هەموو کەس زیاتر پێویستی بە ئامۆژگاری و نەسیحەتە.

سەبارەت بە سەربازەکانی سوڵتان ئەوا زۆربەیان مەستی هەوا و ئارەزوو و زینەتی دونیان و سەرباری ئەمانەش نەزان و بێ زانیارین، گوناه ئازاریان نادات و پۆشینی ئاوریشم و مەیخواردنەوەیان بەلاوە ئاساییە تەنانەت هەندێکیان وتوویانە: سەرباز چی بکات؟! بەرگی لۆکە لەبەر بکات؟! ستەم لەلایان بۆتە سروشتیان و شتەکان بە ناشەرعی وەدەست دێنن!

هەروەها بیابانشینەکان نەفامی و نەزانی دایپۆشیون و تێیدا نقووم بوون..بە هەمان شێوە خەڵکی گوندەکانیش پیس و چەپەڵن و بایەخ بە پاك و خاوێنی نادەن و نوێژەکانیان هیچ بەلاوە گرینگ نییە!! ڕەنگە ژنیان بە دانیشتنەوە نوێژ بکات!

پاشان سەیری حاڵی بازرگانەکانم کرد چاوبرسێتی و چڵێسی بەسەریاندا زاڵ بووە تەنانەت وایان لێ هاتووە تەنها خەمی ئەوەیانە چۆن پارەیان دەستکەوێت و بە چ ڕێگایەك و چۆن بووە و سووخۆری لە سەوداکانیان بڵاو بۆتەوە و هیچ یەکێکیان بایەخ بەوە نادات لەکوێوە دونیای دەست دەکەوێت؟! لە زەکاتدانیش کەمتەرخەمن و نەدانی بەلایانەوە ئاساییە مەگەر کەسێك خودا پاراستبێتی.

پاشان سەیری خەڵکی بازاڕ و ئەوانەم کرد کە خەریکی پەیداکردنی بـژێوی ژیانیـان دیتم بە گشتی بە مامەڵـە و کـڕین و فرۆشـتنیان فێـڵ و گـزی و تـەرازووبازی هەیـە، لەگەڵ ئەوەشدا لە نەزانیدا ڕۆچوون!

دیتم زۆربەی ئەوانەی کوڕیان هەیە بۆ پارە پەیداکردن کاری پێ دەکات بەر لـەوەی فێری ڕەوشت و زانستی پێویستی بکات. پاشان سەیری حاڵوبـاری ژنـانم کـرد دیـتم کەم دین و زۆر نەزانن و لەبارەی ئاخیرەتەوە هیچ زانیاری و هەواڵێکیان نییە مەگەر ئەوەی خودا پاراستبێتی.. وتم: عەجایب! ئەدی کێ ماوە بۆ ناسین و خزمـەتکردنی خودای گەورە؟!

پاشان سەرنجی زانایان و فێرخوازان و عابید و زاهیدانم دا:

لە عابید و زاهیدەکان ڕامام دیتم زۆربەیان بە بـێ زانیـاری پەرسـتش دەکـەن، دڵـی بەوە خۆشە گەورە بکرێ و دەستی ماچ بکـرێ و شـوێنکەوتەی زۆر بێـت، تەنانـەت هی وایان هەیە ئەگەر ناچاربێت پێویستییەك لە بازاڕ بکڕێ نایکـات نـەوەك شـان و شکۆی بشکێت! !پاشان ئاستی یاسا و نەریتەکەیان ئەوەندە هەڵدەکشێ تا ئەوەی سەردانی نەخۆش ناکەن و بەشداری هیچ مردووناشتنێك نابن مەگەر کەسەکە زۆر لە کنیان بەقەدر و نرخ بێت، سـەردانی یـەکتریش ناکـەن، بـەڵکوو هەنـدێکیان دیـدەنی یـەکتریش ناکـەن، یاسـا و نەریتـەکانیان لـە کـن بۆتـە بـت و بـێ ئـەوەی پـێ بـزانن دەیپەرسـتن! هەیانـە بەنەزانییـەوە فـەتوا دەدات نـەوەك سـەرقافڵەیی و پێشەوایەتییەکەی عەیبدار بێت! پاشان ڕەخنە لە زانایـان دەگـرن بـەوەی گرینگـی

به دونیا دەدەن و، نازانن ئەوەی لە دونیا مایەی زەم و ڕەخنەگرتنە ئەوەیانە کە ئەمان تێیدان نەك سوودوەرگرتن لە موباح و ڕێپێدراوەکانی!

پاشان سەرنجی زانایان و فێرخوازانم دا، دیتم کەمێك لە فێرخوازان نیشانەی نەجابەتیان پێوە دیارە چونکە نیشانەی نەجابەت و ڕەسەنێتی ئەوەیە زانستخوازییەکەی بە مەبەستی کارپێکردن بێت، بەڵام زۆربەیان زانستخوازییەکەی بۆ ئەوەیە بیکاتە تۆڕێك بۆ پارە پەیداکردن: یان بۆ ئەوەی قەزاوەت و دادوەریی شوێنێکی پێ دەسکەوێت یان ببێتە دادوەری هەرێمێك، یان بای ئەوەندە زانستی دەسکەوێ لە هاوڕەگەزەکانی خۆی جیای بکاتەوە و لەوان بەرزتر بێت و ئیتر تەواو.

پاشان سەرنجمدایە زانایان دیتم زۆرتریان هەوا و ئارەزوو یارییان پێ دەکات و بەکاریان دێنێت، ئەو شتە هەڵدەبژێرێ کە زانست ڕێگری لێ دەکات و ڕوو لە شتێك دەکات کە زانست جڵەوگیری لێ دەکات، نابینی زەوق و سەلیقەی مامەڵەکردنی خودای هەبێ بەڵکوو تەنها هەوڵ و هیممەتی ئەوەیە قسە بکات و تەواو.

بەڵام خودا زەوی خاڵی ناکات لەوانەی بە بەڵگەوە بانگەواز دەکات و زانست و کارکردن بەیەکەوە گرێداوە و مافەکانی خودا دەزانێ و لێی دەترسێ، ئەوە قوتب و گەورەپیاوی دونیایە، هەر کاتێ مرد خودا بە کەسێکی تر شوێنی پڕ دەکاتەوە، ڕەنگە نەمرێ تا کەسێك پەیدا دەبێ لە هەموو کارێك شوێنی دەگرێتەوە، نموونەی ئەمەش زەوی لێ خاڵی نابێ و لەنێو ئوممەتدا پایەی پێغەمبەری هەیە.

ئەوەی باسی دەکەم بنەما و سنوورەکان دەزانێ و دەیانپارێزێ، ڕەنگە زانستی یان مامەڵەی کەم بێت بەڵام کەسی تێروتەواو لە هەموو ڕوویەکەوە ئەوا بوونیان دەگمەنە، ڕەنگە لە ماوەیەکی دوورودرێژ کەسێك هەڵکەوێ.

هەروەها لە هەموو پێشینان (السلف)م کۆڵییەوە و ویستم ئەوانە دەربهێنم کە زانست و کردەوەیان بەیەکەوە گرێداوە و بوونەتە موجتەهید و پێشەنگ بۆ خواپەرستان، لە سێ کەس زیاترم نەبینی کە بریتیین لە: یەکەمیان: حەسەنی بەصری، دووەمیان: سوفیانی ثەوری، سێیەمیان: ئەحمەدی کوڕی حەنبەل. لەبارەی باسوخواسی هەر یەکێکیان کتێبێکم داناوە. ئاساییە ئەگەر کەسێك سەعیدی کوڕی موسەییەبیش بکاتە چوارەمیان.

ئەگەرچی لەنێو پێشیناندا کەسانی دیار و ناسراو هەن بەڵام زۆربەیان لە هونەرێك شارەزا و لە یەکێکی تر باڵکورت، هەیانە لە ڕووی زانستەوە لەپێشە و هەیە لە ڕووی کار و کردەوە، هەموو ئەمانە لە زانست و مامەڵە بەشی تێروتەسەلیان هەبووە.

ئەگەرچی ئەوان فەزڵی پێشینەیان وەرگرتووە بەڵام بێ ئومێد نین لەوەی کەسی وەکوو ئەوانیش پەیدا ببێت و شوێنپێی وان هەڵگرێت، خوای گەورە ئەوەی لە حەزرەتی موسا شاردراوە بوو بە (خضر)ی ڕاگەیاند، گەنجینەکانی خودا پڕاوپڕن و بەخششەکانی تەنها تایبەت نییە بە کەسێك.

لەبارەی (ئیبن عەقیل)ەوە بۆم باس کراوە کە لەبارەی خۆیەوە وتوویە: ئەز لە بەلەمێکدا چوومە نێو دەریا پاشان شکێندرا.

چەندان کەسی خودپەسند و سەرسام بە خۆ کاتێ هەندێ شتیان لە کەسانی ترەوە بۆ دەردەکەوێ ئیتر خۆیان لەبەر چاو دەکەوێ! !چەندان کەسی وەپاشکەوتوو وەپێش کەسی پێشکەوتووی داوەتەوە! وتراوە:

إن الليالي و الأيام حاملة وليس يعلم غير الله ما تلدُ

شەو و ڕۆژەکان ئاووسن و جگە لە خودا کەس نازانێ چییان دەبێ.

## ٣٢- چێژی شكاندنی نەفس

دیتم مەیلی نەفس بۆ ئارەزووەكان زیاد لە ئەندازەیە، تەنانەت كە مەیلی كرد بە دڵ و عەقڵ و هۆشەوە مەیل دەكات، ئیتر مرۆڤ سوود لە هیچ ئامۆژگارییەك وەرناگرێ! ڕۆژێكیان نەفس كە بەتەواوی بەرەو لای شەهوەت و ئارەزوو مەیلاندبووی هاوارم لێی كرد: ماڵوێران! ساتێك بوەستە با چەند قسەیەكت لەگەڵ بكەم، پاشان چیت پێ خۆشە ئەوە بكە!

وتی: بێژە دەبیستم.

وتم: دەركەوتووە كە تۆ مەیلت بۆ ئارەزووە ڕێپێدراوەكان كەمە بەڵام زۆربەی مەیلت بۆ قەدەغەكراوەكانە، ئێستا ئەمن دوو شتت بۆ ئاشكرا دەكەم ڕەنگە دوو شتی شیرینت بە تاڵ بێتە بەرچاو:

سەبارەت بە ئارەزووە ڕێپێدراوەكان ئەوا بۆ تۆ ڕەها و بەرهەڵدایە بەڵام ڕێگاكەی دژوارە: چونكە ڕەنگە پارە نەتوانێ وەدەستی بێنێ، بە كاروكاسبیش زۆربەی وەدەست نایەت، بەوەش كاتی بەنرخ دەڕوات. پاشان لە كاتی وەدەسهێنانی و لە حاڵەتی وەدەسهێنانیشی هەر دڵ پێوەی سەرقاڵ دەبێ و ترسی لەدەسچوونیشی هەیە. پاشان كەموكورتییەكانی ئەو ئارەزووە ڕێپێدراوە دێتە بەرەوە: ئەگەر خواردن بێت ئەوا تێربوون كۆمەڵێك دەرد و نەخۆشی بەدواوەیە، ئەگەر ئارەزووەكە

له کەسێکدا بێت ئەوا گرفتی لێ بێزاربوون یان جیابوونەوە یان بەدخوویی لەگەڵە، پاشان خۆشترین و بەتامترین پەڕین و جووتبوون زۆرترین لاوازی و بێهێزی بۆ جەستە تێدایە... شتی تریش هەیە کە باسکردنی درێژ دەبێتەوە.

بەڵام ئارەزووە قەدەغەکراوەکان ئەو خاڵانەی تێدایە کە لە بابەتی ڕێپێدراوەکان ئاماژەمان پێدا و ئەمانەشی زیاترە: ئافەتی ئابڕوو، سەرچاوەی سزا و حەیاچوونی دونیایە، هەڕەشەی ئاخیرەتیش لەولاوە بوەستێ، پاشان هەر کاتێ تۆبەکار بیری بکەوێتەوە نیگەران و بێتاقەت دەبێ.

لە هێزی تێکشکاندنی هەوا و ئارەزوودا چێژێك هەیە لە سەرووی هەموو چێژێکەوە، ئەی نابینی ئەو کەسەی ئارەزوو بەسەریدا زاڵ بووە چۆن زەلیل دەبێ چونکە تێکشکاوە، بە پێچەوانەی کەسی زاڵبوو بەسەر ئارەزوودا کە دڵپتەو و بەهێز دەبێ چونکە ئارەزووی تێکشکاندووە.

زۆر زۆر وریابە لە دیتنی حەزلێکراو بە چاوی جوانی هەروەکوو دز چێژی بردنی پارە و ماڵ لە شوێنی قایمکراودا دەبینێ بەڵام بە چاوی هزری (دەسبڕین) نابینێ!

با مرۆڤ چاوی بینایی بکاتەوە بۆ بینینی سەرەنجامەکان و گۆڕانی چێژ و خۆشی بۆ خەم و خەفەت و هەڵگەڕانەوەی لەوەی ببێتە چێژ و خۆشی جا یان لەبەر بێزاری یان بە هۆی ئافاتی ترەوە، یان بە هۆی پچڕان و نەمانی چێژەکە بە هۆی چیتر ملنەدانی خۆشەویستەکەوە، ئیتر تاوان و سەرپێچیی یەکەم وەکوو پاروویەکی

لێدێت کە برسییەك خواردبێتی بەڵام نەبووبێتە هۆی شکاندنی برسێتییەکەی بەڵکوو زیاتر ئارەزووی خواردنی جووڵاندووە.

با مرۆڤ چێژی تێکشکاندنی ئارەزووی لەگەڵ سەرنجدانی سوودەکانی ئارام لێگرتنی لەبیربێت، هەر کەسێك بۆ ئەوە یارمەتی درا و سەرکەوتوو بوو ئەوا ساغ و سەلامەتی لێوەی نزیکە.

## ٣٣- بۆچی دڵبێداری بەردەوام نابێ؟

لە کۆڕێکی خۆشدا دڵەکان ئامادە و چاوەکان پڕ فرمێسك و گوێیەکان قوڵاغ و نەفسەکان پەشیمانی کەمتەرخەمییەکان و ئیرادەکان هەستابوونە سەر پێ بۆ خۆچاککردن و زمانەکانیش سەرزەنشتی نەفسیان دەکرد لەسەر خەمساردی و تەمەن بەفیڕۆدان و بێئاگایی، لەم کاتەدا بیرێکم بە مێشکدا هات و بە خودی خۆم وت: بۆچی ئەم بێدارییە بەردەوام نابێ؟ من وا دەبینم نەفس و بێداری لەم مەجلیسەدا هاوڕێ و هاوشانن، کە لێرە هەستاین نامۆیی دەکەوێتە نێوانیانەوە.

لەوە ڕامام و دیتم هێشتا نەفس بەئاگا و دڵیش زانایە بەڵام بەربەست زۆرن و ئەو هزر و بیرەش کە پێویستە لە ناسینی خودا بەکاربێت بە هۆی بەکارهێنانی لە کاروباری دونیا و پێویستییەکانی نەفسدا ماندوو بووە و دڵیش لەوەدا ڕۆچووە و جەستەش دیلێکی بەکارهێنراوی چەشنی کارگوزارە.

لە کاتێکدا بیر و هزر بە پەیداکردنی خواردن و خواردنەوە و پۆشاك سەرقاڵە و بیر لەوە دەکاتەوە بۆ سبەینێ و ساڵێکی تری چی دابکات بایەخ بە پاکوخاوێنی و لێ دەرچوونی شتە زیانبەخشەکان لە جەستەی دەدات وەکوو مەنی، ئیتر بۆ ئەمە پێویستی بە هاوسەرگیری دەبێت و دەشزانێ ئەمەش نایەتەدی بە کارکردن و پارە پەیداکردن نەبێ بۆیە بیر لەوە دەکاتەوە و کاری بۆ دەکات، پاشان منداڵ دێتە

بوون و گرینگی پیٚ دەدات و کاری بۆ دەکات و ئیتر بیر و هزر بە کاروباری گەورە و گچکەی دونیاوە سەرقاڵ دەبیٚ و کاری بۆ دەکات.

کاتیٚ مرۆڤ ئامادەی کۆڕی وەعز دەبیٚ بە سکی برسی و تەنگاوی نایەت بەڵکوو بە هیممەتی تەواو دیٚت و دونیا فەرامۆش دەکات ئیتر ئامۆژگاری و وەعزەکە دەچیٚتە ناخی دڵیەوە و وریای دەکاتەوە و سەرنجی ڕادەکیٚشیٚ، لەویٚوە بە ئاگا دیٚتەوە و هەست بە کەموکورتی و کەمتەرخەمییەکانی دەکات و چاوانی پڕ دەبن لە ئەسرینی پەشیمانی و بڕیار دەدات قەرەبووی کەمتەرخەمییەکان بکاتەوە.

ئەگەر ئەو نەفسە واز لەو خوو و نەریتانە بیٚنیٚ کە دەقی پیٚوە گرتووە ئەوا هەمیشە سەرقاڵ دەبیٚ بە خزمەتکردنی پەروەریٚنی خۆی و ئەگەریش بکەویٚتە نیٚو خۆشەویستیی توندی خوداوە ئەوا لەبەر سەرقاڵبوونی بە نزیکایەتیی خودا ئەوا لە هەموو کەس نامۆ و بیٚگانە دەبیٚ.

لەبەرئەمە زاهیدەکان چوونەتە خەڵوەتگاکان و سەرقاڵی لابردنی کۆسپ و بەربەستەکان بوون، بە گوێرەی کۆشش و خۆماندووکردنیان مەبەست و ئامانجەکانیان هاتۆتەدی، هەروەکوو خەرمانیش بە ئەندازەی تۆوەشاندنە.

بەڵام من لەم حاڵەتەدا خاڵیٚکی وردم بەدیکرد ئەویش ئەوەیە کە: ئەگەر نەفس هەمیشە بیٚدار و بەئاگا بیٚت ئەوا دەکەویٚتە نیٚو خراپەیەکی گەورەتر ئەویش بریتییە لە سەرسامبوون بە حاڵی خۆی و خودپەسندایەتی و سووك سەرنجدانی هاوڕەگەزەکانی! ڕەنگە بە هۆی هیٚزی زانست و عیرفانییەوە هەڵکشیٚ و بڵیٚ: بۆ

من و، له کنم و، شایسته‌م...بکه‌وێته نێو ناوه‌ندی ده‌ریای تاوانه‌کانی و سه‌رگه‌ردان بێت، جا ئه‌گه‌ر له که‌ناراو وه‌ستا و به‌ندایه‌تیی ڕاستینه‌ی ئه‌نجام دا ئه‌وا ئه‌وه بۆی باشتره.

ئه‌مه حوکمی زۆربه‌ی خه‌ڵکه و بۆیه له‌م پایه و مه‌قامه مژوول کراون، هه‌ر که‌سێ تۆوی وه‌شاند و بۆی سازا ئه‌وا تووشی هه‌ڵه‌یه‌ك هه‌ر ده‌بێ که چاوی ترس له سزادانی وه‌کوو به‌زه‌ییه‌ك پێی چاودێری ده‌کات، به‌وه به‌ندایه‌تییه‌که‌ی ڕاست و دروست ده‌بێ و خواپه‌رستییه‌که‌ی سه‌لامه‌ت ده‌رده‌چێ.

فه‌رمووده‌ی صه‌حیحی پێغه‌مبه‌ریش (صلی الله علیه وسلم) ئاماژه‌ی به‌م واتایه کردووه که فه‌رموویه‌تی: (( لو لم تذنبوا لذهبَ اللهُ بِكم ولجاءَ بقومٍ يذنبونَ فيستغفرونَ اللهَ فيغفرُ لَهم)) رواه مسلم..

واته: گه‌ر تاوان نه‌که‌ن ئه‌وا خودا ئێوه له‌ناوده‌بات و خه‌ڵكانێكی تر ده‌هێنێ که تاوان بکه‌ن و داوای لێخۆشبوون بکه‌ن و ئه‌ویش لێیان خۆش ببێت..

## ٣٤- نەزانیی خۆبەسۆفیزانەكان لەبارەی ماڵی دونیاوە

بیرم کردەوە و دیتم کە پاراستنی ماڵ و دارایی پێویستە و لە واجبەکانە، ئەوەشی خۆبەسۆفیزانە نەزانەکان ناوی دەنێن پشتبەخوابەستن (توكل) — لە بەخشینی هەموو ئەوەی هەیتت — شەرعی و ڕێپێدراو نییە! پێغەمبەری خودا (صلی الله علیه وسلم) بە (کەعبی کوڕی مالیك)ی فەرموو: ((هەندێ لە ماڵ و داراییەکەت بۆ خۆت هەڵگرە))، هەروەها بە (سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص) یشی فەرموو: ((ئەگەر ماڵ و منداڵە میراتگرەکانت بە دەوڵەمەند و بێنیاز لە خەڵك بەجێ بهێڵیت باشترە لەوەی بە دەسکورت و هەژار بەجێیان بهێڵیت و دەست لە خەڵك پانکەنەوە))..

ئەگەر نەزانێك لەوبارەوە ڕەخنەی گرت و گوتی: دەنا ئەبووبەکر خودا لێی ڕازی بێت هەموو ماڵ و داراییەکەی بۆ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هێنا؟! وەڵامەکەی ئەمەیە: ئەبووبەکر خاوەنی بژێوی و بازرگانی بوو، ئەگەر هەموو ماڵیشی بەخشیبێت دەیتوانی قەرز بکات و ببووژێتەوە، هەر کەسێ ئەم سیفەتەی هەبێ من زەمی ماڵبەخشینی ناکەم.

بەڵکوو ئەو کەسانە زەم دەکرێن کە ماڵی خۆی دەبەخشێت و لە کەسانی خاوەن داهات و بژێویش نییە یان لەوانە بەڵام لە بژێوی و داهات دادەبڕێ و دەبێتە بارگرانی بەسەر خەڵکەوە، داوایان لێ دەکات و دڵی بە خەڵك وابەستە دەبێ و

چاویان تێ دەبڕێ و تەمای پێیان دەبێ، هەر کات دەنگی دەرگا بێت دڵی دادەچڵەکێ و دەڵێ: ئەها ئەوە نان و ڕۆزی هات!

ئەمە شتێکی ناشیرن و کرێتە بۆ ئەو کەسانەی توانای پەیداکردنی نان و بژێویان هەیە، ئەگەریش نەتوانێ ئەوا ماڵبەخشینەکەی ناشیرنترە چونکە دڵی بە ماڵ و دارایی خەڵکەوە دەنووسێ و لەوانەیە بۆ هەندێکیان زەلیلی بنوێنێ یان بە زوهد خۆی نیشان بدات، کەمترین حاڵوباری ئەوەیە لە وەرگرتنی زەکاتدا تەنگ بە هەژار و کوێر و نەخۆشە درێژخایەنەکان هەڵدەچنێ و دەبێتە برابەشیان..

بۆیە پێویستە چاو لە پیاوچاکانی پێشین بکەیت و سەیرکە: ئایا کەسێکیان تێدایە کارێکی وەکوو ئەوەی خۆبەسۆفیزانە نەزانەکانی کردبێت؟! لە سەرەتای ئەم کتێبەوە ئاماژەم بەوە داوە کە ئەوان کاریان کردووە و ماڵ و داراییان وەدەست هێناوە و ماڵ و موڵکیشیان دوای خۆیان بەجێهێشتووە.

کەواتە بگەڕێوە سەر کانیاوە سازگارەکەی یەکەم (قورئان و سوننەت) کە خاوێن و بێگەردە و کەس شێلووی نەکردووە و وریابە لەو سەرچاوە ناسازگارانەی ڕاوبۆچوونی گەند و خراپی وەهایان هەیە کە لە شەریعەت دوور و تەرەن، ئەوانە بە زمانی حاڵ بانگەشەی ئەوە دەکەن گوایە شەرع ناتەواوە و پێویستی بە شتێکی تر هەیە تێروتەواوی بکات!

بزانه كه جەستە وەكوو سواری و باربەر وایە، سواری و باربەریش دەبێ ئالیكی بدەیتێ و گرینگی پێ بدەیت، ئەگەر ئەوەت پشتگوێ خست ئەوا دەبێتە هۆكارێك بۆ وەستانت لە ڕۆیشتن.

ڕۆژێك (سەلمان) خودا لێی ڕازی بێت بینرا كیسەیەك خۆراكی بەسەر شانەوە بوو، پێی وترا: تۆ كە هاوەڵی پێغەمبەریت و ئەمەش دەكەیت؟! وتی: ئەگەر نەفس خۆراكی بۆ دابین كرا ئەوا خاترجەم دەبێت.

(سوفیانی ثەوری) وتوویە: ئەگەر خۆراكی مانگێكت دابین كرد ئەوا خواپەرستی بكە.

هەندێ كەس كە جگە لە واتەوات چیتریان پێ نییە هاتوون ڕەخنە دەگرن و دەڵێن: ئەمە گومانە لە ڕۆزیدەر كە خودایە، وا باشترە متمانەی پێ بكرێ!! وریابە لەو جۆرە كەسانە.

ڕەنگە وێنەی ئەم قسانە لە هەندێ زاهیدی پێشین هاتبێ بەڵام پشتی پێ نابەسترێ و لە بیر و ڕەفتاری پێچەوانەی ئەوان مەترسە..

(ئەبووبەكری میروەزی) وتوویەتی: گوێم لە (ئەحمەدی كوڕی حەنبەل) بوو هانی ژنهێنانی دەدا و منیش پێم وت: (ئیبن ئەدهەم) وتوویە... نەیهێشت قسەكەم تەواوكەم و بەسەریدا قیژاندم و وتی: من باسی حاڵی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و هاوەڵانیت بۆ دەكەم و تۆش باسی ئەملا و ئەولا و ڕێچكۆرانم بۆ دەكەیت؟!

بزانـه ئەگـەر کەسێك بانگەشـەی زوهـدی کـرد و هۆکارەکـانی ڕەتکـردەوه و وتـی: نـاخۆم و ناخۆمـەوه و لەبـەر گـەرمای خـۆر هەڵناسـتم و لـه سـەرماش خـۆم گـەرم ناکەمەوه ! ئەوا بزانه ئەو کەسه به کوێرای زانایان یاخی و سەرپێچیکارە، ئەگەریش خاووخێزانی هەبوو و گوتی: داری لەسەر بەردی دانـانێم و کـار ناکـەم، ڕۆزی ئـەوان لەسەر خودێیـه ! ! بـەم هۆیـەوه خێزانەکـەی تووشـی ئـازار بـوون ئـەوا ئـەو کەسـه گوناهبارە هەروەك پێغەمبەری خودا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: ((بۆ مرۆڤ ئەوەندە گوناهە بەسە کە پەیداکردنی نان و ڕۆزی خاووخێزانی فەرامۆش بکات.))..

بزانە کە بایەخدان بە کار و کەسابەت دەبێتە خاترجـەمیی و دڵئـارامی و بێخـەمی و دڵنیایی و پچڕانی تەما و چاوتێبڕین لە ماڵی خەڵك، چونکە سروشـتی مـرۆڤ مـافێکی هەیە داوای دەکات.شەرعیش ئەمەی ڕوون کردۆتەوه و پێغەمبەری خودا (صلی الله علیـه وسـلم) فەرموویـەتی: ((نەفسـت مـافی بەسـەرتەوە هەیـە، چـاوت مـافی بەسەرتەوە هەیە.))..

نموونەی سروشتی مرۆڤ لەگەڵ موریدی ڕێبوار وەکوو نموونەی سەگێك وایە کـە ئـەو کەسە ناناسێ کە لە دەرگا دەدات یان ئەو کەسەی بە شـەو بـەو نـاوەدا دێـت، هـەر کەسێك ببینێ بەو ناوەدا بڕوات پێی دەوەڕێ، ئەگەر ئەو کەسـە پارچـە نـانێکی بـۆ فڕێ بدات ئەوا ئەویش بێدەنگ دەبێ..مەبەست لە بایەخدان بەوە تەنها خاترجـەمی و بێخەمییە..ئیتر تۆش لەم بنەمایانە تێ بگە چوون تێگەیشتنیان گرینگە.

## ٣٥- ئارەزووەكانی دونیا هەڵدێر و داو و تەپكەن

لە ئارەزووەكانی دونیا ڕامام و وردبوومەوە دیتم هەموویان داو و تەڵەی وەهان بەرەو لەناوچوون و هەڵدێرت دەبەن، هەر كەسێك عەقڵی بەسەر سروشتیدا زاڵ بوو ئەوا ساغ و سەلامەت دەبێ و هەر كەسێكیش سروشتی بەسەردا زاڵ بوو ئەوا چەند بەخێرایی لەناودەچێ!

هەندێ كەسی دونیاویستم بینیوە شێت و شەیدای جووتبوون بوون لەگەڵ كەنیزەك، پاشان دەرمانی تایبەت بۆ بەهێزبوونی پەڕین بەكاردێنێ، ئیتر زۆری نەبرد تا هێز و توانای سروشتیی خۆی لەدەستدا و بووە شلەپەتە.

لە ئارەزووەكانی نەفسدا هیچ ئارەزوویەكم نەدیوە هێندەی ئەم ئارەزووە خێرا مرۆڤ لەناوببات، هەر كاتێ مرۆڤ مەیلی كەسێكی جوان و لەبەردڵان بكات ئەوا ئەوە دەبێتە هۆی ئەوەی زیاد لە عادەت حەزی جووتبوونی ببزوێ، ئەگەریش لەو جوانتری بینی ئەوا جووڵەكە زیاتر دەبێ و مەنی لەوەی پێشوو زیاتر دەردەپەڕێ، ئیتر ناوەڕۆكی ژیان زووتر و خێراتر بەرەو پووكانەوە دەڕوات، بە پێچەوانەی ئەمەوە ئەگەر ژنەكە ناشیرن بوو ئەوا جووتبوون لەگەڵیدا نابێتە هۆی دەرچوونی مەنی وەكوو پێویست، ئیتر بە قەتیسبوونی ئەم مەنییە پیاوەكە ئازاری پێ دەگات و ئارەزووی پەڕین لاواز دەبێ.

هەروەها ئەو کەسەی زیادەڕەوی لە خواردن دەکات خۆی گرفتاری زۆر کێشە دەکات و بە پێچەوانەوەش ئەوەی کەم دەخوات بە هەمان شێوە تووشی گرفت دەبێ.

ئیتر زانیم باشترین شت ئەوەیە لە هەموو شتێکدا ناوەند بگرین..دونیاش وەکوو بیابانێکی فراوانە، پێویستە پێشەوا تێیدا عەقڵ و ئاوەز بێت، هەر کەسێ جڵەوی خۆی ڕادەستی سروشت و ئارەزووی کرد ئەوا بەخێرایی سەرەنگرێ دەبێ!

ئەمە پەیوەست بوو بە جەستە و دونیاوە، ئیتر تۆش بابەتی ئاخیرەتی لەسەر پێوانە بکە و تێ بگە.

## ٣٦- زوهدى راستەقینە

لە هەندێ زاهیدی ئەم سەردەمە پێم گەیشتووە کە خواردنیان پێشکەش کردووە وتوویە: ناخۆم! پێی وتراوە: بۆ؟! وتوویە: چونکە نەفسم حەزی پێ دەکات و منیش چەندان ساڵە ئەوەم نەداوەتە نەفسم کە حەزی لێیە!

منیش وتم: لە دوو ڕووەوە ڕێی ڕاست لەم کەسە ون بووە و هۆی ونبوونەکەشی نەزانییە:

ڕووی یەکەم: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و هاوەڵانی بەم شێوەیە نەبوون. پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) گۆشتی پەلەوەری دەخوارد و حەزی لە شیرینی و هەنگوین بوو.

(فەرقەدی سەبەخی) چووە کن ئیمامی حەسەن دیتی وا فالوودە (جۆرێك شیرینییە) دەخوات، وتی: ئەی فەرقەد ڕات چییە لەبارەی ئەمەوە؟ ئەویش وتی: نایخۆم و ئەو کەسەشم خۆشناوێ کە دەیخوات. حەسەن وتی: هەنگوین و ئارد و ڕۆنی مانگا تێکەڵ بکرێن ئایا دەبێ موسڵمان عەیبی لێ بگرێت؟!(واتە فالوودە لەم پێکهاتانە دروست کراوە، ئیتر خواردنی ئەمانە چ کێشەیەکی تێدایە؟!)

پیاوێك هاته لای حەسەن و وتی: دراوسێیەکم هەیە فالوودە ناخوات. وتی: بۆ؟ وتی: دەڵێ ناتوانم سوپاسگوزاری لەسەر بکەم. حەسەن وتی: دراوسێیەکەت نەزانە، ئەدی ئایا هەقی سوپاسگوزاری ئاوی سارد دەدریّ؟!

سوفیانی ثەوری لە کاتی سەفەردا فالوودە و بەرخی برژاوی لەگەڵ خۆی هەڵدەگرت و دەیوت: زیندەوەر ئەگەر چاکەی لەگەڵ کرا باش کاردەکات.

ئەوەی لە زاهیدەکانەوە ڕوویداوە دووربوونیانە لەم هونەرە، ئەمانە شتگەلێکن لە ڕەهبانییەتەوە وەرگیراون و منیش لەم وتەیەی خوای گەورە دەترسم کە دەفەرموێت: ﴿لَا تُحَرِّمُوا۟ طَيِّبَٰتِ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكُمْ وَلَا تَعْتَدُوٓا۟ۚ﴾ (المائدة: ٨٧) واتە: ئەو شتە پاکانەی خودا بۆی حەڵاڵ کردوون حەرامی مەکەن و سنووربەزێنیش مەکەن. هیچ شتێك لەم جۆرە هونەرە لە هاوەڵانی پێشین نەگێڕدراوەتەوە مەگەر ئەوە لەبەر هۆکارێکی کاتی بووبێت.

بەڵام هۆکاری ئەو ڕووداوەی لە (ئیبن عومەر) گێڕدراوەتەوە گوایە حەزی لە شتێك کردووە دواتر داویەتی بە هەژارێك و کەنیزەکێکی بە ناوی (ڕومەیثە) هەبووە کە خۆشەویستترین کەسی بووە و ئازادی کردووە، ئەوا ئەمە و هاوشێوەکانی ئەمە نموونەی جوانن چونکە ئەمە پێی دەوترێ (ایثار) کە بریتییە لە باودانی پێویستیی کەسێك بەسەر حەز و ئارەزووەکانی خۆت، ئەگەر جاروبار و هەندێ کات ئەمە ڕوویدات ئەوا بەوە حەز و ئارەزووەکان لەوەدا تێك دەشکێن کە بە دەسکەوتنی هەر شتێکی بیەوێ سەرکەش و یاخی ببێت، بەڵام کەسێك بە بەردەوامی و ڕەهایی سەرپێچی ئارەزووەکانی بکات ئەوا دڵی کوێر دەبێ و هەست و بیری جەمەد دەبێ

و ویست و ئیرادەی پەرتوبلاو دەبێ، ئیتر زیاتر لەوەی سوودی پێ بگەیەنێ ئـازاری پێ دەگات.

(ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم) وتوویەتی: دڵ ئەگەر زۆری لێ کرا ئەوا کوێر دەبێ.

لەم وتەیەدا ڕازێکی ورد و ناسك هەیە کـە بریتییـە لـەوەی خـوای گـەورە سروشـتی بنیادەمی لەسەر واتایەکی سەیر داناوە کە بریتییە لەوەی شـتێك لـەو ئارەزووانـەی بۆ هەڵدەبژێرێ کە چاکەی وی تێدایە و بۆی بەکەڵکە، ئیتر دەزانـێ بـەو هەڵبژاردنـە چاکە و سوودی مرۆڤ و سروشتەکەی تێدایە.

دانایانی بواری پزیشکی وتوویانە: پێویستە بوار بـە نـەفس بـدرێ لـەو خواردنانـەی حەزی پێ دەکات ئەگەر جۆرێك لە زیانیشـیان تێـدابێت چـونکە نـەفس ئـەو شـتانە هەڵدەبژێرێ کە بۆی گونجاوە، جا ئەگەر کەسی زاهید لەمـەدا سـەرکوتی کـرد ئـەوا زیان بە جەستەی دەگەیەنێ ، ئەگەر ڕاکێشـەرەکانی نـاوەوە لـە سروشـت نەبووایـە ئەوا جەستە نەدەمایەوە، ئارەزووی خواردن لە ناوەوە هەڵدەچێ، جا ئەگەر بەوەی دەیخوات بێنیاز بوو ئەوا ئارەزووەکە دادەمرکێتەوە.

ئارەزوو ویستراو و پێشەوایە و باشترین هاندەر و هەڵنەرە بۆ سـوود و بەرژەوەنـدی جەسـتە بـەڵام ئەگـەر زیـادەڕەوی کـرد ئـەوا دەبێتـە مایـەی ئـازار، هـەر کـاتێکیش هاوشان لەگەڵ دڵنیابوون لە سەرەنجامی خراپ بەڕەهایی ڕێگری لە ویستی کرا ئەوا ئەوە دەبێتە هۆی خراپبوونی حاڵوبـاری نـەفس و لاوازیـی جەسـتە و نەخۆشـی کـە بەگشتی جەستە تێکوپێك دەشکێ، وەکوو ئەوەی لە کاتی زۆر تینووبـوون ئـاوی لێ

بگرێتەوە یان لە كاتی برسێتی، خواردن یان پەڕین لە كاتی بەهێزیی شەهوەت یان نووستن لە كاتی زۆر خەوهاتن ڕێگری لێ بكات، تەنانەت كەسی خەمبار ئەگەر بە سكاڵا و گلەیی هەناوی بەتاڵ نەكاتەوە ئەوا خەم و پەژارە دەیكوژێت.

ئەمە بنچینە و ئەسڵە، ئەگەر ئەم زاهیدە تێی بگات دەزانێ كە سەرپێچیی ڕێبازی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و هاوەڵانی لە ڕووی نەقڵ و سەرپێچیی بابەتی لە ڕووی حیكمەتەوە كردووە.

لەسەر ئەمە قسەی ئەو كەسە پێویست نابێ كە دەڵێ: جا كوا خواردنی پاك و خاوێن؟ چونكە ئەگەر خواردن پاك و خاوێن نەبوو ئەوا وازهێنان لێی خۆپاراستن لە گوناه (ورع)ە، بەڵكوو ئێمە باس لەو خواردنە دەكەین كە لە بابەتی خۆپاراستندا زیانی نییە، ئەوەی من لێرەدا ڕوونم كردۆتەوە وەڵامی ئەو كەسەیە كە وتوویە: هەرگیز نەفسم ناگەیەنم بەو ئارەزووەی حەزی لێیە.

ڕووی دووەم: من لەو زاهیدە دەترسم لەوەی ئارەزووەكەی وەرگەڕێت بۆ وازهێنان، وای لێ بێت ئارەزوو بكات نەخوات، لەمەشدا نەفس فێڵ و ئۆینێكی شاراوە و ڕووپامایيەكی وردی هەیە، ئەگەر لە ڕیاكاری بۆ خەڵك سەلامەت بوو ئەوا دەردەكە لە ڕووی پەیوەست بوون بەم كردەوە و شانازیكردن پێوەی لە ناخەوە دێت، ئەمەش سەركێشی و هەڵەیە.

ڕەنگە هەندێ نەفام بڵێن: ئەمە ڕێگریكردنە لە خێر و لە زوهد! بەڵام وەها نییە، فەرموودەی ڕاست لە پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) هاتووە كە فەرموویەتی:

(( كـلُّ عمـلِ لـيس عليـه أمرنـا فهـو ردٌّ)) رواة البخـاري و مسـلم.. واتـه: هـەر كـار و كردەوەيەك بڕيار و فەرمانی ئێمەی لەسەر نەبێ ئەوا ڕەتكراوەيە..

نابێ بە خواپەرستيی (جورەيج) نە بە تەقوای (ذي الخويصرة) دەسخەڕۆ بين.

زاهيدەكان هەندێ ڕێگايان گرتۆتەبەر كە نە پێغەمبەر (صـلى الله عليـه وسـلم) و نـە هاوەڵانيشی پێيـدا نەچـوون وەكـوو: دەرخسـتنی ملكەچـی و خشـووعی لـە سـنوور بەدەر و، زيادەڕەويكردن لە زبركردنی پۆشاك و شتگەلێك كە خـەڵكی ڕەشـۆكی بـە باشی دەزانن و بۆ هەندێ كەس بۆتە مايەی ژيان و پەيداكردنی بژێوی، بـە هۆيـەوە دەستماچـكردن و ڕێـز و پاراسـتنی ماڵيـان دەسـت دەكەوێ! زۆربەشـيان نهێنـی و ئاشكرايان وەكوويەك نييە، لە تەنياييدا جۆرێك و لـەناو خەڵكيشـدا جـۆرێكی تـرن! (ئيبن سيرين) لەناو خەڵكدا قاقا پێدەكەنی بەڵام لە شەودا كە تـەنيا دەبـوو وەكـوو ئەوە وابوو خەڵكی گوندێكی كوشتبێت!

داوای زانسـتێكی سـوودبەخش لـە خـودای گـەورە دەكـەين، هـەر ئـەوە بنچـينە و ئەسڵە، هەر كاتێ مرۆڤ دەستی كەوت ئـەوا دەبێتـە هـۆی ناسـينی تـەواوی خـودای پەرسـتراو و بـەپێی شـەرع و ئـەوەی پێـی خۆشـە بـەرەو خزمـەتكردنی دەبزوێـت و ڕێگای دڵسۆزی بە خاوەنەكەی دەگرێتەبەر.

بنچينەی بنچينەكان زانستە و سوودبەخشترين زانستيش ڕوانين و وردبوونەوەيـە لـە ژياننامـەی پێغەمبـەر (صـلى الله عليـه وسـلم) و هـاوەڵانی ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُۖ فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقۡتَدِهۡۗ﴾ ( الأنعام: ٩٠) واتە: ئا ئەوانە خودا هيدايەتی داون و تۆش پـەيڕەوی لە ڕێنوێنی ئەوان بكە.

## ٣٧- جیهادی نەفس

لە جیهادی نەفس ڕامام و وردبوومەوە دیتم گەورەترین جیهادە و بینیم ژمارەیەك لە زانا و زاهیدەكان واتاكەی تێ ناگەن، چونكە هەیە نەفسی بەڕەهایی لە مافەكانی بێبەش كردووە، ئەوەش لە دوو ڕووەوە هەڵەیە:

یەكەمیان: ڕەنگە بە ڕێگریكردنی نەفس لە ئارەزوویەك شتێكی تری لەم ڕێگریكردنە زیاتر بداتێ وەكوو شتێكی ڕێپێدراو(مباح)ی لێ قەدەغە بكات و بەو قەدەغەكردنە ناوبانگ دەربكات و ئیتر نەفسیش بەو قەدەغەكردنە ڕازی بێت چونكە گۆڕیوەتییەوە بە ستایش و پیاهەڵدان. شاراوەتر لەوە ئەوەیە وا ببینێ كە بەم قەدەغەكردنە لەم كەسانە گەورەترە كە نەفسیان لەوە قەدەغە نەكردووە.

ئەمەش چەند وردەكارییەكی شاراوەن پێویستیان بە مووكێشی تێگەیشتن هەیە دەریانبێنێ.

دووەمیان: ئێمە ڕاسپێردراوین نەفس بپارێزین، لە هۆكارەكانی پاراستنیشی بڕیتییە لە مەیل و ئارەزووی بەرەو ئەو شتانەی زیندوو و ڕاوەستاوی دەكات، پێویستە ئەو شتانەی بدرێتێ كە ڕاوەستاوی دەكات، ئێمە وەكوو بریكار واین لە پاراستنیدا چونكە ئەو هی ئێمە نییە بەڵكوو سپاردەیە لە كنمان، بێبەشكردنی لە مافەكانی بەڕەهایی مەترسیدارە.

پاشــان ڕەنگــە تونــدکردنێك ببێتــە هــۆی خاوبوونــەوە و، لەوانەیــە بــە هــۆی تەسککردنەوە لەسەر نەفس، نەفسی لە دەستی ڕابکات و گرتنەوەی سەخت بێت.
بەڵکوو جیهادکردنی نەفس وەکوو جیهادی نەخۆشی کەسی ژیرە، زۆری لێ دەکات لەسەر خواردنی ئەو شتانەی پێی ناخۆشە بەڵام ئومێدی چاکبوونەوەی پێوەیە و، لە دەرمانی تاڵدا کەمێك شیرینی دەتوێنێتەوە و ئەو بڕە خواردنە دەخوات کە پزیشك بۆی دیاری دەکات و بە گوێی ئارەزووەکەی ناکات لەو خواردنەی حەزی لێیە کە ڕەنگە ببێتە هۆی برسێتی و ڕەنگە پاروویەك سەربکێشێ بۆ بێبەشبوونی لە چەندان پاروو.

ئیمانداری ژیریش وەهایە، جڵەوی نەفس بەرنادات و ڕێشمەی شل ناکات، بەڵکوو پەتەکە بە دەستەوە دەگرێت و هەندێ کات بۆی شل دەکات و لێی توونـد ناکات ماتووڵ هێشتا لەسەر ڕێی ڕاست لای نەداوە، ئەگەر دیتی لایداوە ئەوا بەنەرمی دەیگەڕێنێتەوە، ئەگەر سستی کرد و ملی نەدا ئەوا بەتوندوتیژی و وەکوو هاوسەر حیسابی بۆ دەکات کە کەم عەقڵ و لاوازە، لە کاتی گوێڕایەڵی نەکردنیدا ئامۆژگاری دەکات ئەگەر چاك نەبوو ئەوا پشتی تێ دەکات ئەگەر ڕاستەڕێ نەبوو ئەوا لێی دەدات، لە قامچیی تەنبێکردنیش هیچ شتێك لە قامچیی بڕیاری یەکلاکەرەوە باشتر نییە.

ئەمە موجاهەدەیە لە ڕووی کار و کردەوەوە. بەڵام لە ڕووی ئامۆژگاری و سەرزەنشتکردنی نەفسەوە ئەوا پێویستە لەسەر ئەو کەسەی کە دەیبینێ بەرەو خەڵك دەچێ و ڕەوشتی خراپ دەبێ ئەوا گەورەیی خودای بەدیهێنەری پێ

بناسێنێ و بڵێ: ئەدی ئەتوو ئەوە نیت کە خودا لەبارەتەوە فەرموویەتی: بە دەستی خۆم دروستم کردوویت و، فریشتەکانم بۆ بە سووژدە هێناوێت و، ڕازی بووە بە بوون بە جێنشینی لەسەر زەوییەکەی و، پێغەمبەرانی بۆ ناردوویت و، لێی قەرز کردوویت و لێی کڕیوی؟! ئەگەر دیتی هێشتا نەفسەکەی خۆبەلزانی دەکات با پێی بڵێ: ئایا تۆ هەر دڵۆپە ئاوێکی بێنرخ نیت بە شتێکی سادە دەمریت یان ئازارت پێ دەگات؟!

ئەگەر دیتی کەمتەرخەمە ئەوا مافی ئاغا بەسەر بەندەی پێ دەناسێنێ. ئەگەر لە کاردا سستی کرد ئەوا باسی گەورەیی پاداشتی بۆ دەکات. ئەگەر بەرەو لای هەوا و ئارەزوو مەیلا ئەوا بە گەورەیی تاوان دەیترسێنێ پاشان لە سزای بەرهەست وریای دەکاتەوە وەکوو ئایەتی خوای گەورە: ﴿قُلۡ أَرَءَيۡتُمۡ إِنۡ أَخَذَ ٱللَّهُ سَمۡعَكُمۡ وَأَبۡصَٰرَكُمۡ﴾(الأنعام: ٤٦) واتە: بڵێ: ئەگەرهاتوو خودا گوێ و چاوی لێ سەندنەوە، ئێوە چی دەکەن؟

هەروەها سزای مەعنەوی وەکوو: ﴿سَأَصۡرِفُ عَنۡ ءَايَٰتِيَ ٱلَّذِينَ يَتَكَبَّرُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ﴾ (الأعراف: ١٤٦) واتە: ئەوانەی لەسەر زەوی بەناهەق خۆبەلزانی دەکەن لە ئایەت و نیشانەکانی خۆم ڕوویان وەردەچەرخێنم..

ئەمە جیهادی قسەیە و ئەوەش جیهادی بە کردەوە.

## ٣٨- هۆکارەکانی گیرانەبوونی نزا

دیتم یەکێك لە بەڵایەکان ئەوەیە: ئیماندار نزا دەکات و گیرا نابێت، نزاکە دووبارە دەکاتەوە و ماوەیەکی زۆر دەخایەنێ و هیچ شوێنەوارێکی گیرابوون نابینێ!

پێویستە ئیماندار بزانێ کە ئەمە لەو بەڵایانەیە کە پێویستی بە ئارامگرتنە، ئەو وەسوەسە و دڵەخورپێیەی لە دواکەوتنی گیرابوونەکە بۆ نەفس چێ دەبێ نەخۆشییەکە پێویستی بە چارەسەرە.

ئەز شتێکی لەم چەشنەم تووش هات، ڕووداوێکم لێ قەوما، هەرچەندە دوعام کرد و کرد بەڵام هیچ گیرابوونێکم نەدیت، ئیتر بووە ڕۆژی ئیبلیس و دەستی کرد بە فرتوفێڵ و پیلانەکانی.

جارێك دەیگوت: بەخشندەیی خودا فراوانە و ڕەزیل و دەسنووقاویش نییە، ئەی سوودی دواکەوتنی گیرابوونەکە چییە؟! پێم وت: بێدەنگ بە ئەی نەفرەتلێکراو! پێویستم بە داکۆکی نییە و بە بریکارێتیی تۆش ڕازی نیم.

پاشان گەڕامەوە لای نەفسی خۆم و وتم: نەکەی بکەویتە ژێر کاریگەریی وەسوەسەکانی، ئەگەر لە دواکەوتنی گیرابوونی نزاکەت تەنها ئەوە هەبێ کە خودا

به دژایەتیکردنی ئیبلیسی دوژمن تاقیت بکاتەوە ئیتر ئەمە بەسە بۆ حیکمەت و دانایی.

وتی: ئەی بۆ لەم بەلایەدا گیرابوونی دوعاکەت دواکەوت؟

وتم: یەکەم: بە بەلگەوە سەلماوە کە خودای گەورە خاوەندار و مالیکە، خاوەنداریش مافی بەخشین و لێگرتنەوەی هەیە، ئیتر بوارێك نییە بۆ پەلپ و رەخنەلێگرتنی.

دووەم: حیکمەت و دانایی خودا بە بەلگەی یەکلاکەرەوە سەلماوە، رەنگە تۆ شتێك بە چاکە و بەرژەوەند ببینی بەلام حیکمەت و دانایی وای ناخوازێ، وەکوو ئەوەی پزیشك هەندێ شت دەکات کە لە رووالەتدا ئازارە بەلام مەبەست لێی چاکە و بەرژەوەندە و حیکمەتی ئەو کارە لە کەسەکان ون و نادیارە، ئیتر ئەمەش بەم شێوەیەیە.

سێیەم: رەنگە لە دواکەوتنی گیرابوونەکە سوود و بەرژەوەند هەبێ و لە پەلەکردنیش زیان، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ((لا يزال العبدُ في خيرٍ ما لم يستعجِل يقول دعوتُ فلم يستجب لي)) رواة أحمد في المسند..

واتە: هێشتا مرۆڤ لە خێردایە تا پەلەپەل نەکات و بڵێ: دوعام کرد بەلام گیرا نەبوو..

چوارەم: لەوانەیە گیرانەبوونی نزاکەت بە هۆی ئافەتێکی خۆتەوە بێت، رەنگە لە خۆراکت گومانێك هەبێ، یان لە کاتی دوعادا دڵت بێئاگا بێت، یان بە هۆی تاوانێك

كه بەڕاستی تەوبەت لێ نەكردبێت سزا بدرێیت بەوەی پێویستییەكەت جێبەجێ نەكرێ...ئیتر بەدوای ئەم هۆكارانەدا بگەڕێ بەڵكوو بگەیت بە ئامانج.

(ئیبراهیمی خەوواص) دەگێڕێتەوە و دەڵێ: بۆ لابردنی خراپەیەك(منكر) هاتمەدەر، سەگەكەم پێم وەڕی و نەیهێشت بڕۆم، گەڕامەوە و چوومە مزگەوت دوو ڕەكات نوێژم كرد، پاشان دووبارە دەرچووم، سەگەكە كلكەلەقێی بۆ كردم، ئیتر ڕۆیشتم و كارەكەم ئەنجام دا و جێبەجێ بوو..لەم بارەوە لێیان پرسی كە بۆچی ئەمە ڕوویدا؟! وتی: خۆم هەڵەیەكم هەبوو بۆیە سەگەكە ڕێگری لێ كردم، كاتێ گەڕامەوە و تەوبەم كرد ئیتر كێشەكە چارەسەر بوو هەروەك بینیتان.

پێنجەم: پێویستە لەوە بكۆڵیتەوە كە مەبەستت لەم داواكارییە چییە؟! ڕەنگە لە هاتنەدیدا زێدە گوناهێك یان دواكەوتن لە ئاستێكی خێردا هەبێ، بۆیە پێنەدانەكە باشتر بووە.

لە هەندێ پێشینان گێڕدراوەتەوە كە لە خودا دەپاڕایەوە غەزاكردنی بە نسیب بكات، بانگكەرێك بانگی كرد: ئەگەر تۆ غەزا بكەیت دیل دەكرێیت، ئەگەر دیلیش كرایت دەبیتە گاور.

شەشەم: ڕەنگە ئەوەی لەدەستت داوە بووبێتە هۆی ئەوەی پەنا ببەیتە بەر دەرگای خودا و لێی بپاڕێیتەوە، هاتنەدی داواكەشت ببێتە هۆی ئەوەی لە خودا بێئاگا بیت.

ئەمەش دیار و ئاشکرایە بە بەڵگەی ئەوەی کە ئەگەر ئەم بەڵایە نەبووایە لە بەردەم دەرگای خودا و پاڕانەوە لێی نەماندەبینیت.

خوای گەورە دەزانێ خەڵك بە چاکەی بەردەوام لێی بێئاگا دەبن بۆیە هەندێ جار بە چەند بەڵا و پێشهاتێك ئاگاداریان دەکاتەوە و بەرەو دەرگای خۆی پاڵیان دەنێ و ئەوانیش داوای فریاکەوتنی لێ دەکەن، ئەمەش یەکێکە لەو نیعمەتانەی کە لە پەردەی بەڵادا شاردراوەتەوە، بەڵای ڕاستەقینە ئەوەیە کە لە خودا بێئاگات دەکات بەڵام ئەو بەڵایەی دەتباتە بەردەم و بەر دەرگاکەی ئەوا جوانیی خۆتی تێدایە.

لە (یەحیای بەککاء)ی گێڕدراوەتەوە کە لە خەودا خودای بینیوە و پێی وتووە: ئەی پەروەرێنم! چەند لێت دەپاڕێمەوە و تۆش وەڵامم نادەیتەوە؟! خوداش پێی فەرمووە: ئەی یەحیا! من حەز دەکەم گوێم لە دەنگت بێت.

کە لەم شتانە وردبوویتەوە ئەو کات سەرقاڵ دەبیت بە شتێك کە سوودبەخشتر بێت لە دەسکەوتنی ئەوەی لە دەستت چووە جا لابردنی کەموکورتییەك بێت یان پۆزش لە هەڵەیەك، یان وەستان لەبەر دەرگای پەروەرێنی مەزن.

## ٣٩- دەرمانی بەڵا و ناخۆشییەكان

هەر كەسێك بەڵایەكی بەسەردا هات و ویستی لەسەر خۆی سووكی بكات و لایببات با زیاتر لەوەی هەیە بیهێنێتە بەرچاوی، ئەوكات سووك دەبێ، با خەیاڵی پاداشتەكەی و ئەندێشەی لەو گەورەتر بكات، ئیتر پێی ڕازی دەبێ و دەبینێ چاكە و خێری تێدایە، با سەرنج بگرێ لە خێرایی لاچوونی بەڵایەكەش چونكە گەر خەم و پەژارەی ناخۆشی نەبێ ئومێدی ساتەكانی ئاسوودەیی ناكرێ، با بشزانێ كە ماوەی مانەوەی ئەم بەڵایە وەكوو ماوەی مانەوەی میوانە و با لە هەموو ساتێكدا لە سۆراغی دابینكردنی پێویستییەكانی میوانەكەیدا بێت! ئای كە ماوەی مانەوەی چەندە بەخێرایی بەسەردەچێت! ئای ستایش و پیاهەڵدانەكانی لە كۆڕەكان و وەسفكردنی خانەخوێ بە بەخشندەیی چەند بەچێژە!

ئیمانداریش لە كاتی تەنگانەدا پێویستە بەم شێوەیە ڕەچاوی ساتەكان بكات و تێیدا سۆراغی حاڵوباری نەفس بكات و سەرنج بداتە ئەندامەكان لە ترسی ئەوەی نەوەك لە زمان وشەیەك یان لە دڵ ناڕەزاییەك دەرچێت، وەك ئەوەی سپێدەی پاداشت دەركەوت و شەوی بەڵا و ناخۆشی كۆتایی هات و ڕێبواری ڕێی تاریكاییش ستایش كرا، ئیتر لەگەڵ هەڵاتنی خۆردا گەیشتە خانەی سەلامەتی.

## ٤٠- گرینگیی پێکەوەبەستنی زانست و کردەوە

کاتێ ڕاوبۆچوونی نەفسی خۆم لەبارەی زانستەوە باش و جوان بینی کەوا دەیخاتە پێش و سەرووی هەموو شتێکەوە و پێی وایە ڕێبەرە و کاتی سەرقاڵبوون بە زانستی لە کاتی سوننەتەکان پێ باشترە و دەڵێ: بەهێزترین بەڵگەم لەبارەی فەزڵی زانست بەسەر سوننەتەکانەوە ئەوەیە: من زۆرێك لەوانەم بینی کە نوێژ و ڕۆژووی سوننەت مەشغوولی کردن لە زانست گرفتاری کەموکورتی و تانە و تەشەر بوون لە بنچینە و ئوسووڵدا، ئیتر بینیم خۆم لەم ئاراستەوە لەسەر ڕێی ئاسان و ڕاوبۆچوونی ڕاستدام..بەڵام بینیم نەفسم لەگەڵ وێنە و شێوەی سەرقاڵبوون بە زانستەوە وەستاوە، منیش تێم ڕاخوڕی: زانست چ سوودێکی پێ گەیاندیت؟! کوا ترس؟! کوا نیگەرانی؟! کوا وریایی؟!

ئەوە هەواڵ و دەنگوباسی پیاوچاکانت نەبیستووە کە لە خواپەرستی و کۆششەکانیان چۆن بوون؟!

ئەوە پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه وسلم) کە گەورەی هەمووانە ئەوەندە لە نوێژ و شەونوێژدا دەوەستا تا قاچەکانی هەڵدەئاوسا!

ئەی خەلیفە ئەبووبەکر (خودا لێی ڕازی بێت) هەمیشە چاو بە فرمێسك و زۆر گریان نەبوو؟

ئەی لە ڕوومەتی پێشەوا عومەردا(خودا لێی ڕازی بێت) بە هۆی زۆر گریانەوە دوو هێڵ نەبوو؟!

ئەی ئیمامی عوسمان (خودا لێی ڕازی بێت) لە ڕەکاتێکدا قورئانی خەتم نەدەکرد؟!

ئەی پێشەوا عەلی (خودا لێی ڕازی بێت) بە شەو ئەوەندە لە میحرابەکەیدا دەگریا تا ڕیشی بە فرمێسکەکانی تەڕ دەبوو و دەیوت: ئەی دونیا بڕۆ غەیری من هەڵخەڵەتێنە!

ئەی حەسەنی بەصری (خودا لێی ڕازی بێت)، لەسەر هێزی نیگەرانی دەژیا!

ئەی سەعیدی کوڕی موسەییەب، هەمیشە پەیوەستی مزگەوت بوو، لە ماوەی چل ساڵدا یەك نوێژی بەکۆمەڵی نەچوو!

ئەی ئەسوەدی کوڕی یەزید ئەوەندە بەڕۆژوو بوو تا زەرد هەڵگەڕا!

ئەی کچی ڕەبیعی کوڕی خەیثەم بە باوکی نەوت: ئەوە بۆچی دەبینم هەموو خەڵك دەخەون و تۆ ناخەوی؟

ئەویش وتی: باوکت لە سزای لەناکاوی شەو دەترسێت!

ئەی ئەبوو موسلیم خەولانی، قامچییەکی لە مزگەوت بە دیواردا هەڵدەواسی، ئەگەر لە خواپەرستی سارد ببووایەتەوە و سستی بکردایە خۆی تەنبێ دەکرد!

ئەی یەزیدی ڕەقاشی، چل ساڵ بەڕۆژوو بوو و دەشیگوت: هاوار و پەژارە بۆ خۆم! خواپەرستەکان پێشم کەوتن و منیش دابڕام!

ئەی مەنصووری کوڕی موعتەمیر، چل ساڵ بەڕۆژووبوو!

ئەی سوفیانی ثەوری لە ترسان لە کاتی گریاندا خوێن لە چاوانی دەهات!

ئەی ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم لە ترسان خوێن نەدەمیزت؟!

ئەی هەواڵی چوار ئیمامەکەت نەبیستووە (ئەبوو حەنیفە، مالیك، شافیعی، ئەحمەد) کە چ جۆرە زوهد و خواپەرستییەکیان هەبوو؟!

ئیتر وریای پەیوەستبوونی زانستی بێ کردار بە چونکە ئەوە حاڵی کەسە تەنبەڵە نەخۆشەکانە...

## ٤١- چرای زانست

ئەوەی وا دەکات زانست لە لای من فەزڵی زیاد بێت ئەوەیە: خەڵکانێك لەبەر خواپەرستی، لە زانست بێئاگا بوون ئیتر لە گەیشتن بە ڕاستییە داواکراوەکان وەستان.

لە هەندێ کەسانی پێشین گێڕدراوتەوە کە بە پیاوێکی وتووە: ئەی باوکی وەلید! ئەگەر تۆ باوکی وەلید بیت!

خۆی دەپارێزێ لەوەی بەو ناوە بانگی بکات و کوڕیشی نەبێ.

ئەگەر ئەم کەسە لە زانست ڕۆچووبایە دەیزانی کە پێغەمبەری خوا (صلی الله وسلم) ناسناوی باوکی یەحیای دایە صوهەیب، ناسناوی دایە منداڵێك و پێی فەرموو: ((یا أبا عُمَیرٍ! ما فعل النُّغَیرُ؟!)) ((ئەی باوکی عومەیر، بولبولۆکەکە چی کرد؟!)). بوخاری و موسلیم گێڕایتیانەوە.

زاهیدێك وتوویە: ڕۆژێك پێم وترا: لەم شیرە بخۆرەوە! وتم: ئەمە زیانم پێ دەگەیەنێ. پاشان دوای ماوەیەك لە کن کەعبە وەستام و وتم: خودایە! تۆ دەزانیت کە من بە قەد چاوترووکانێك هاوبەشم بۆ دانەناویت. بانگکارێك بانگی کردم: ڕۆژی شیرەکەش نا؟!

ئەگەر ئەمە ڕاست بێت ڕێی تێدەچێ وەکوو تەنبێکارییەك وابێ بۆی نەوەك جارێکی تر پشت بە هۆیەك ببەستێ و هۆخولقێن (کە خودایە) فەرامۆش بکات، وەگەرنا پێغەمبەری خودا (صلی الله علیە وسلم) وتوویە: ((هێشتا ئازاری خواردنەکەی خەیبەر دامدەگرێ تا ئەوەی ئێستا شاخوێنبەری بڕیم.)) بوخاری گێڕاویتییەوە..

هەروەها فەرموویەتی: ((هیچ ماڵ و داراییەك وەکوو ماڵ و دارایی ئەبووبەکر سوودی پێ نەگەیاندووم)) صەحیحە و ئەحمەد و ئیبن ماجە و ئیبن حیببان گێڕاویتیانەوە.

لە زاهیدەکان کەسانێك هەبوون پێیان وابوو کە پشتبەستن بە خودا (التوکل) واتە پچڕاندنی هەموو هۆکارەکان. ئەمەش نەزانی و بێ زانستییە، پێغەمبەری خودا (صلی الله علیە وسلم) (بۆ خۆحەشاردان) چۆتە نێو ئەشکەوت و ڕاوێژی بە پزیشك کردووە و زرێی پۆشیوە و خەندەقی لێداوە و لە پەنای (موطعەمی کوڕی عەدی) کە بێباوەڕ بوو چۆتە نێو مەککەوە، بە سەعدی فەرمووە: ((ئەگەر میراتگرەکانت بە دەوڵەمەندی بەجێ بهێڵێت بۆت باشترە وەك لەوەی هەژار و دەسکورت بەجێیان بهێڵیت و دەست لەبەر خەڵك پانکەنەوە.))..

ئیتر تەنها ڕاپەڕموون بە هۆکارەکان و لەبیرکردنی هۆخولقێن هەڵەیە..هەموو ئەم تاریکاییانە بە چرای زانست کۆتاییان پێ دەهێنرێ. ئەو کەسەی لە تاریکایی نەزانی یان بە کۆڵانی ئارەزوودا ڕۆیشت گومڕێ و سەرلێشێواو بوو.

## ٤٢- لەنێوان فریشتە و مرۆڤدا

هێشتا سەیرم بەوانە دێت کە پێیان وایە فریشتەکان لە پێغەمبەران و پیاوچاکان گەورەترن!

ئەگەر گەورەیی و فەزڵدانەکە بە شێوە و وێنە بێت ئەوا شێوەی مرۆڤ لە باڵدار سەیرترە. ئەگەر لەبەر ئەو پیس و پۆخڵییانەی پێوەیەتی واز لە شێوەی بنیادەم بێنین ئەوا شێوەکە ئادەمییانە نییە بەڵکوو تەنێ قاڵب و چوارچێوەیەکە! پاشان هەندێ شت کە بە عادەت ناشیرین و کرێتە بەڵام لە بنیادەمدا بە جوان دانراوە وەکوو: بۆنی دەمی ڕۆژووەوان و خوێنی شەهیدان و نووستن لە نوێژدا(هەموو ئەمانە لە فەرموودەدا هاتوون)، ئیتر بە شێوە و وێنەیەکی ئاوەدان مایەوە و حوکمەکەش بۆ واتایەکە بوو.

ئایا (فریشتەکان) ئاست و پلەیەکی وایان هەیە خودا بە هۆیەوە خۆشیانی بوێت یان فەزیلەتێکیان هەیە شانازییان پێوە بکات؟!

ئەوان کڕنووشیان بۆ ئێمە برد، ئەوەش لە فەزڵدانی ئێمە بەسەر ئەوان ئاشکرایە.

ئەگەر فەزیلەت بە زانست بێت ئەوا چیرۆکەکەت زانیوە ئەو ڕۆژەی وتیان: ﴿لَا عِلْمَ لَنَا ... قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ أَنۢبِئْهُم﴾ (البقرة: ٣٢ – ٣٣). واتە: زانست و زانیاریمان نییە... ئەی ئادەم پێیان بڵێ..

ئەگەر فریشتەکان بە حەقیقەت و ناوەڕۆکی خودیان فەزڵیان پێ درابێت ئەوا حەقیقەت و ناوەڕۆکی ڕۆحەکانی ئێمە لەو جۆرەیە و قورسایی باری جەستەشمان لەسەرە.

سوێند بە خوا ئەگەر پێویستیی سوار بە وشتر نەبووایە کە جاروبار بۆ ئالیکدانی دەوەستێ و لە کاتی ڕۆیشتندا لەگەڵیدا نەرم و لەسەرەخۆ دەبێ ئەوا ئیماندار کە بۆ حەج دەچێ بەر لە وادەی حەج بەخێرایی ڕووی لە مەککە و مینا دەکرد.

چەند سەیرە! ئایا فریشتەکان بە خواپەرستیی زۆر فەزڵیان پێ دەدرێ؟ خۆ هیچ ڕێگرییەك لەوان نییە.

ئایا ڕۆیشتنی ئاو یان هاتنەخوارەوەی بەخوڕ لە شوێنێکی لێژدا مایەی سەرسامییە؟! بەڵکوو سەرسامی ئەوەیە هەوراز و نشێو ببڕێ و بەسەر بەربەست و تەگەرەکاندا زاڵ بێت.

بەڵێ، ڕەنگە فریشتەکان چاوەڕێی سەرپێچی و بانگەشەی خوایەتییان لێ بکرێ لەبەرئەوەی توانای وردوخاشکردنی تاوێر و شەقکردنی زەوییان هەیە، بۆیە هەڕەشەیان لێ کراوە: ﴿وَمَن يَقُلْ مِنْهُمْ إِنِّىٓ إِلَٰهٌ مِّن دُونِهِۦ فَذَٰلِكَ نَجْزِيهِ جَهَنَّمَ﴾ (الأنبياء: ٢٩) واتە: هەر یەکێك لەوان بڵێ ئەز خودام ئەوا بە دۆزەخ سزای دەدەین..

بەلام دووربوونمان لە ماریفەتی ڕاستەقینە و لاوازیی یەقینمان بە نەهیکار و زاڵبوونی شەهوەتمان لەگەڵ بێئاگاییدا ئەوا پێویستی بە تێکۆشان و جیهادێکی گەورەتر لە جیهادی ئەوان هەیە.

سوێند بە خوا ئەگەر یەکێك لە فریشتە نزیکەکان گرفتاری ئەوە بوو کە ئێمە گرفتاری بووینە ئەوا توانای خۆڕاگرتنی نەدەبوو. هەر یەکێك لە ئێمە بەیانی دەکاتەوە و شەرع پێی دەڵێ: کار بۆ بژێوی خێزانەکەت بکە و لە پەیداکردنی بژێویشدا وریای (حەڵاڵ و حەرام) بە! مرۆڤ شتگەلێك بەسەریدا زاڵ بووە کە بە دەستی خۆی نییە وەکوو: خۆشویستنی کەسوکار و هاوسەر و منداڵ و پێویستیی جەستەی بە شتە پێویستەکان.

جارێك بە پێغەمبەر ئیبراهیم دەوترێ: کوڕەکەت بە دەستی خۆت سەربڕە و بەری دڵت بڕنە! پاشان بڕۆ ناو مەنجەنیق تا فڕێ بدرێیتە نێو ئاگرەوە!

کەڕەتێك بە مووسا دەوترێ: شەو و ڕۆژی مانگێك بەڕۆژوو بە.

پاشان بە کەسی تووڕە دەوترێ: تووڕەیی خۆت بخۆوە! بە چاوساغ و بینا دەوترێ: چاوت داگرە! بە کەسی زۆربڵێ دەوترێ: بێدەنگ بە! بە خەوخۆش دەوترێ: شەونوێژ بکە! بە کەسێك کە خۆشەویستەکەی مردووە دەوترێ: ئارام بگرە! بەو کەسەی جەستەی گرفتار بووە دەوترێ: سوپاسگوزار بە! بەو کەسەی لە جیهادە دەوترێ: دروست نییە ڕاکەیت! پاشان بزانە کە مردن بە سەختترین ناخۆشی دێت و ڕۆح لە جەستە جیادەبێتەوە، کاتێکیش هات دامەزراو بە! بشزانە

کە لە گۆڕدا دادەڕژێیت نابێ ناڕازی و تووڕە بیت چونکە ئەوەی ڕوودەدات قەدەرە! ئەگەر تووشی نەخۆشییەك بوویت گلەیی و سکاڵا مەبە لای خەڵك!

ئایا لەم شتانە فریشتەکان هیچ شتێکیان هەیە؟! ئایا جگە لە پەرستشێك کە هیچ بەرەنگاربوونەوەیەکی سروشت و بەرپەرچدانەوەی ئارەزووی تێدا نییە چیتریان هەیە؟! جگە لە پەرستشێکی ڕووکەشی لە چەمانەوە و کڕنووش و تەسبیحات چیتر هەیە؟! پەرستشی مەعنەویی ئەوان لەکوێی پەرستشی ئێمەیە؟!

پاشان زۆربەیان لە خزمەتی ئێمەدان: کردەوەنووسەکانمان، بەرگریکارەکانمان، ئەوانەی ژێربار کراون بۆ ناردنی با و باران، گەورەترین ئەرکیشیان داوای لێخۆشبوونکردنە بۆمان.

جا چۆن بە بێ هۆکارێکی دیار بەسەر ئێمەدا فەزڵ دەکرێن؟!

کەس وا گومان نەبات کە من پێم وایە خواپەرستیی فریشتەکان جۆرێك لە کەمتەرخەمی تێدایە چونکە ئەوان زۆر لە خودا دەترسن بە هۆی ئەوەی باش دەزانن کە خودای خولقێنەر زۆر مەزنە، بەڵام ئەرخەیانی ئەوەی هەڵەی نەکردووە نەفسی بەهێز دەکات و بێزار و هەراسانبوونی کەسی ڕۆچوو لە هەڵە ڕۆحی بەرەو بەرزبوونەوە هەڵدەکشێ.

ئیتر براکانم گەورەیی ڕێز و قەدرتان بزانن و ناوەڕۆك و زاتی خۆتان لەوە بپارێزن بە ڕیسوایی گوناهەکان پیسی بکەن، ئێوە بەسەر فریشتەکانەوە فەزڵتان پێ دراوە، وریابن گوناه و تاوانەکان نەتانهێنێتە ئاستی ئاژەڵان!

## ٤٣- بەدواى وردەكاريى هەندىٚ شتدا مەچوو

زۆرێك لە خەڵك و دونيايەك لە زانايانم بينى كە وازناهێنن لە گەڕان و لێكۆڵينەوە لە ئوسولّى ئەو شتانەى كە فەرمانيان پىٚ كراوە بە زانينى زۆرينەيان بىٚ لێكۆڵينەوە لە حەقيقەتيان وازبێنن! بۆ نموونە وەكوو ڕۆح، خوداى گەورە بە پێى ئەم ئايەتە شاردوويەتييەوە: ﴿وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنۡ أَمۡرِ رَبِّي﴾ (الإسراء: ٨٥) واتە: بڵێ: ڕۆح لە تايبەتمەنديى كارى خودايە و كەس هيچى لەبارەوە نازانىٚ.
كەچى قەناعەتيان نەهات و دەستيان كرد بە لێكۆڵينەوە لە ماهييەت و چييەتيى ڕۆح و دەستيشيان لە هيچ گيرنابىٚ و هيچكاميٚكيان بەڵگەيەكيان لەسەر ئەو قسانەى دەيكەن بۆ ساغ نابێتەوە!

هەروەها عەقڵيش بە هەمان شێوە بێگومان هەيە هەروەك ڕۆح بىٚ هيچ گومانێك بوونى هەيە، هەردووكيان بە شوێنەوارەكانيان دەناسرێن و پىٚ دەزانرێن نەك بە حەقيقەتى زاتيان.

ئەگەر كەسێك وتى: نهێنى چييە لە شاردنەوەى ئەم شتانە؟

دەڵێم: چونكە نەفس بەردەوام لە حاڵەتێكەوە بۆ حاڵەتێكى تر بەرز دەبێتەوە، ئەگەر ئاگادارى ئەم شتانە بوو ئەوا بەرەو خولْقێنەريشى بەرز دەبێتەوە، بۆيە

شاردنەوەی شتەکانی نزمتر لە خولقێنەر زیاتر گەورەکردنی ئەمە، چونکە ئەگەر هەندێ لە مەخلووقاتەکانی بەکورتی بناسرێن و بزانرێن ئەوا ئەو مەزنتر و بەرزترە..

ئەگەر کەسێك پرسی: هەورەتریشقە و بروسکە چین؟ زەویلەرزە چییە؟ دەڵێین: شتێکی بێزارکەرە و تەواو!

نهێنی لە شاردنەوەی ئەمە ئەوەیە کە ئەگەر ڕاستییەکان ئاشکرا کران ئەوا ئەندازەی بەگەورەزانینی خولقێنەر کەم دەبێتەوە..(بەڵام ئێستا زانست نهێنیی هەورەتریشقە و زەویلەرزە و شتی تریشی دۆزیوەتەوە و نەشبۆتە هۆی بە بچووکزانینی خودا، بەڵکوو بەپێچەوانەوە هەموو دۆزینەوەیەکی زانستی زیاتر گەورەیی و مەزنیی خودا دەسەلمێنێ... وەرگێڕ)..

هەر کەسێ سەرنجی ئەم بەشە بدات دەزانێ کە بەشێکی گرینگ و بایەخدارە..

ئەگەر لە مەخلووقاتدا چەسپا ئەوا خولقێنەر مەزنتر و باڵاترە.

پێویستە بۆ سەلماندنی خودا لەسەر بەڵگەی بوونی بوەستین، پاشان بەڵگە بهێنرێتەوە لەسەر ناردنی پێغەمبەران، پاشان وەسفەکانی خودا لە کتێب و پێغەمبەرەکانی وەربگیرێن و لەمە زیاتر نەکرێ، زۆر کەس بە ڕاوبۆچوونی خۆیان بەدوای سیفەتەکانی خودا گەڕان و ئەوەش بووە مایەی نەگبەتی بۆیان.

ئەگەر وتمان: ئەو هەیە و مەوجوودە و لە قسەکانیڕا زانیمان کە بیسەر و بینا و زیندوو و بەتوانایە، ئیتر بۆ سیفەتەکانی ئەمەمان بەسە و لە شتی تر ڕۆناچین. هەروەها دەڵێین: قسەبێژە و قورئانیش قسەی وییە و لەمە زیاتر ناڵێین.

پێشینان نەیانوتووە: خوێندنەوە و خوێندراو، نەشیانوتووە: زاتی خودا لەسەر عەرش جێگیر بوو، نەشیانوتووە: زاتی خودا دێتە خوارەوە..هەر ئەوەیان وتووە کە لە قورئان و سوننەتدا هاتووە بێ زیادە خستنەسەر.

ئەم وتانە نموونە بوون، سەرجەم سیفەتەکانی لەسەر پێوانە بکە لە مەسەلەی (تعطیل) و (تشبیه) ساغ و سەلامەت و ڕزگار دەبیت.

## ٤٤- حیکمەتی خودا

دیتم زۆربەی خەڵك لە بوونیاندا وەکوو نەبوو وان، هەیانە خولقێنەر ناناسیێ، هەیانە بەپێی هەستی خۆی لە مێشکیدا جێگیری دەکات، هەیانە نازانێ مەبەست لە تەکلیف چییە؟!

دەبینی ئەوانەی خۆیان بە زوهد ڕەنگرێژ کردووە بەردەوامن لە هەستان و دانیشتن (نوێژان دەکەن) و واز لە ئارەزووەکان دێنن بەڵام ئەوە لەبیردەکەن کە چەند هۆگری ئارەزووی ناووبانگ و دەستماچکردن بوونە؟! ئەگەر ئەمە بە یەکێکیان بوترێ دەڵێ: ئەوە بە کەسێکی وەکوو من ئەو قسانە دەوترێ؟! لە فلانی لادەریشەوە؟!

ئەوانە لە مەبەستەکە تێ ناگەن و هەروەها زۆرێك لە زانایانیش لە سووك سەرنجدانی غەیری خۆیان و خۆبەلزانی لە دەروونیاندا.

سەیرم پێ هات! ئەمانە چۆن بە کەڵکی هاوسێیی خودا و دانیشتووانی بەهەشت دێن؟!

وای بۆچووم کە سوودی بوونی ئەمانە لە دونیا هاوشانی سوودی چوونە بەهەشتیانە، ئەمانە لە دونیا هەیانە بۆ پەند لێ وەرگرتن شیاون تا بە هۆیانەوە

کەسی خواناس بزانێ خودا چ نیعمەتێکی لەگەڵ کردووە لەوەی ئەوەی بۆ وی کەشف کردووە و لەوانی شاردۆتەوە، یان شوێنکەوتەیەك کە بەهۆیەوە ئاوەدانی تەواو دەبێ و ژیان و گوزەران ڕاستەڕێ دەبێ، ئیتر ژیان بەم جیاوازییە دوورەوە دەکەوێتە سەر سکە و پاشانیش لەنێوان تایبەتەکاندا جیاوازی هەیە.

خواناس کاتی نییە بۆ تێکەڵبوون لەگەڵ ڕوواڵەتپەرستان، زاهید وەکوو شوانێکی لاڵ و زانا وەکوو پەروەردیاری منداڵان و خواناس وەکوو تەلقیندەری حیکمەت وایە.

ئەگەر نەفتەوان و پاسەوان و ئاگرکەرەوەی ئاگردانی پاشا نەبووایە پاشا ژیانی ساز نەدەبوو.

لە تەواویی ژیانی خواناس ئەوەیە ئەوانە بەپێی پێویست بەکاربێنێ، کاتێ گەیشتنە لای بەربەستەکەیان نەهێڵێ...

ئەگەر یەکێك وتی: وادانێ ئەمە بۆ دونیا دروستە و دەگونجێ، ئەی لە بەهەشتدا چۆن دەبێ؟

وەڵام: هۆگری و دڵخۆشی بە دراوسێ داواکراوە و بینینی کەسێکی ناتەواو بۆ کەسێکی بێ کەموکورتی ئەوپەڕی چێژە، ئیتر هەموو شتێك سەرچاوەی خۆی هەیە.

هەر کەسێك سەرنج بداتە ئەوەی ئامازەم بۆی کرد ئەوا هێمای وتەکەم وا دەکات پێویست بە درێژکردنەوەی ڕوونکردنەوە نەبێ.

## ٤٥- ڕووكردنه خوا

كاتێ سەرنجم دایە ڕێكخستنی دابینكردنی ڕۆزیم لە لایەن خوداوە بە ژێربارکردنی هەور و نەرمەباران و تۆوی ژێر خاك كە وەكوو مردوو بۆگەنی کردووە چاوەڕێی فووی ژیانە، كە ئەو فووە دەیگرێتەوە دەهەژێ و سەوز دەبێ، ئەگەریش ئاوی لێ بڕا دەستی داوا درێژ دەكات و ئاو دەخوازێ و سەری كز و كەچ دەكات و بەرگی گۆڕان دەپۆشێ، چەشنی من ئاتاجی بە گەرمایی خۆر و ساردایی ئاو و نیانی نەرمەبا و پەروەردەی زەوییە!

پاك و بێگەردی بۆ ئەو خودێیەی پیشانم دەدات كە پەروەردەبوونی من لە زەوییەوە چۆنە!؟

ئەی ئەو نەفسەی لە هەندێ لە حیكمەتەكانی خودا ئاگاداریت! سوێند بە خودا زۆر ناشیرینە بۆت ڕوو لە غەیری وی بكەیت. پاشان سەیروسەمەرەكە ئەوەیە كە چۆن ڕوو دەكەیتە هەژار و داماوێكی وەكوو خۆت كە زمانحاڵی بانگم دەكات: منیش وەكوو تۆ گرفتارم!

كەواتە بگەڕێوە بۆ بنچینەی یەكەم و لە هۆخوڵقێن بخوازە. خۆشی بۆ تۆ ئەگەر بیناسیت! ناسینی ئەو موڵكی دونیا و ئاخیرەتە.

## ٤٦- هەندێ کات گۆشەگیری پێویستە

ئەمن لە سەرەتای لاوێتیمدا بە بەردەوام بوون لەسەر ڕۆژووگرتن و نوێژکردن گرتنەبەری ڕێی زاهیدەکان خرایە دڵمەوە و تەنیایی و خەڵوەتم لە لا خۆشەویست کرا، دڵێکی پاکم هەبوو، چاوی دەرکپێکردن و بەسیرەتم زۆر تیژ بوو، لەسەر بەفیڕۆچوونی ساتێکی بێ تاعەت و خواپەرستی خەفەتی دەخوارد و لە قۆستنەوەی خواپەرستییەکاندا پێشبڕکێی لەگەڵ کاتدا دەکرد، جۆرێك لە هۆگری و شیرینی و لاڵانەوەم هەبوو. کار بەوە گەیشت هەندێ لە کاربەدەستان قسەکانمیان پێ جوان بوو، ئەمە مەیلی بەرەو لای وەرسوڕاندم و ئەو شیرناییەم لەدەست دا.

پاشان یەکێکی تر هەوڵی ڕاکێشانی دام، ئەمنیش لە ترسی شوبهە و گومان خۆم لە تێکەڵبوون و خواردنی دەپاراست، حاڵوباری من نزیك بوو. پاشان تەئویل و لێکدانەوە هات، ئیتر لەوەی ڕێپێدراوە شلڕەویم کرد، بەم هۆیەوە ئەو ڕووناکی و ئارامییەی هەستم پێ دەکرد نەما و وای لێ هات تێکەڵاوبوون دەبووە هۆی تاریکایی لە دڵدا تا ئەوەی ڕووناکی بەتەواوی نەما.

سۆز و جۆشم بۆ ئەوەی لە دەستم چووە دەبووە هۆی بێزاربوونی ئەهلی مەجلیس، ئەوان تەوبەیان دەکرد و چاك دەبوون و منیش لەو نێوەندەدا پەرپووت دەردەچووم!

هـاوار و ناڵـەم لـە دەسـت نەخۆشـییەکەم زۆر بـوو و لـە چارەسـەرکردنی خـۆم دەستەوسان بووم، پەنام بردە بەر گڵکۆی پیاوچاکان و لـە خـودا پاڕامـەوە چاکم بکاتەوە، ئیتر ئەگەرچـی خۆشـم پـێم خـۆش نـەبوو بـەڵام لوتـف و بـەزەیی خـوای گەورەم بـەرەو خـەڵوەت و تـەنهایی ڕاکێشـام و دوای دوورکەوتنـەوە لـێم دڵمـی بـۆ گەڕاندمەوە و کەموکورتییەکانی خۆمی پێ نیشاندام، ئـیتر لـە نەخۆشـیی بێئاگـایی بێدار بوومەوە و لە لاڵانەوەی خەڵوەتمدا وتم: گەورەم چۆن دەتوانم سوپاست بکـەم و بە چ زمانێك ستایشـت بکـەم کـە لەسـەر بێئاگـابوونم نـەتگرتم و لـە خـەوی قـووڵ بێدارت کردمەوە و وێڕای پێناخۆشبوونی سروشتم کەچی حاڵت چاك کردم؟!

چەندە قازانجم کرد لەوەی لێم سەندرایەوە ئەگـەر بەرهەمەکـەی پـەنابردن بێـت بـۆ تـۆ! چـەندە کـۆك و سـەرحاڵم ئەگـەر بەرهەمەکـەی ڕووکردنـە خـەڵوەتکردنی تـۆ بێت! چـەندە دەوڵەمەنـدم ئەگـەر ئاتـاجی تـۆ بم! چـەندە ئاسـوودەم کـە لـە خـەڵك دەوروبەرت چۆڵ کردووم!

ئاخ و ئۆف بۆ زەمانێك کە لە غەیری خزمەتی تۆدا بەفیڕۆ چوو! مخابن بۆ کاتێك لـە غەیری گوێڕایەڵیی تۆ ڕۆیشت!

پێشتر کە بەرەبەیان لە خەو بەئاگا دەهاتم خەوی درێژی شەو ئازاری نـەدەدام، کـە ڕۆژیـش ئـاوا دەبـوو لەدەسچـوونی ئـەم ڕۆژە نەیدەئێشـاندم، نەمـدەزانی کـە ئـەم بێهەسـتییەم بـە هـۆی بـەهێزیی نەخۆشـییەکەیە... ئێسـتا کـە شـەماڵی سـاغڵەمی هـەڵیکردووە ئینجـا هەسـتم بـە ئـازار کـردووە و دەروونسـاغیم دۆزیوەتەوە..ئـەی خودای نیعمەت گەورە! ساغڵەمییەکەم بۆ تەواوکە!

داخ و ئۆف لە مەستییەك كە ئەندازەی بەدڕەفتارییەكەی نەزانرا تەنها لە كاتی بێداربوونەوە نەبێ!

ئەوەم هەڵوەشاندەوە كە دوورینەوەی دژوارە، مخابن بۆ كاڵایەك كە لەدەست چوو، بۆ كەشتییەوانێك كە ماوەیەك ماندوو بوو لە هەڵكشان و زاڵبوون بەسەر شەپۆلێكی هەوراز پاشان خەو بەسەریدا زاڵ بوو و گەڕایەوە شوێنی یەكەمی.

ئەی ئەوەی هۆشداریی من لە تێكەڵوپێكەڵكردن دەخوێنێتەوە! ئەز – ئەگەرچی بەكردەوە ناپاكییم لە نەفسی خۆم كرد – بەم وتەیەم دڵسۆزانە ئامۆژگاری براكانم دەكەم:

براكانم: وریابن لە شلڕەوی كردن لەو شتەی خراپی و بەدییەكەی جێی دڵنیایی نییە چونكە شەیتان یەكەم جار شتی ڕێپێدراو(مباح) جوان دەكات پاشان بەرەو گوناه پەلكێشت دەكات، سەرنجی سەرەنجام بدەن و لە حاڵەكە تێ بگەن! ڕەنگە ئامانج و مەبەستەكەتان باش پیشان بدات بەڵام لە ڕێگای چوون بۆ ئەو ئامانجە جۆرێك سەرپێچی هەبێ!

لەو حاڵەدا ئەوە بەسە پەند لە باوەئادەمتان وەربگرن: ﴿هَلۡ أَدُلُّكَ عَلَىٰ شَجَرَةِ ٱلۡخُلۡدِ وَمُلۡكٖ لَّا يَبۡلَىٰ ١٢٠﴾ (طه: ١٢٠) واتە: شەیتان بە ئادەمی وت: درەختی نەمری و موڵكی نەفەوتاوت پێ نیشاندەم؟!

ئادەم سەرنجی دایە ئامانجەكە – كە نەمرییە – بەڵام لە ڕێگاكە سەرچییخ چوو.

ئەمە سەیروسەمەرەترین تەڵەکانی ئیبلیسە کە زانایانی پێ ڕاو دەکات، تەئویل بۆ سەرەنجامی بەرژەوەندەکان دەکەن ئیتر زیانی خراپییەکان زوو دێننە بەرەوە !

بۆ نموونە بە زانایەك بڵێیت: بچۆ لای ئەو ستەمکارە و شەفاعەت بۆ ستەملێکراوێك بکە ! ئەویش کە دەچێتە لای ستەمکارەکە شتی بەد و خراپ دەبینێ و دینی دەهەژێ و ڕەنگە بکەوێتە نێو تەڵەیەکەوە بە هۆیەوە لەو ستەمکارە ستەمکارتر دەربچێت !

هەر کەسێك متمانەی بە دینەکەی نەبوو با وریای تەڵەکان بێت چونکە ون و نادیارن.

بۆ کەسی ترسنۆك گۆشەگیری سەلامەتترە بەتایبەتی لە سەردەمێك کە تێیدا چاکە مردووە و خراپە زیندووە و ئەهلی زانست هیچ کاریگەرییەکیان لە کن دەسەڵاتداران نەماوە، هەر کەسێ بچێتە لایان تووشی نارەوایی دەبێ و ناتوانێ لەوەی تێیدان دەریان بێنێ.

پاشان هەر کەسێ سەرنج بداتە حاڵی ئەو زانایانەی لە هەرێمەکان کار بۆ کاربەدەستان دەکەن دەبینێ لە سوودی زانست دابڕاون، وەکوو پۆلیسیان لێ هاتووە.

شتێ نەماوەتەوە جگە لە دابڕان لە خەڵك و پشتکردن لە هەموو لێکدانەوەیەکی بەد لەبارەی تێکەڵاوبوون، ئەگەر تەنها سوود بە خۆم بگەیەنم بۆم باشترە لەوەی سوود بە غەیری خۆم بگەیەنم و زیانم پێ بگات.

ئاگاداربن، دیسان ئاگاداربن له تەئویل و لێکدانەوەی هەڵخەڵەتێنەر و فەتوای بەد و گەند! ئارام بگرن و ئارام بگرن لەسەر ئەو شتانەی گۆشەگیری پێویست دەکەن! ئەگەر تەنها لەگەڵ خودای خۆت بیت ئەوا دەرگای ناسینیت بۆ دەکاتەوە و هەموو دژوارییەك سووك و سانا دەبێت و هەموو تاڵێك شیرین دەبێت و هەموو گرێکوێرەیەك دەکرێتەوە و هەموو داخوازییەکانت وەدەست دێنی.

خوای گەورە بە فەزڵی خۆی یاریدەدەرە و هەموو هێز و توانایەکیش هەر بە هۆی ئەو و لەوەوەیە.

## ٤٧- لێكدانەوەی بەد

لە نەفسمدا سەرنجم دایە تـەئویلێك لـە شـتێكی ڕێپێـدراو (مبـاح)دا كـە بـە هۆیـەوە شتێك لە دونیا وەدەسـت بێـنم بـەڵام لـە لایـەنی خۆپـارێزی (الـورع)ەوە لێـڵ بـوو، سەرەتا دیتم شیری دینی دۆشی و ئیتر شیرناییی مامەڵە بۆ خـودا ڕۆیشـت، پاشـان دونیاكەش نەما، ئیتر هەردوو حاڵەكەم لەدەستدا (شیرناییی ئیمان و دونیا) !

بە خۆم وت: نموونەی تۆ وەكوو نموونەی كاربەدەستێكی ستەمكارە كـە بـە نـاڕەوا ماڵ و داراییەكی زۆری بەسەریەكەوە ناوە، پاشان دەستی بەسـەردا گیرا و ئـەوەی كۆیكردبـۆوە لێـی سـەندرایەوە و زیـاتر لـەوە ناچـاری شـتێكیش كـرا كـە كـۆی نەكردبۆوە.

وریـابن وریـابن لــە بەدلێكدانــەوە و تــەئویلی خــراپ، خــودا فێڵــی لێ نــاكرێ و هەڵناخەڵەتێندرێ و ئەوەی لە گەنجینەیدایە بە سەرپێچیكردنی دەست ناخرێ.

# ٤٨- کارکردن بە پێی توانا

نەفسم دیت هەرکاتێ بیری ساف بوو یان پەندی لە ڕابردوو وەرگرت یان سەردانی گڵکۆی پیاوچاکانی کرد ئەوا هەوڵ و هیممەتی لە داوای گۆشەگیری و ڕووکردنە خودا دەبزوا..ڕۆژێك لەوبارەوە قسەی لەگەڵ کردم و منیش پێم وت:

پێم بڵێ: مەبەست و داواکاریت چییە؟ ئایا پێت وایە دەخوازیت لێم لە چۆڵەوانییەك نیشتەجێ بم هاودەمێکی لێ نەبێ و نوێژی بەکۆمەڵم لە دەست بچێت و لەبەرئەوەی کەس نییە فێری زانستی بکەم ئەوەی دەشیزانم لەبیرم بچێتەوە و ئەو خواردنە ناخۆشە بخۆم کە پێی ڕانەهاتووم و لە ماوەی دوو ڕۆژدا لاواز و بێهێز و نەخۆش بکەوم؟! جلوبەرگی زبری وەها لەبەرکەم کە بەرگەی ناگرم، لەبەر خەمی بارم نەزانم من کێم و مەشغوول بم لە داواکردنی نەوەگەلێك کە دوای من خواپەرستی بکەن لەگەڵ ئەوەی توانای داواکردنی منداڵم هەیە؟!

سوێند بە خودا ئەگەر هاوڕات بم ئەوا ئەو زانستەی تەمەنی خۆم لەپێناویدا خەرج کردووە هیچ سوودێکی پێ نەگەیاندووم! (ئەی نەفس) ئێستا بە زانست و زانیاری هەڵەکانت پێ دەناسێنم:

بزانە کە جەستە وەکوو باربەر و سوارییەك وایە، سوارییش ئەگەر لەگەڵیدا باش و نەرم نەبیت ئەوا کەسی سەر پشتی ناگەیەنێتە مەنزڵ، مەبەستم لە نەرمونیانی،

هەوەس و ئارەزووی زۆر نییە بەڵکوو مەبەستم بڕی پێویستە کە پێویستی جەستە دابین دەکات، ئەوکات بیر ساف و ئاوەز ساغ و زەین بەهێز دەبێ.

نابینی کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە فەرموودەیەکدا چۆن باسی کاریگەریی ڕێگرییەکانی بەردەم زەینسافی دەکات و دەفەرموێ: ((لا يَقضي القاضي بين اثنين وهو غضبانُ)) رواه البخاري و مسلم، واتە: نابێ دادوەر لە کاتی تووڕەییدا داوەری لەنێوان دوو کەسدا بکات..زانایان برسێتیشیان لەسەر ئەمە قیاس کردووە، هەروەها تەنگاویی گەورە و بچووکیش بە هەمان شێوە! ئایا سروشت و خووی ناخی مرۆڤ هەر وەکوو سەگێك نییە کە نانخۆرێك سەرقاڵ دەکات کە ئەگەر پارچە خواردنێکی بۆ فڕێدا کە پێوەی مەشغوول بێت وازی لێ دێنێ بەئارامی و خۆشی خواردنەکەی بخوات؟!

بەڵام گۆشەگیری و دوورەپەرێزی لە خراپە نەك لە چاکە، ئەگەر بۆت کاریگەریی خێری تێدا بووایە ئەوا لە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و هاوەڵەکانی دەگێڕدرایەوە.

بەڵام ئەمە دوور و بێسوودە! زانیوتە کە خەڵکێك کەمخۆری و وشکیی بەردەوام بەرەو گۆڕانی بیری بردن و تێکەڵەی ڕەشی لەسەر بەهێز کردن، ئیتر لە خەڵك دابڕان و دوورکەوتنەوە! هەیانە ڕۆژێك و دووان و سیان نان ناخوات و پێی وایە ئەوە لە لوتفی خودایە! کاتێك بە خۆی دەزانێ تووشی بەدهەرسی بووە! هەیانە تێکەڵوپێکەڵی بەرەو دیتنی تارماییان دەبات و وا دەزانێ فریشتەن!

بۆ خاتری خودا بایەخ بە زانست و ئاوەز بدەن، ڕووناکیی ئاوەز نابێ بکوژێنرێتەوە و زانستیش ڕەوا نییە لە گرینگی کەم بکرێتەوە، ئەگەر ئەم دووانە پارێزران ئەوا لە بەلا و ناخۆشییەکانی دونیا پارێزراوین و شتی ئازاردەر دوور دەخەنەوە و چاکە و بەرژەوەند دێنن و یاساکانی خواردن و خواردنەوە و تێکەڵبوون ڕاست و ڕێك دەبن.

نەفس پێی وتم: ئەرکێکم بۆ دیاری بکە و وام لە قەڵەم بدە نەخۆشێکم خواردنەوەیەکت بۆ نووسیوە.

پێم وت: زانستم پێ نیشان دایت کە پزیشکێکە بەردەوام لەگەڵتدایە، هەموو ساتێك بۆ هەر نەخۆشییەك دەرمانێکی گونجاو دەخاتەڕوو.

بەکورتی و پوختی: پێویستە لە قسە و بیرکردنەوە و ڕوانین و هەموو ئەندامەکان تەقوا و ترسی خودا هاوڕێت بێت، لە خواردندا بەدوای حەڵاڵ بیت، لە هەموو ساتێکدا چی چاکەیە ئەو بکەیت و باشترین هەڵبژێریت، لەو شتانە دوورکەویتەوە کە دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی سوود و قازانج یان کەوتنەوەی زیان، هیچ کارێك مەکە بەبێ پێشخستنی نیاز. وەها خۆت بۆ مردن ئامادەکە وەکوو ئەوەی لەسەر سەرت وەستابێ و چیت بۆی هەیە لە هەر کاتێك بێت؟! زیان بە سوود و بەرژەوەندەکانی جەستەت مەگەیەنە بەڵکوو بۆی هەڵگرە و پاشەکەوتیکە و بەپێی یاسای ڕاست و دروست نەك بەپێی ئارەزوو بیدەرێ، چونکە چاککردنی جەستە هۆیەکە بۆ چاککردنی دین! واز لەو هەڵەشە و ئارەزووبازییە بێنە کە نەزانی پێت نیشان دەدات نەك زانست و، نەفس پێت دەڵێ: فلان سرکە و سەوزی دەخوات! فلان شەو ناخەوێ!

بەپێی توانا و هێزی جەستەت بار بخەرە کۆڵت چوون چوارپێش گەر ڕوویکردە ڕووبار یان چەمێك لێیدرا بۆ ئەوەی بازدات ئەوا بازنادات تا خۆت هەڵنەسەنگێنیٚ ئەگەر زانی هێزی قەڵەمبازی هەیە ئەوا باز دەدات، ئەگەریش زانی ناتوانیٚ نایکات ئەگەر بشکوژرێت، هەموو جەستەکان لە تواناداربووندا وەکیەك نین، هەندیٚ کەس لە سەرەتاوە ئەوەندە باری خۆیان گران کرد و شتگەلێکیان بەسەر خۆیاندا سەپاند کە بووە هۆی تووشبوونیان بە نەخۆشیگەلێکی ئەوتۆ کە لە خێر و چاکەی پچڕاندن و بە ڕوودانیان دڵیان ناڕازی بوو، کەواتە دەست بە زانستەوە بگرە چونکە بۆ هەموو دەردێك شیفایە.

## ٤٩- گومانگەلێك لەبارەی ناو و سیفەتەكانی خوداوە

سەیرم دێ لە خەڵكانێك كە بانگەشەی زانست دەكەن و مەیلی لێكچواندن (تشبیە) یان هەیە بەوەی ئەو فەرموودانەی لەوبارەوە هاتوون بە ڕووالەت وەردەگرن، گەربێتوو چۆن هاتووە ئەوهایان وەرگرتبووایە ئەوا سەلامەت دەبوون، چونكە هەر كەسێ ئەوەی هاتووە وەك خۆی وەریگرێ بێ هیچ پەلپ و یەخەگیربوونێك ئەوا هیچی نەوتووە، نە چاكەی بۆ هەیە و نە خراپەی لەسەرە.

بەلام خەڵكانێك لەبەر دەستكورتییان لە بواری زانستەكان پێیان وابوو كە لێكدانەوەی قسە لەسەر غەیری ڕووالەتی خۆی جۆرێكە لە پەكخستن(تعطیل)، ئەگەر لە فراوانیی زمان گەیشتبان ئەوا وایان گومان نەدەبرد، ئەوان وەكوو ئەو ڕووداوەیان لێ هات كە كاتێ خەنسائی شاعیر لە شیعرێكدا ستایشی حەججاجی كرد و وتی:

إذا هَبَطَ الحجّاجُ أرضًا مريضةً تَتَبَّعَ أقصى دائِها فَشَفاها

شفاها من الداءِ العُضالِ الذي بها غلامٌ إذا هَزَّ القناةَ شَفاها

حەججاج بە نووسەرەكەی وت: زمانی ببڕە! نووسەرە هێرەكە مووسی هێنا زمانی ببڕێ، شاعیرەكە گوتی: مالوێران! حەججاج وتوویە: بەخششی باشی بدەرێ! پاشان شاعیرەكە چووە لای حەججاج و پێی وت: بەخوا نزیك بوو زمانم ببڕێ!

هەروەها ڕواڵەتبینەکان (الظاهرية) ئەوانەی ملکەچ نەبوون، چونکە هەر کەسێك ئایەت و فەرموودەکانی خوێندەوە و لەوان زیاتری نەکرد گلەیی لێ ناکەم، ئەمەش ڕێگای پیاوچاکانی پێشینە.

بەڵام ئەوەی وتوویە: فەرموودە وا دەخوازێ و بەم شێوەیە لێك دەدرێتەوە وەکوو ئەوەیە بڵێ: خودا بە زاتی خۆی لەسەر عەرش جێگیر بوو و، بە زاتی خۆی دادەبەزێتە ئاسمانی دونیا، ئەمە زیادەیەکە ئەوەی دەیڵێ لە هەستەوە تێی گەیشتووە نەك لە نەقڵ.

سەیرم بە پیاوەکی ئەندەلووسی دێت کە ناوی (ئیبن عەبدولبەڕ)ە، کتێبێکی بە ناوی ((التمهيد)) داناوە تێیدا باسی فەرموودەی هاتنەخوارەوە بۆ ئاسمانی دونیا کردووە و وتوویەتی: ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە خودا لەسەر عەرشە، چونکە گەر وا نەبێ ئەوا وشەی (ينزل — دێتەخوارێ) کە فەرموودەی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم) هیچ واتایەکی نەدەبوو.

ئەمە قسەی کەسێکە کە لە بەرانبەر ناسینی خوادا نەزانە چونکە ئەمە لە هەستی خۆیدا ئەوەی لەبارەی دابەزین و هاتنەخوارەوە دەیزانێ قەرزی کردووە و سیفەتی خودای لەسەر پێوانە کردووە.

ئەمانە لەکوێ و شوێنکەوتنی فەرموودە لەکوێ؟!

بە ناشیرینتر لە تەئویلکاران قسەیان کردووە و پاشان ڕەخنەیان لە (المتكلّمين) گرتووە.

((لێکۆڵەری ئەم کتێبە ڕەخنەی لە دانەر گرتووە و پێی وایە لە بابەتی (الاسماو و الصفات) بە هەڵەدا چووە و ڕەخنەگرتنیشی لەوبارەوە لە (ئیبن عەبدولبەڕ) لە جێی خۆی نییە چونکە ئەو پیاوەی ئەو ڕەخنەی لێ دەگرێ یەکێکە لە زانایە ناودارەکان و تێگەیشتنی وی لە هی دانەر ڕاست و دروستترە..)).

ئەی ڕاستیخواز، بزانە کە لە عەقڵ و نەقڵەوە دوو بنچینەی ڕەگداکوتاومان بۆ هاتووە کە تێگەیشتنی هەموو فەرموودەکانی لەسەر بەندە:

سەبارەت بە نەقڵ ئایەتی خوای گەورەیە کە فەرموویەتی: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَيْءٌ﴾ (الشوری: ١١) واتە: هیچ شتێك وەکوو ئەو نییە و لەو ناچێ..
هەرکەسێ لەمە تێگەیشت هیچ وەسفێك بەپێی هەست لێك ناداتەوە.

لەبارەی عەقڵیشەوە ئەوا زانیویە کە دروستکەر پێچەوانەی دروستکراوەکانە، بەڵگەی دروستکراوییشیان گۆڕان و هەڵچوونیانە، بەوەش دەسەلمێ کە دروستکەر ئەزەلییە..

سەیر و زۆر سەیر ئەو کەسەیە سروشتی قسەکە تێ ناگات و ڕەتی دەکاتەوە!

ئەی لە فەرموودەی صەحیحدا نەهاتووە کە مردن لەنێوان بەهەشت و دۆزەخدا سەردەبڕدرێ؟! ئەگەر لەوبارەوە پرسیار لە عەقڵ کرا بابەتەکە لە حەقیقەتی خۆی لادەدا لەبەرئەوەی ئەو کەسەی لە چییەتیی مردن تێ بگات لای سەلماوە کە مردن سەرنابڕدرێ! وادانێ یەکێك فەرموودەکەی تەئویل کرد و وتی: مردن ماکێکە ژیان دەپووچێنێتەوە، ئیتر چۆن مردن دەمرێنرێ؟! ئەگەر پێی وترا: چی لە

فەرموودەکە دەکەیت؟ وتی: ئەمە وەکوو وێنە و شێوەیەك بە نموونە هێنرایەوە تاوەکوو بەو وێنە بەرهەستە نەمانی ئەو واتایە بزانرێ.

پێمان وت: لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە: ((بەقەرە و ئال عیمران وەکوو دوو پەڵەهەور دێن)). وتی: قسە نابێتە پەڵەهەور و تەشبیهی پێ ناکرێ. پێمان وت: ئایا نەقڵ پەك دەخرێ؟! وتی: نا، بەڵام پاداشتەکانیان دێن.

وتمان: چ بەڵگەیەك هەیە لەو ڕاستییانە لاتبدات؟ وتی: زانیاریم بەوەی قسە بە تەن ناچوێنرێ و مردنیش وەکوو ئاژەڵ سەرنابڕدرێ، فراوانیی زمانی عەرەبیش دەزانن، عەقڵتان بەمە ناشکێ و لێی تێ ناگات.

زانایان وتوویانە: ڕاستت فەرموو، لەبارەی لێکدانەوەی هاتنی بەقەرە و سەربڕینی وەها دەڵێین.

وتی: ئێوە چەند سەیرن! لە مردن و قسە ئەوەتان دوورخستەوە کە شیاویان نییە لەبەر پاراستنی ئەو حەقیقەتانەی دەیانزانن لەبارەیانەوە، ئیتر چۆن ئەو شتانەتان لە خودا دوور نەخستەوە کە دەبێتە هۆی چوواندنی بە مەخلووقاتەکانی بەو بەڵگانەی کە لەو شتانە پاکی ڕادەگرن؟!

## ٥٠- نهێنیی لابردنی ئایەتی (بەردبارانکردن)

بیرم لەو نهێنییە کردەوە کە سڕینەوەی واژەی ئایەتی بەردبارانکردنی پێویست کردووە لەگەڵ هێشتنەوەی حوکمەکەی بە ئیجماعی زانایان! بۆ ئەوە دوو واتام دۆزییەوە:

یەکەم: لوتف و میهرەبانیی خودا بە بەندەکانی لەوەی کە بە ئەرك و قورساییە گەورەکان ڕووبەڕوویان نابێتەوە، بەڵکوو باسی قامچیکاری کردووە و بەردبارانکردنی شاردۆتەوە.

هەر لەم واتایەوە هەندێ زانا وتوویانە: خوای گەورە لەبارەی شتە قورسەکانەوە فەرموویەتی: ﴿ كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ ﴾ (البقرة: ١٨٣) واتە: ڕۆژووتان لەسەر نووسراوە... واژەکەی هێناوە و باسی بکەرەکەی نەکردووە ئەگەرچی خۆی زانیویەتی کە هەر خۆی بنووسەکەیە..بەڵام کاتێ دێتە سەر باسی ئەو شتانەی مایەی ئاسوودەیین فەرموویەتی: ﴿ كَتَبَ رَبُّكُمْ عَلَىٰ نَفْسِهِ الرَّحْمَةَ ﴾ (الأنعام: ٥٤) واتە: پەروەرێنتان دلۆڤانیی لەسەر خۆی نووسیوە.

ڕووی دووەم: بەوە فەزڵی ئوممەت لە گیانبەخشی ڕوون دەکاتەوە کە قەناعەتی بە هەندێ بەڵگە هەیە، چونکە کە لەسەر ئەو حوکمە ڕێککەوتن کرا ئەوا ئەمە بەڵگەیە بەڵام وەکوو بەڵگەیەك نییە کە بە دەق بڕابێتەوە.

هەر لەم چەشنە، حەزرەتى ئيبراهيم بە هۆى خەونێكەوە هەنگاوى نا بەرەو سەربرينى كوڕەكەى ئەگەرچى سروش لە ئاگاييدا زياتر جێى متمانەيە و خاترجەمە.

## ٥١- لەبارەی دەسگرتن بە هۆکارەکانەوە

دۆخێکم بۆ هاتەپێش تێیدا لە ناخی دڵمەوە پەنام بردە بەر خودای تاکوتەنیا و زانیم کە جگە لەو کەسی تر توانای سوودپێگەیاندن و دوورخستنەوەی زیانی نییە، پاشان دەستم کرد بە لێکۆڵینەوە لە هۆکارەکان.

یەقینەکەم گلەیی لێ کردم و وتی: ئەمە تانەدانە لە پشتبەستن بە خودا (التوکل)!

وتم: نا وەها نییە، خوای گەورە لە حیکمەتەوە هۆکارەکانی داناوە، واتای حاڵم وەها بوو: ئەوەی داتناوە (لە هۆکارەکان) سوودی نییە و بوونی وەکوو نەبوون وایە! (مەبەستی ئەوەیە کە ئەگەر من واز لەو هۆکارانە بێنم کە خودا دایناون وەکوو ئەوە وایە بڵێم: خودایە، ئەو هۆکارانەی داتناون هیچ سوودیان نییە و بوونیان وەکوو نەبوون وایە بۆیە دەستیان پێوە ناگرم!).

هۆکارەکان لە شەرعەوەن وەکوو ئایەتی: ﴿وَإِذَا كُنتَ فِيهِمْ فَأَقَمْتَ لَهُمُ الصَّلَوٰةَ فَلْتَقُمْ طَآئِفَةٌ مِّنْهُم مَّعَكَ وَلْيَأْخُذُوٓاْ أَسْلِحَتَهُمْ﴾ (النساء: ١٠٢) واتە: ئەگەر تۆ لەناویاندا بوویت و نوێژت بۆ کردن با دەستەیەکیان لەگەڵت نوێژ بکەن و چەکەکانیان هەڵبگرن..

هەروەها ئایەتی: ﴿فَذَرُوهُ فِى سُنۢبُلِهِۦٓ﴾ (یوسف: ٤٧) واتە: گەنمەکە لەناو گوڵەکەیدا بهێڵنەوە.

هەروەها پێغەمبەر دوو زرێی لەسەریەك لەبەركردووە و ڕاوێژی بە دوو پزیشك كردووە.

كاتێكیش چووە تائیف و گەڕایەوە نەیتوانی بچێتە نێو مەككەوە تا ئەوەی هەواڵی نارد بۆ (موگعەمی كوڕی عەدی) و وتی: ((لە پەنای تۆوە دێمەوە ناو مەككە))، دەیتوانی بە بێ هیچ هۆكارێك و بە پشتبەستن بە خودا بچێتە ناو مەككەوە..

جا ئەگەر شەرع كاروبارەكانی بە هۆكارەكانەوە بەستبێتەوە ئەوا پشتكردنم لە هۆكارەكان دانەدواوەی حیكمەت و داناییە. لەبەرئەمە پێم وایە چارەسەر و تیماركردن كارێكی باشە و جێی گلەیی نییە. خاوەن مەزهەبەكەم (ئەحمەدی كوڕی حەنبەل) پێی وایە وازهێنان لە چارەسەركردن باشترە، بەڵام بوونی بەڵگە ڕێگریم لێ دەكات لەمەدا شوێنپێی هەڵگرم:

لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە كە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) فەرموویەتی: ((ما أنزل الله داء إلا وأنزل له دواء، فتداووا)) رواة البخاري و أحمد. واتە: خودا هەر دەردێكی ناردبێت ئیللا دەرمانێكیشی بۆ ناردووە، كەواتە چارەسەر و تیماركاری بكەن.

واژەی ئەم فەرموودەیە بە شێوەی فەرمان هاتووە، فەرمانیش یان واجیبە یان داواكراو و باش دەبێ كە پێشتر قەدەغە نەكرابێت، ئیتر بەمە دەوترێ: شتێكی ڕێپێدراوە.

حەزرەتی عائیشە دەیگوت: (بە هۆی زۆری نەخۆشییەکانی پێغەمبەر و ئەو دەرمانانەی بۆی دیاری دەکران فێری پزیشکی بووم.) ئیمامی ئەحمەد و ئەبوو نەعیم گێڕایتیانەوە.

پێغەمبەریش بە عەلی کوڕی ئەبوو تالیبی فەرموو: ((لەمە بخۆ، لەمە بۆت باشترە.)). فەرموودەیەکی حەسەنە و ئیبن ماجە و ئەبوو داوود و ئەلحاکم گێڕایتیانەوە.

ئەو کەسانەشی پێیان وایە وازهێنان لە چارەسەر و دەرمان باشترە بەڵگەیان ئەم فەرموودەیە کە دەڵێ: ((حەفتا هەزار کەس بێ لێپرسینەوە دەچنە بەهەشتەوە...)) پاشان بەمانە وەسفیان دەکات: ((داخکردن ناکەن و داوای نووشتە لە کەس ناکەن و ڕەشبین نابن و پشت بە پەروەرێنیان دەبەستن.)) بوخاری و موسلیم گێڕایتیانەوە.

ئەمە پێچەوانەی چارەسەر و دەرمانکاری نییە چونکە خەڵکێك هەبوون داخکردنیان بەکاردێنا نەوەك نەخۆش بکەون و، نووشتەیان دەکرد نەوەك تووشی ناخۆشییەك ببن، پێغەمبەر ئەسعەدی کوڕی زوڕارەی داخ کرد و لە فەرموودەی صەحیحیشدا هاتووە کە ڕوخسەتی نووشتەی داوە..بەپێی زانیاری ئێمە مەبەست ئەوەیە کە ئاماژەمان بۆی کرد.

ئەگەر زانیم پێویستم بە ڕەوانییە ئەوا دەزانم کە خواردنی بەڕوو گونجاو نییە و خواردنەوەی ئاوی خورمای هیندی(تەمەرەندی) باشترە، ئەمە زانستی پزیشکییە،

ئەگەر شتێك نەخۆمەوە كە بۆم باشە و بۆ تەندروستيم گونجاوە پاشان وتم: خودا لەشساغمكە! ئەوا دانايى پێم دەڵێ: ئەى نەتبيستووە كە پێغەمبەر فەرموويەتى: ((ببيبەستەوە و پشت بە خودا ببەستە))؟! بخۆوە و بڵێ: خوداية لەشساغمكە. وەكوو ئەو كەسە مەبە كە لەنێوان كێڵگەكەى و ڕووبارەكەدا مشتێ خۆڵ هەيە و تەنبەڵى دەكات لە لابردنى و پاشان نوێژەبارانە دەكات!

ئەم حاڵەتە وەكوو حاڵى ئەو كەسە وايە كە بێ توێشوو گەشت دەكات، ئەو كەسە بۆيە بێ توێشوو سەفەر دەكات گوايە خودا تاقى دەكاتەوە ئاخۆ ڕۆزى دەدات يان نا؟! پێشتر خودا پێى فەرمووە: ﴿وَتَزَوَّدُوا﴾ (البقرة: ١٩٧) واتە: توێشوو ئامادەكەن..كەچى ئەم كەسە دەڵێ: توێشوو ئامادە ناكەم! ئەمە بەر لەوەى لەناوى ببات خۆى لەناوچووە، ئەگەر كاتى نوێژ هات و ئاوى پێ نەبوو، لەسەر كەمتەرخەمييەكەى سەرزەنشت دەكرێ و پێى وترا: بەر لە گەيشتنت بە چۆڵەوانى دەبوو ئاوت لەگەڵ خۆت هێنابايە!

لە كردەوەى ئەو خەڵكانە زۆر وريابە كە زۆر وردبوونەوە و لە دۆخە دينييەكان دەرچوون و گومانيان وابوو كە تەواويى دين بە دەرچوون لە سروشت و پێچەوانە جووڵانەوەى بابەت و دۆخەكانە.

ئەگەر هێز و زۆريى زانست نەبووايە نەمدەتوانى و نەمدەزانى ڕاڤەى بكەم.. تێ بگە لەوەى ئاماژەم بۆ كرد بۆت باشترە لەو ناميلكانەى دەيبيستى و لەگەڵ ئەهلى واتاكان بە نەك لەگەڵ ئەهلى تێئاخنين و زۆروبۆر(الحشو).

## ٥٢- پاکوخاوێنی لە ئیمانەوەیە

خەڵکێکی زۆرم بینیوە جەستەیان پشتگوێ خستووە، هەیانە دوای خواردن دەمووددانی خاوێن ناکاتەوە، هەیە دەستی ناشوات، هەیە ددانی پاك ناکاتەوە، تێیاندایە گرینگی بە چاوەکانی نادات و ئاگای لە بنباڵی نییە..هیتریش..ئەم پشتگوێخستنە کەموکورتی لە دین و دونیا چێ دەکات.

سەبارەت بە دین، فەرمانی بە ئیماندار کردووە ڕۆژی هەینی خۆی بشوات و پاك بکاتەوە لەبەرئەوەی دەچێتە نێو خەڵك و لەگەڵیان کۆدەبێتەوە، نەهیشی کردووە لەوەی ئەگەر کەسێك سیری خوارد بچێتە مزگەوتەوە و، شەرع فەرمانی کردووە بە خاوێنکردنەوەی کەلێنی پەنجەکان و نینۆك کردن و سیواك و بەرتاشین..هەروەها چەند ئادابێکی تر..ئەگەر ئەوە فەرامۆش کرا ئەوا واز لە دانراوی شەرع هێنراوە، ڕەنگە هەندێ لەوە ببێتە هۆی تێکچوونی پەرستش وەك ئەوەی نینۆکەکانی پشتگوێ بخات و ئیتر پیس و پۆخڵی لەژێریان کۆببێتەوە کە ببێتە هۆی ڕێگریکردن لەوەی ئاوی دەسنوێژیان بگاتێ.

پەیوەست بە دونیاشەوە، کۆمەڵێك لەو کەسانەم بینی لەوانەی خۆیان پشتگوێ خستبوو دێنە نزیکت بۆئەوەی بەچرپە قسە لەبن گوێت بکەن بۆنی دەمیان زۆر

ناخۆشه و ناشکریێ ڕوویان لێ وەرگێڕیت چونکه دەیانەوەی بەنهێنی قسەت بۆ بکەن! ڕەنگە زۆربەیان هەرگیز پەنجەیەکیان بە ددانیاندا نەهێناوە!

پاشان ئەمە دەبێتە هۆی بێزاریی ژن و ڕەنگە حەز نەکات ئەوە بە پیاوەکە بڵێ و ئەوەش سەردەکێشێ بۆ پشت تێکردنی! (ئیبن عەباس) خودا لێی ڕازی بێت دەیوت: من حەز دەکەم خۆم بۆ ژن برازێنمەوە هەروەك حەزدەکەم ئەو خۆی بۆ من برازێنێتەوە.

خەڵك هەیە دەڵێ: ئەمە زۆرلەخۆکردن و مەراییە! ئەم قسەیە هیچ نییە، خودای گەورە کاتێ دروستی کردووین جوانی کردووین چونکه چاو بەشی خۆی هەیە لە بینین و، هەر کەسێکیش سەیری برژانگەکانی چاو و برۆکان و جوان ڕێکخستنی خولّقاندن بکات دەزانێ کە خودا بنیادەمی جوان کردووە.

پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه وسلم) خاوێنترین و بۆنخۆشترین کەس بوو. لە فەرموودەدا هاتووە کە دەستی بەرز دەکردەوە تا سپێتیی بنباڵی دەردەکەوت. کە بەلەك و پوزی دەردەکەوت خاوێن و سپی بوو. هەمیشە سیواکی پێبوو، پێی ناخۆش بوو بۆنێکی لێ بێت خۆش نەبێ.

دانایان وتوویانە: هەرکەسێك جلوبەرگی خاوێن کردەوە خەمی کەم دەبێت و، هەرکەسێکیش بۆنی خۆش بوو عەقڵی زیاد دەبێ.

کەسی پاکوخاوێن دڵی خۆی خۆش دەکات و ڕێزی خۆی بەرز دەکاتەوە. دانایان وتوویانە: هەرکەسێك نینۆکی درێژ بوو دەستی کورت دەبێ.

پاشان له دڵی خەڵك نزیك دەبێتەوە و دڵەكان لەبەر خاوێنی و بۆنخۆشییەكەی خۆشیان دەوێت. پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) كەیفی بە بۆنی خۆش دەهات.

پاشان بەم حاڵەوە هاوسەرەكەی هۆگری دەبێ، ژنانیش هاوتا و هاوشانی پیاوانن، هەروەك پیاو پیس و چەپەڵیی وی پێ ناخۆشە ئەویش هەروەها پیس و پۆخڵیی پیاوی پێ خۆش نییە، ڕەنگە پیاو ئارام بگرێ لەسەر ئەوەی پێی ناخۆشە بەڵام ئەو ئارام ناگرێ.

كۆمەڵێكم بینی پێیان وابوو زاهیدن بەڵام پیسترین كەس بوون لەبەرئەوەی زانست ڕاستەڕێی نەكردبوون. بەڵام ئەوەی لەبارەی داوودی تائییەوە دەگێڕدرێتەوە كە پێی وتراوە: بۆ ریشت ڕێك و پێك و شانە ناكەیت؟! وتوویە: لەبەر سەرقاڵیم ئاگام لێی نییە..

ئەمە قسەی كەسێكە كە لە كاركردن بە سوننەت پۆزشی هێناوەتەوە، لەبەر ترسی لە ئاخیرەت نەپەرژاوەتە سەر بایەخدان بە خۆی و جەستەی، ئەگەر لەوە ئاگادار بووایە وازی لێ نەدەهێنا، حاڵی كەسی دەستەوسان نابێتە بەڵگە. هەر كەسێك سەرنج بداتە تایبەتمەندییەكانی پێغەمبەر(صلى الله علیه وسلم) دەبینێ ئەو لە زانست و كردەوەدا كامڵ و تەواو بووە، دەبێ پەیڕەوی لەو بكرێ و هەر ئەو بەڵگەیە بەسەر خەڵقەوە.

## ٥٣- خۆگونجاندن لەگەڵ ژینگە

سەرنجم دایە زیادەڕەویکردنی ئاغایانی دونیا لە خۆپاراستنیان لە گەرما و سەرما، دیتم لە بابەتی حیکمەتەوە پێچەوانەی مەبەستە، بەڵکوو تەنێ چێژێك وەدەست دێنێ، خێروخۆشیش لە چێژێکدا نییە کە ئێشێکی بەدوادا بێت.

لە گەرمادا، ئەوان ئاوی سارد (بەفراو) دەخۆنەوە، ئەوەش ئەوپەڕی زیانی هەیە، پزیشکان دەبێژن: ئەو سەهۆڵاوە نەخۆشیی سەخت چێ دەکات کە لە دەمی پیرییدا شوێنەواری وەدەردەکەوێ، هەروەها پەردەیەکی ئەستووری لە پەمۆ چێکراو لە دەرگا و پەنجەرەکان دەدەن و بە ئاو دەیرشێنن تاوەکوو هەوای سارد بۆ ژوورەکان دروست ببێت. لە سەرماشدا قاپووت کە ڕێگرە لە سەرما دروست دەکەن.

ئەمە لە ڕووی حیکمەتەوە پێچەوانەی ئەوەیە کە خودا دایناوە، خودا گەرمای بۆ شیبوونەوەی تێکەڵەکانی جەستە و سەرماشی بۆ سستبوونەوە داناوە، کەچی ئەوان هەموو ساڵ دەکەنە بەهار، ئیتر ئەو حیکمەتەی گەرما و سەرمای بۆ دانراوە پێچەوانە دەبێتەوە و زیان بە جەستە دەگات.

ئەوەی گوێی لەمە دەبێ با وا گومان نەبات کە من فەرمانی پێ دەکەم خۆی بداتە بەر سەرما و گەرماوە ! بەڵکوو پێی دەڵێم: لە خۆپاراستن زیادەڕەوی مەکە، بەڵکوو

بای ئەوەندە خۆی بداتە بەر گەرما کە هەندێ لە تێکەڵەکان شی ببنەوە تا ئەو ڕادەیەی کار لە هێز و توانا نەکات، لە سەرماشدا کەمێکی ئەوتۆت بەرکەوێ کە زیانت پێ ناگەیەنێ، چونکە گەرما و سەرما بۆ چاکە و سوودی جەستەیە.

هەندێ لە کاربەدەستان لە بنەڕەتدا خۆی لە گەرما و سەرما دەپاراست، ئیتر دۆخی گۆڕا و زوو مرد، لە کتێبی (لقط المنافع في علم الطب) باسی چیرۆکەکەیم کردووە.

## ٥٤- دەرمانی ئارامگرتن

لە تەکلیفدا هیچ شتێ هێندەی ئارامگرتن لەسەر قەزاوقەدەر سەختتر نییە و هیچ شتێکیش لە ڕازیبوون پێی باشتر نییە.

سەبارەت بە ئارامگرتن ئەوا فەرزە و ڕازیبوونیش پێی فەزڵ و چاکەیە. ئارامگرتن لەبەرئەوە سەختە چونکە زۆربەی کات قەدەر نەفس پێی خۆش نییە. پێناخۆشبوونی نەفس تەنها لەسەر نەساغی و ئازاری جەستە نەوەستاوە، بەڵکوو جۆراوجۆرە، تا ئەوەی عەقڵ لە حیکمەتی ڕوودانی قەدەردا سەرگەردان دەبێ. بۆ نموونە: کەسێکی بێ ناووبانگ و نەناسراو دەبینی ئەوەندە دەوڵەمەند دەبێ نازانێ چی لە پارە و دارایی بکات، قاپ و قاچاخەکانی لە بەرد و کانزای گرانبەها دروست دەکات، لەبەر کەم بایەخدانی بە شەریعەت هیچ گرینگی بەوە نادات کە نەهی کراوە لەو کارە. هەروەها ئاوریشم دەپۆشێ و ستەم لە خەڵك دەکات و دونیاش ڕووی تێکردووە ! پاشان خەڵکێك دەبینێ کە دیندار و زانستخوازن کەچی هەموو هەژار و داماو و لێقەوماون و کەوتوونەتە ژێردەستی ئەو ستەمکارە، ئیتر لەو کاتەدا شەیتان ڕێیەك بۆ دڵکرمێکردن و وەسوەسە دەدۆزێتەوە و دەست دەکات بە تانەدان لە حیکمەتی قەدەر! ئیماندار پێویستی بەوەیە لەسەر ئەو زیان و ئازارانەی لە دونیا پێی دەگات و مشتومڕی ئیبلیس لەوبارەوە ئارام بگرێ، هەروەها لە زاڵکردنی

بێباوەڕان بەسەر موسڵمانان و لادەران بەسەر دینداران، لەمە کاریگەرتریش ئێشاندنی ئاژەڵ و سزادانی منداڵە، لەم شوێنانەدا ئیمان ئاشکرا دەبێ.

ئەوەی ئارامگری لەسەر ئەو دوو دۆخە بەهێز دەکات دوو شتە: نەقڵ و عەقڵ.

نەقڵ بریتییە لە قورئان و سوننەت. قورئانیش دابەش دەبێ بۆ دوو بەش:

یەکەمیان: ڕوونکردنەوەی هۆکاری بەخشین بە بێباوەڕ و سەرپێچیکار:

وەکوو ئەوەی خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّمَا نُمۡلِي لَهُمۡ لِيَزۡدَادُوٓاْ إِثۡمٗاۖ ﴾ (آل عمران: ١٧٨) واتە: بۆیە مۆڵەتیان دەدەین تا گوناهیان زیاتربێت.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَلَوۡلَآ أَن يَكُونَ ٱلنَّاسُ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ لَّجَعَلۡنَا لِمَن يَكۡفُرُ بِٱلرَّحۡمَٰنِ لِبُيُوتِهِمۡ سُقُفٗا مِّن فِضَّةٖ﴾ (الزخرف: ٣٣) واتە: لەبەرئەوەی نەوەك هەموو خەڵك ببنە یەك گروپ و شێوە دەنا بۆ ئەو کەسەی بە خودا بێباوەڕ دەبوو خانوویەکمان بۆ چێ دەکرد کە میچەکەی لە زیو بووایە...

هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَإِذَآ أَرَدۡنَآ أَن نُّهۡلِكَ قَرۡيَةً أَمَرۡنَا مُتۡرَفِيهَا فَفَسَقُواْ فِيهَا﴾ (الإسراء: ١٦) واتە: ئەگەر ویستمان گوند و شارێك وێران بکەین ئەوا خۆشگوزەران و خۆبەزلزانەکانمان تێدا زۆر دەکرد و دەکردە فەرمانڕەوا و داوای گوێڕایەڵیی خودامان لێ دەکردن ئەوانیش سەرپێچیان دەکرد و خراپەکارییان بڵاو دەکردەوە.

لەم نموونانە لە قورئاندا زۆرن.

دووەمیان: تاقیکردنەوەی ئیماندار بەو شتانەی تووشی دەبێت:

وەکوو ئەم ئایەتانەی خوای گەورە:

- ﴿أَمۡ حَسِبۡتُمۡ أَن تَدۡخُلُواْ ٱلۡجَنَّةَ وَلَمَّا يَعۡلَمِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ مِنكُمۡ وَيَعۡلَمَ ٱلصَّٰبِرِينَ﴾ (آل عمران: ١٤٢) واتە: پێتان وابوو کە دەچنە بەهەشتەوە کەچی هێشتا ڕوون نەبۆتەوە کە کێ لە ئێوە جیهادی کردووە؟!

- ﴿أَمۡ حَسِبۡتُمۡ أَن تَدۡخُلُواْ ٱلۡجَنَّةَ وَلَمَّا يَأۡتِكُم مَّثَلُ ٱلَّذِينَ خَلَوۡاْ مِن قَبۡلِكُمۖ مَّسَّتۡهُمُ ٱلۡبَأۡسَآءُ وَٱلضَّرَّآءُ وَزُلۡزِلُواْ﴾ (البقرة: ٢١٤) واتە: پێتان وابوو دەچنە بەهەشتەوە کەچی هێشتا وەکوو ئەوانەی پێشووتان بەسەر نەهاتووە کە تووشی چەندان ناخۆشی و کارەسات بوون و هەژان..

- ﴿أَمۡ حَسِبۡتُمۡ أَن تُتۡرَكُواْ وَلَمَّا يَعۡلَمِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ مِنكُمۡ وَلَمۡ يَتَّخِذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَا رَسُولِهِۦ وَلَا ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَلِيجَةٗۚ وَٱللَّهُ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ ١٦﴾ (التوبة: ١٦) واتە: پێتان وابوو وازتان لێ بهێنرێ کەچی هێشتا ڕوون نەبۆتەوە کێ لە ئێوە جیهادی کردووە؟!

نموونەی ئەمانە لە قورئاندا زۆرن.

سەبارەت بە سوننەتیش دابەش دەبێ بۆ وتە و حاڵ:

سەبارەت بە حاڵ، ((پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەسەر حەسیر پاڵی دەدایەوە کە شوێنەواری حەسیرەکە بە جەستەیەوە دیاری دەدا، عومەر (خودا لێی ڕازی بێ) گریا و وتی: کیسرا و قەیسەر لەنێو ئاوریشم و دیباجدان! پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: عومەر ئەتوو گومانت هەیە؟! ڕازی نابیت ئاخیرەت بۆ ئێمە بێت و دونیاش بۆ ئەوان؟!)) بوخاری گێڕایتییەوە.

سەبارەت بە وتەش، وەکوو ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کە دەفەرموێ: ((لَوْ كَانَت الدُّنْيَا تَعْدِلُ عِنْدَ الله جَنَاحَ بَعُوضَةٍ مَا سَقَى كَافِرًا مِنْها شَرْبَةَ مَاءٍ)) رواه الترمذي، وَقالَ: حديثٌ حسنٌ صحيحٌ.

واتە: ئەگەر دونیا لە لای خودا نرخی باڵە مێشوولەیەکی هەبووایە ئەوا فرەئاوێکی نەدەدایە کەسی بێباوەڕ.

سەبارەت بە عەقڵ ئەوا لەشکری ئارامگری بەم سەربازانە بەهێز دەکات:

یەکەم: بڵێت: بەڵگەی یەکلاکەرەوە حیکمەتی (خوا)ی قەدەرکاری بۆ ساغ کردوومەتەوە، لەبەر گومانی نەزانێك کە پێی وایە کەموکورتییە واز لە ئەسڵێکی جێگیر ناهێنم.

دووەم: بڵێت: ئەی بینەر ئەوەی بە لای تۆوە ترسناك و سنووربەزێنە لەوەی کە کەسی یاخی دەستی کراوەتەوە، لە ڕاستیدا لە واتادا دەست گرتنەوەیە، ئەوەشی پێت وایە دەسگرتنەوەی دەستی گوێڕایەلیکارە ئەوا لە واتادا دەسکردنەوەیە، چونکە دەسکردنەوەی یاخییەکە دەبێتە هۆی سزایەکی دووروردرێژ و، دەسگرتنەوەی گوێڕایەڵەکەش کرانەوە لە پاداشتێکی گەورەی لێ دەکەوێتەوە، کاتی هەردوو کەسەکە بەم زووانە کۆتایی دێ و قۆناغەکانیش دەپێچرێنەوە و سوارەکانیش لە ڕۆیشتنی خێرادان.

سێیەم: بڵێت: ئەوە چەسپاوە کە کەسی باوەڕدار بە خودا وەکوو کرێکار وایە و کاتی تەکلیف و کاریش وەکوو ڕۆژی ڕووناکە و پێویست ناکات ئەوەی لەناو قوڕدا

كاردەكات جلوبەرگی پاك لەبەر بكات، بەڵكوو پێویستە كاتەكانی كاركردن ئارام بگرێ، كاتێ لە كار بووەوە خۆی خاوێن بكاتەوە و باشترین جلوبەرگی لەبەربكات، هەر كەسێ لە كاتی كاردا كەیفسازی كرد و خۆی خافڵاند ئەوا كاتی دابەشكردنی كرێی ئیشكردن پەشیمان دەبێتەوە و لەسەر تەنبەڵیكردن لە كار سزا دەدرێت.

ئەم لایەنە توانای ئارامگرتن بەهێز دەكات..

زیاتر ڕوونی دەكەمەوە و دەڵێم: ئایا ئەگەر ویسترا هەندێ كەس وەكوو شەهید هەڵبژێردرێن چۆن كەسانێك خەڵق دەكرێن دەستیان درێژ بكەن بۆ كوشتنی ئیمانداران؟ ئایا ڕێی تێدەچێ كەسێك عومەر بكوژێ جگە لە ئەبوو لوئلوئە؟! یان كەسێك عەلی بكوژێ جگە لە ئیبن مولجیم؟! ئایا دروستە جگە لە بێباوەڕێكی سەرسەخت یەحیای كوڕی زەكەریا بكوژێ؟!

ئەگەر چاوی تێگەیشتن پەردەی كەمبینی لەسەر لاچوو ئەوا هۆخوڵقێن(المسبِّب) دەبینێ نەك هۆیەكان، تەقدیركار دەبینێ نەك قەدەرەكان، ئیتر وەكوو باوەڕێكی ویستی ئەو، لەسەر بەڵایەكانی ئارام دەگرێ. ئا لێرەوەیە ڕەزامەندی دروست دەبێ هەروەك بە هەندێ كەسێ گرفتار وتراوە: داوای لەشساغی لە خودا بكە! وتوویە: ئەوەی لای خودا خۆشەویسترینە لای منیش خۆشەویسترینە!

## ٥٥- لەبارەی پایەی ڕەزامەندییەوە

کاتێ لە نووسینی بەشی پێشوو بوومەوە، دەنگێك لە ناخەوە بانگی کردم: واز لە باسکردنی ئارامگرتن لەسەر قەدەرەکان بێنە، لەو نموونەیەی باست کرد بەتەواوی تێگەیشتم، وەسفی حاڵی ڕەزامەندیم بۆ بکە، من لە باسکردنیدا هەست بە پشووی ڕۆح دەکەم.

وتم: گوێ لە وەڵام بگرە و ڕاست و ڕەوان تێ بگە، ڕەزامەندی یەکێکە لە بەروبوومەکانی ناسین (مەعریفەت)ی خودا، کاتێ خودات ناسی بە قەزا و بڕیارەکانی ڕازی دەبیت، لەنێو ئەو قەزا و بڕیارانەدا هەندێ ناخۆشی و ترشوتاڵی دێتەپێشەوە کە کەسی ڕەزامەند هەست بە هەندێ تامی دەکات، بەڵام عاریف و خواناس بەهۆی بەهێزیی شیرنایی ناسینەکە تاڵییەکەی لەلا کەم دەبێ، ئەگەر بە ناسین بەرەو خۆشەویستی بەرز بووەوە ئەوا تاڵیی قەدەرەکان دەبێتە شیرنایی، هەروەکوو شاعیر وتوویە:

عذابُهُ فيكَ عَذْبُ ... وبُعْدُهُ فيكَ قُربُ

وأنتَ عنديَ كَروحي ... بل أنتَ منها أَحَبُّ

حَسبي مِنَ الحُبِّ أنّي ... لِما تُحِبُّ أُحِبُّ

واته: سزاكەی لەپێناو تۆدا شیرینە و دوورییەكەی لەپێناو تـۆدا نزیكییـە، تـۆ لـەلام وەكوو ڕۆحم وایت بەڵكوو تۆ لە ڕۆحیش خۆشەویستتری، ئەوەنـدە خۆشەویسـتییە بۆ من بەسە كە من ئەوەشم خۆشدەوێ كە تۆ خۆشت دەوێ.

هەندێ لە ئەویندارانی هەر لەم واتایەوە وتوویانە:

وَيَقْبُحُ مِنْ سِوَاكَ الفِعْلُ عِنْدِي  فَتَفْعَلُهُ فَيَحْسُنُ مِنْكَ ذَاكَا

واته: ڕەفتاری كەسێكی غەیری تۆ لەلام قێزەون و ناشیرینە بـەڵام كـە تـۆ دەیكـەی لە تۆ جوان دەبێ!

ئـەو بانگكـارە هـاواری لێ كـردم: پـێم بڵـێ، بـە چـی ڕازی دەبم؟! وادانـێ مـن لـە قـەدەرەكانی خـودا بـە نەخۆشـی و هـەژاری ڕازی دەبم، ئایـا بـە تەنبـەڵیكردن لـە خزمـەتكردنی و دووربـوون لـە ئـەهلی خۆشەویسـتییەكەی ڕازی دەبم؟! بـۆم ڕوون بكەوە چ شتێك دەچێتە ژێر ڕەزامەندی و چیش ناچێ؟

پێم وت: پرسیارێكی باشت كردووە، بەجوانی گوێ لە جیاوازییەكـە بگـرە: بـە هـەر شتێك ڕازی بە كە لەوەوە بوو، بەڵام تەنبەڵی و دواكـەوتن ئـەوە لـە خۆتەوەیـە، لـە ڕەفتاری خۆت پێی ڕازی مەبە. ئـەو مافـەی وی كـە لەسـەرتە بەتـەواوی جێبـەجێی بكە، گفتوگۆ لەگەڵ نەفسی خۆت بكە لەبارەی ئەو شتانەی لەوت نزیك دەخەنـەوە، بـە سسـتیكردن لـە هـەوڵ و كۆشـش لـە نەفسـت ڕازی مەبـە. ئەوەشـی لـە بڕیـارە پەتییـەكانی دەردەچـێ كـە هـیچ دەخلێكـی تـۆی تێـدا نییـە ئـەوا پێـی ڕازی بـە، هـەروەكوو ڕابیعـەی عەدەوییـە (ڕەحمـەتی خـودای لێ بێـت) كـاتێ لەلایـدا باسـی

پیاوێکی عابیدیان کرد که خۆراك له زبڵخانه هه‌ڵده‌گرێته‌وه و ده‌خوات و وترا: ده‌با داوای له خودا کردبایه ڕۆزییه‌که‌ی له غه‌یری ئه‌مه دابنایه!؟ وتی: که‌سی ڕازی هه‌ڵنابژێرێ و هه‌ر که‌سێکیش تامی مه‌عریفه‌تی چه‌شتبێ ئه‌وا تامی خۆشه‌ویستی تێدا هه‌ست پێ کردووه، ئیتر ڕه‌زامه‌ندی له‌لای ده‌بێته زه‌رووره‌ت.

پێویسته به به‌ڵگه‌وه هه‌وڵ و کۆشش بدرێت بۆ داواکردنی مه‌عه‌ریفه‌ت، پاشان به‌جیددییه‌وه به‌پێی ئه‌م مه‌عریفه‌ته کار بکرێت بۆ خزمه‌ت(ی خودا)، به‌ڵکوو ئه‌وه ببێته هۆی خۆشه‌ویستی، پێغه‌مبه‌ر (صلی الله علیه وسلم) فه‌رموویه‌تی: ((خوای گه‌وره ده‌فه‌رموێت ((به‌نده هه‌میشه به‌هۆی سوننه‌ته‌کانه‌وه لێم نزیك ده‌بێته‌وه تا ئه‌وه‌ی خۆشم ده‌وێت، ئه‌گه‌ر خۆشمویست ده‌بمه ئه‌و گوێیه‌ی پێی ده‌بیستێ و ئه‌و چاوه‌ی پێی ده‌بینێ....)) بوخاری گێڕایتییه‌وه.

ئه‌وه بێنیازی و ده‌وڵه‌مه‌ندی هه‌ره گه‌وره‌یه...

## ٥٦- دونیای پووچ

دیتم زۆربەی زانایان لە سەردەمی منداڵی و نەوجەوانییدا بە هۆی گەڕانیان بەدوای زانست ناپەرژێنە سەر کار و پەیداکردنی بژێو بۆیە ئاتاجی ئەو شتانە دەبن کە هەر دەبێ ببێت، نە لە بەیتولمال و نە لە بەخششی براکان شتێکی وایان پێ ناگات کە بەشیان بکات، بۆیە تووشی هەندێ زەلیلی دەبن!

لە حیکمەتی ئەوەدا تەنها دوو هۆکار دەبینم: یەکەم: بەم زەلیلییە بەخۆنازین و سەرسامی (الاعجاب) یان سەرکوت بکرێ، دووەم: سوودپێگەیاندنیان بە پاداشت.

پاشان زیاتر بیرم کردەوە، بیرۆکەیەکی وردم دیتەوە کە بریتییە لەوەی نەفسی سەرکەش ئەگەر حاڵی دونیای بەم جۆرە دیت ئەوا نایخاتە ناو دڵیەوە و بە عەزم و ئیرادەوە لێی دوور دەکەوێتەوە و وا دەبینێ شتێك کە زۆر بە دونیا بچێت بریتییە لە زبڵخانەیەك(گوفەك)ێك کە سەگەلی بەسەرەوەیە یان ئاودەستێك کە بۆ پێویستی بۆی دەچێ، ئەگەر مردن هات و لەم خانەیە کۆچی کرد ئەوا دڵ هیچ وابەستە و پەیوەندییەکی پێوە نییە، ئەو کات دونیا سووك و مردنیش ئاسان دەبێ.

## ٥٧- لەنێوان زانایان و زاهیدان

هێشتا كۆمەڵێك لە زاهیدان عەیب لە زۆرێك لە زانایان دەگرن ئەگەر لە ڕێپێدراوەكان (مباحـات) دەسـكراوە بـوون، پاڵنـەری ئەمەشـیان لـە نەزانییەوەیـە، ئەگـەر زێـدە زانیارییان هەبووایە عەیبیان لێ نەدەگرتن، چـونكە سروشـت و تەبیاتـەكان وەكیـەك نین، ڕەنگە كەسێ بەكەڵكی ژیانی سەخت بێت و یەكێكی تر بەكەڵكی ئەوە نەیـەت، بـۆ هـیچ كەسـێ دروسـت نییـە غـەیری خـۆی ناچـار بكـات لەسـەر شـتێ كـە خـۆی دەیتـوانێ، وەلێ ئێمـە ڕێكخـەرێكمان هەیـە كـە شـەرعە، ڕوخسـەتی تێدایـە و عەزیمەتیشی تێدایە، نابێ ئەو كەسە سەركۆنە بكرێ كە خۆی لەنێو ئەم ڕێكخەرەدا قەتیس كردووە، ڕەنگە ڕوخسـەتێ لەبـەر كاریگـەریی سـوودەكەی باشـتر بێـت لـە عەزیمەتكەلێ.

ئەگـەر خۆبەزاهیدزانـەكان بیانزانیبایـە كـە زانـین ناسـینی خـودای لێ دەكەوێتـەوە، دڵەكان لە ترسان پارە پارە دەبن و جەستەكان لاواز دەبن، ئیتر وا پێویسـت دەبـێ كە بەرانبەر جەستەكان بەسۆز و نەرم بین تا هێز و تواناكەی بپارێزین، لەبەرئەوەی ئامرازی زانست و لەبەركردن دڵ و بیرە بۆیە ئەگەر ئامراز شاد و ئاسوودە كـرا ئـەوا كاریش باش دەبێ.

ئەم بابەتەش بە زانست نـەبىٚ نازانرێت، لەبـەر نـەزانى و نەشـارەزايى زاهيـدان لـە زانست نكوولّييان لە شتىٚ كرد كە نايزانن و وايان گومان برد كـە مەبەسـت و ئامـانج ماندووكردن و ڕەتاندنى جەستەكانە، نەيانزانيوە كە ترسـى تاقـەتپڕوكێن پێويسـتى بە پشوودانى بـەرگريكار هەيـە، هـەروەك بوێـژ وتوويـە: (رِوِّحـوا القلـوب، تَـع الـذُّكر) دلّەكان خۆش و شاد بكەن زيكر وەردەگرىٚ.

## ٥٨- له فرتوفێڵەکانی ئیبلیس

له بووندا هیچ شتێ نییه مەزنتر و پایەدارتر له زانست و زانین. چۆن نا، ئەو رێبەر و رێنوێنه، ئەگەر نەما گومڕایی دەقەومێ!

له فرتوفێڵه ونەکانی شەیتان ئەوەیه که پەرستش (التعبد) لـه نەفسـی مـرۆڤ جـوان دەکات تا له باشترین خواپەرستی که زانسته سەرقاڵ و مژوولی بکات، تا ئەوەی بـۆ کۆمەڵێك له پێشینانی وەها جوان کرد که کتێبەکانیان ژێرگڵ نـا و تووڕیاندانـه نێـو دەریاوه ! کۆمەڵێ کەس ئەمەیان کردووه.

ئەگـەر گومـانی باشـیان پـێ ببـەم هـەر ئەوەیـه کـه بێـژم: شـتێك لـه ڕاوبۆچـوون و قسەیان تێدا بووه که حەزیان نـەکردووه بڵاوببێتـەوه، وەگـەرنا، ئەگـەر زانسـتێکی سوویەخشی ڕاست و دروستی وەها تێدابوویێت که ترس لـه سـەرەنجامەکەی نـەبێ ئەوا فڕێدانی، بەفیڕۆدانی ماڵ و سامان بووه و دروست نەبووه.

فرتـوفێڵی ئیبلـیس ئەوەنـده لـه کۆمـەڵێ لـه سـۆفییەکان نزیـك بۆتـەوه تـا ئـەوەی رێگرییـان کـردووه لـه قوتابییـەکانیان مەرەکەبـدان هـەڵگرن، تەنانـەت (جەعفـەر ئەلخولدی) وتوویـه: ئەگـەر سـۆفییەکان لێمگـەڕابان ئـەوا سـەنەدەکانی دونیـام بـۆ دێنان، کۆڕێکم له (عەباس ئەلدوری) نووسییەوه، هەندی سۆفی تووشم بوون وتـی: (دع علم الورق، وعليك بعلم الخِرَق) واز له زانستی پەڕ و سیپاره بێنه، بایەخ بده بـه

زانستی شمەکی دڕاو! !(وەکوو ئاماژەیەك بۆ سۆفیگەری). مەرەکەبدانێك بە سۆفییەکەوە بینرا سۆفییەکی تر پێی وت: عەورەتت داپۆشە!

ئەمە لە فرتوفێڵە پەنهانەکانی ئیبلیسە: ﴿وَلَقَدْ صَدَّقَ عَلَيْهِمْ إِبْلِيسُ ظَنَّهُۥ﴾ (سبأ: ٢٠)
واتە: ئیبلیس گومانەکەی لەبارەیانەوە بە ڕاست گەڕا..
لەبەر دوو هۆ ئیبلیس ئەمەی کردووە و لە لایان جوانی کردووە:

یەکەم: لەوانی ویست تا لەنێو تاریکییدا بڕۆن.

دووەم: ڕۆژانە هەڵدانەوەی لاپەڕەکانی زانست، زانیاری زانا زیاد دەکات و ئەوەی بۆ ئاشکرا دەکات کە لێی ون و نادیار بوو و ئیمان و ماریفەتی بەهێز دەکات و خەوشی زۆرێك لە ڕەفتارەکانی پێ نیشان دەدات ئەگەر هاتوو سەیری ڕێبازی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و هاوەڵانی کرد.

ئیبلیس ویستی ئەو ڕێگایانە بە پەنهاترین فێڵ بگرێت بۆیە وای دەرخست کە کردەوە مەبەستە نەك خودی زانست و لە کەسی هەڵخەڵەتاوی بزرکرد کە زانست کردەوەیە و چ کردەوەیەکیش!

لەم فەندوفێڵە ون و پەنهانە وریابە، چونکە زانست بنچینەی هەرەمەزن و ڕووناکی هەرەگەورەیە.

ڕەنگە هەڵدانەوەی پەڕەکان لە نوێژ و ڕۆژوو و حەج و غەزا باشتربن.

چەندان کەس کە پشتیان کردۆتە زانست لـە ئەشـکەنجە و ئـازاری ئارەزووبـازی لـە خواپەرستییدا ڕۆدەچێ و فەرزێکی زۆر بە سـوننەت بـەفیڕۆ دەدات و بـە شـتێك کـە پێی وایە باشترە لە ئەرك و واجیب سەرقاڵ و بێئاگا دەبێت، ئەگەر ترووسکاییەك لـە ڕووناکیی زانسـتی هەبووایـە ئـەوا ڕێـی ڕاسـتی دەدۆزییـەوە.. ڕابمێنـە لـەوەی بـۆم باسکردیت، إن شاءالله ڕێی ڕاست دەدۆزیتەوە.

## ٥٩- بووژاندنەوەی نەفس بۆ بەرگەگرتنی ناخۆشییەکان

دوو کۆڵکێش(حەممال) بەلامدا تێپەڕین و کۆڵکەدارێکی قورسیان هەڵگرتبوو، بەند و گۆرانییان دەگوت و لە یەکتریان وەردەگرتەوە، دیتم ئەگەر ئەوان ئەمەیان نەکردبا ئەوا ناخۆشی و دژوارییان لەسەر زیاتر و ئیشەکەشیان سەخت دەبوو، هەرکە ئەوەیان دەکرد کارەکەیان ئاسان دەبوو.

لە هۆی ئەوە ڕامام، ئەوە بوو کە بیری هەر یەکێکیان بەویترەوە پەیوەست و هەڵواسراو بوو، بەویش شاد و دڵخۆش بوو، هزری بۆ ئەوە دەگێڕا وەڵامی هاوشێوەی بداتەوە، ئیتر بەم چەشنە ڕێگایان دەبڕی و قورسایی بارەکەیان بیردەچۆوە.

لەمەشەوە ئامាژەیەکی سەیرم وەرگرت و دیتم مرۆڤ ئەرك و کارێکی قورسی خراوەتە ئەستۆ، لە گرانترین ئەو ئەرکانەی خراوەتە ئەستۆی بریتییە لە باوەگۆدانەوە(مداراة)ی نەفس و داوالێکردنی بە ئارامگرتن لەسەر ئەو شتانەی پێی خۆشە و ئەوانەی پێی ناخۆش و قەڵسە، دیتم ڕاست ئەوەیە: بە دڵدانەوە و نەرمونیانی و خۆشی و شادیی نەفس ڕێگای ئارامگرتن ببڕیت..

لەم بارەوە لە (بیشری ئەلحافی)یەوە ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەگێڕنەوە کە بە هاوڕێیەتیی پیاوێك بەڕێدا ڕۆیشتوون، هاوڕێکەی تینووی بووە، پێی وتووە: لەم

بیره ئاو بخۆینـەوە؟ بیشر وتوویـە: تـا بیرێکـی تـر ئـارام بگـرە! کـاتێ گەیشـتنە بیرەکە، پێی وت: بیرێکی تر! ئیتر هەر سەرقاڵی دەکرد پاشان ئاوڕی لە هاوڕێکەی دایەوە و وتی: دونیا ئاوا دەبڕدرێ!

لە تێگەیشتنی ئەم بنچینەوە، نەفسی سەرقاڵ کـرد و نـەرمونیانی بەرانبـەر نوانـد و بەڵێنی جوانی پێدا تا لەسەر ئەوەی خراوەتە ئەستۆی ئارام بگرێ.

هـەروەکوو هەنـدێ لـە پێشـینان بـە نەفسـی خـۆی دەوت: سـوێند بـە خـودا لـە قەدەغەکردنت لەوەی پێت خۆشە تەنێ لەبەر سۆز و خۆشەویستیمە بۆت.

(ئەبوو یەزید) ڕەحمەتی خوای لێ بێت وتوویەتی: هەر بەگریانەوە نەفسم بەرەو لای خودا دەبرد تا شەڕابی مەعریفەتم دەرخوارددا و پێ دەکەنی.

بزانە: باوەگۆدانەوە و نەرمونیانیی لەگەڵ نەفس پێویستە و بەوە ڕێگە دەبڕدرێ..

ئەمە هێمایەکە بۆ ئاماژەکە و ڕوونکردنەوەشی درێژە..

## ٦٠- هەندێ سەرلێشێواندنی ئیبلیس

لە شتگەلێك كە لە كۆڕەكانی ئامۆژگاری دەگوزەرێن ڕامام كە عەوام و زانا نەفامەكان پێیان وایە نزیكییە كەچی ناپەسند و دوورییە.

وەكوو ئەوەی قورئانخوێن چەشنی گۆرانی قورئان دەخوێنێ، ئامۆژگاریكار (واعیز) بە جۆش و خرۆشەوە شیعرەكانی مەجنوون و لەیلا دەڵێتەوە، یەكێك چەپڵەی بۆ لێ دەدات و یەكێكی تر كراسەكەی دەدڕێنێ! پێیان وایە ئەمە نزیكییە لە خودا!!

ئاشكرایە ئەم كارانە شیاو نین، چونكە كردنی كارێك كە ببێتە هۆی خراپەكاری ئەوا هەڵەیەكی گەورەیە، پێویستە لەمەدا واعیزەكان ڕێگەیان لێ بگیردرێ.

هەروەها ئەوانەشی بەسەر گۆڕەكاندا دەگەڕێن و قورئان دەخوێنن لەوانن، خەم و پەژارەكان دەوروژێنن تا ژنان زیاتر بگرین، لەسەر ئەوەش پارەیان وێدەدن، ئەگەر فەرمانیان بە ئارامگرتن كردبایە ژنان ئەوەیان نەدەویست!! ئەمەش لە شتە دژەكانی شەرعە..

(ئیبن عەقیل) وتوویە: لە پرسەی پیاوێكدا ئامادەبووین كە كوڕێكی مردبوو، قورئانخوێن ئەم ئایەتەی خوێند ﴿يَٰٓأَسَفَىٰ عَلَىٰ يُوسُفَ﴾ (يوسف: ٨٤) وتم: ئەمە گریانە بە قورئان!

واعیز هەیە لەسەر ڕێگەی مەعریفەت و خۆشەویستییەوە قسە دەكات، دەبینی بەرگدروو و كەسی بازاڕی (نەزان) كە تەنانەت فەڕزەكانی نوێژ نازانێ بە بانگەشەی خۆشەویستیی خوای گەورە جلوبەرگەكانی دەدڕێنێ! ئەوەی حاڵی لە هەمووان سافترە – كە باشترینیانە – بە وەهم كەسێك دێنێتە بەر خەیاڵی خۆی كە پێی وایە (خودا)ی خوڵقێنەرە، كە لەبارەی گەورەیی و دلۆڤانی و جوانیی ئەوەوە دەبیستێ وەكوو شەوق و پەرۆشییەك بۆی دەگرێت.

ئەوەی خەیاڵی بۆ دەكەن خودا نییە چونكە خودا ناكەوێتە ناو خەیاڵ.

دوای ئەمە، لێكۆڵینەوە لەگەڵ ڕەشۆكییان (عەوام) دژوارە، زۆر كەم سوود لە تاڵیی هەق وەردەگرن، وەلێ واعیز فەرمانپێكراوە بەوەی سنووری ڕاستی نەبەزێنێ و ئەو شتانە باس نەكات كە خراپیان دەكات، بەڵكوو بە نەرمترین شێوە ڕایانبكێشێ، ئەمەش پێویستی بە هونەرە، عەوام هەیە جوانیی واژە سەرسامی دەكات، هەیانە ئاماژەی پێ خۆشە، هەیە بە دێڕەشیعرێك ملكەچ دەبێ.

واعیزەكان لە هەموو كەس زیاتر پێویستییان بە ڕەوانبێژییە (البلاغة) تا خواستەكانیان جەم بكەن بەڵام پێویستە سەیری پێویستی واجیب بكات و بە ئەندازەی خوێی چێشت واژەی ڕێپێدراویان بداتێ، پاشان بەرەو عەزیمەتیان ڕابكێشێ و ڕێی ڕاستیان پێ بناسێنێ.

ئەحمەدی كوڕی حەنبەل ئامادەی كۆڕێك بوو، قسەی (ئەلحارث ئەلموحاسیبی) بیست گریا، پاشان وتی: ئامادەبوونم بەدڵ نییە.

بۆیەش گریا چونکە دۆخەکە گریانەکەی پێویست کرد..

هەندێ لە پێشینان تێکەڵوپێکەڵیی چیرۆکخوانەکانیان دەبینی جڵەوگیرییان دەکرد لە ئامادەبوون لە کۆڕەکانیان، بەڵام ئەمە ئەمڕۆ باش نییە چونکە خەڵك لەو سەردەمەدا بە زانستەوە سەرقاڵ بوون پێیان وابوو ئامادەبوون لە کۆڕەکانی چیرۆك خوێندنەوە ڕێگر و بەربەستە لێیان، بەڵام ئەمڕۆ پشتکردن لە زانست زۆر بووە، کۆڕی ئامۆژگاری بۆ ڕەشۆکی سوودبەخشترە، لە گوناه دەیگێڕێتەوە و بەرەو تەوبەکردن دەیبزوێنێ، بەڵام کەموکورتی لە چیرۆکخوانە، با لە خودا بترسێ.

## ٦١- لەبارەی یەکتاییی ناو و سیفەتەکانی خوای گەورە

زیانبەخشترین شت لەسەر ڕەشۆکییان (عەوام) قسەی تەئویلکار و نەفیکارانی سیفەتەکان و ئیزافەتەکانە.

پێغەمبەران (علیهم السلام) لە چەسپاندن و سەلماندن (الاثبات) زۆر کۆشاون تا بوونی خولقێنەر لە دڵ و دەروونی ڕەشۆکییان بچەسپێت، دڵ و دەروونەکان بە چەسپاندن دڵنیا و هۆگر دەبن، ئەگەر ڕەشۆکییەك شتێکی بیست کە نەفی پێویست دەکات ئەوا لە دڵیدا چەسپاندن فڕێ دەدات ئەوەش گەورەترین زیانە لەسەری..

ڕوونکردنەوەی ئەمە ئەوەیە: خوای گەورە هەواڵی (استواء)ی خۆی لەسەر عەرش داوە، دڵ و دەروونەکان هۆگری چەسپاندن و بوونی خودا بوون:

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَيَبۡقَىٰ وَجۡهُ رَبِّكَ ﴾ (الرحمن: ٢٧) واتە: زاتی پەروەرێنت هەر دەمێنێتەوە.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿بَلۡ يَدَاهُ مَبۡسُوطَتَانِ﴾ (المائدة: ٦٤) واتە: دەستەکانی کراوەن.

فەرموویەتی: ﴿وَغَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡ﴾ (الفتح: ٦) واتە: خودا لێیان تووڕە بوو.

فەرموویەتی: ﴿رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ﴾ (المجادلة: ٢٢) واتە: خودا لێیان ڕازی بوو.

پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) هەواڵی داوە کە خودای گەورە بۆ ئاسمانی دونیا دادەبەزێ، فەرموویەتی ((دڵی بەندەکان لەنێوان دوو پەنجەی خوادایە)) فەرموویەتی ((تەوراتی بە دەستی خۆی نووسیوەتەوە)) فەرموویەتی ((کتێبێکی نووسیوە لەسەر عەرش لەلای خۆیەتی)) ئەم چوار فەرموودەیە موسلیم و چەند ئیمامێکی تر ڕیوایەتیان کردووە.

هیتریش هەیە کە باسکردنیان درێژ دەبێتەوە.

ئەگەر ڕەشۆکی و منداڵ پڕبوون لە چەسپاندن و بە تێگەیشتنی هەست هۆگری وەسفەکان بوون، پێی وترا: ﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞ﴾ (الشوری: ١١) واتە: هیچ شتێك هاوشێوەی ئەو (خودا) نییە، ئەوەی خەیاڵ لە دڵیدا نەخشاندوویەتی دەسڕێتەوە و واژەکانی چەسپاندن بە دامەزراوی دەمێننەوە.
(لێرە کۆمەڵێك فەرموودەی لاواز هاتووە بە پێویستم نەزانی وەریانگێڕم.)

ئەگەر بە ڕەشۆکییەك دەست پێ بکرێ کە خاڵییە لە تێگەیشتنی چەسپاندن و وتمان: خودا نە لە ئاسمانە و نە لەسەر عەرش! بە (دەست)یش وەسف ناکرێ و قسەکانیشی سیفەتێکی خودییە، هیچ شتێك لەبارەیەوە نازانین! دابەزینی وێنا ناکرێ..بەم قسانە بەگەورەزانینی قورئان لە دڵیدا دەسڕدرێتەوە و لە ناخیدا چەسپاندن و سەلماندنی خودا نایەتەدی.

ئەمەش تاوانێکی گەورەیە بەرانبەر پەیامهێنان کە ئەوەی لەپێناو ڕوونکردنەوەیدا ماندوو بوون هەڵدەوەشێنێتەوە، بۆ زانایەك دروست نییە بێت بیروباوەڕی

ڕەشۆکییەك کە دەقی بە چەسپاندنەوە گرتووە لێی تێکبدات، بەوە خراپی دەکات و چارەسەرکردنیشی دژوارە.

بەڵام کەسی زانا ئێمە لێی دڵنیاین چونکە دەزانێ نوێبوونەوەی سیفەتی خودای گەورە مەحاڵە و ناشێ (استواء)ی کردبێت هەروەك دەزانرێ و ناشێ هەڵگێراو بێت و بە پێوەلکان و دەستلێدان و گواستنەوە وەسف بکرێت. لای زانا شاراوە نییە کە مەبەست لە هەڵگێڕو وەرگێڕی دڵەکان لەنێوان دوو پەنجەدا بریتییە لە کۆنترۆڵکردنی دڵەکان، ئەوەی مرۆڤ لەنێوان دوو پەنجەیدا هەڵیدەسوڕێنێ بریتییە لەوەی کۆنترۆڵی کردووە، پێویست بە تەئویلی ئەو کەسەش نییە کە وتوویە: پەنجە واتە شوێنەواری باش، دڵەکان لەنێوان دوو شوێنەوار لە شوێنەوارەکانی پەروەردگارێتین کە بریتین لە: دامەزراندن و لە ڕێ لادان. هەروەها تەئویلی ئەو کەسەی وتوویە: هەردوو دەستەکان واتە: نیعمەتەکانی، چونکە ئەگەر فامکرا کە مەبەستەکە چەسپاندنە و بەو شێوەیە دوێنراوین کە تێ دەگەین و نموونەمان بەو شێوەیە بۆ هێنراوەتەوە کە دەیزانین، بە ئەسڵی یەکلاکەرەوەش بۆمان ساغ بۆتەوە و سەلماوە کە ئەوەی هەست دەیزانێ بۆ وی ناشێ و دروست نییە، ئیتر دەزانین مەبەست لە باسکردنی ئەوە چییە.

چاکترین شتێ بۆ ڕەشۆکییان بیلێین ئەوەیە: ئەم شتانە چۆن هاتوون ئەوها تێی بگەن و تەئویلی مەکەن، هەموو ئەوە مەبەست لێی پاراستنی چەسپاندنە، هەر ئەمەشە کە پێشینان مەبەستیان بووە.

ئەحمەد نەیدەهێشت بوترێ: قسەکردنم بە قورئان مەخلووقە یان نامەخلووقە.

هەموو بۆ ئەوە بوو تا هانی خەڵك لەسەر شوێنكەوتن بدات و واژەكانی چەسپاندن وەكوو خۆیان بمێننەوە.

نەفامترین كەس ئەوانەن كە ئەوەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) مەبەستی بووە گەورەی بكات ئەو بێت لە دڵەكان هێزەكانی گەورەكردن لاواز و سووك بكات: پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (( لا تُسافِروا بالقرآن إلى أرضِ العدوّ)) رواه البخاري. واتە: قورئان مەبەن بۆ خاكی دوژمن..

شافیعی قەدەغەی كردووە كەسی بێ دەسنوێژ قورئان هەڵگرێ تەنانەت ئەگەر لەنێو شتێكیشدا بێت ئەوەش وەكوو بەگەورەگرتنی قورئان.

ئەگەر خۆبەزانازانێك هات و وتی: قسە سیفەتێكە پەیوەستە بە خودی قسەوێژەوە ! واتای ئەم قسەیەی ئەوەیە لێرەدا هیچ شتێ نییە رێزی لێ بگیرێ! ئەمە دژەوانەی مەبەستی شەرعی كردووە.

پێویستە فامی دۆخەكانی شەرع و مەبەستەكانی پێغەمبەران (دروودی خوایان لەسەر بێت) بكرێ.

رێگری كراوە لە ئاشكراكردنی ئەوەی شەرع داپیۆشیوە، پێغەمبەری خودا (صلی الله علیه وسلم) نەهی كردووە لە قسەكردن لەبارەی قەدەرەوە، نەهی كردووە لە ناكۆكی و جیاوازی، چونكە ئەم شتانە دەبێتە مایەی ئازاردان، ئەگەر لێكۆڵەر لە قەدەر ئەگەر تێگەیشتنی گەیشتە ئەوەی بڵێ: خودا بەجێی هێنا و سزایدا، ئەوە ئیمانی بە دادپەروەری خودا هەژاوە، ئەگەریش وتی: نە تەقدیری كرد و نە

جێبەجێی کرد، ئەوا ئیمانی بە توانا و موڵکی خودا هەژاوە. بۆیە وا باشترە واز لەم شتانە بهێنرێ.

ڕەنگە یەکێ بڵێ: ئەمە ڕێگریکردنە لەوەی ئاگاداریی ڕاستییەکان بین و فەرمانکردنە بە وەستان لەگەڵ چاولێکەری!

دەڵێم: نا، بەڵکوو فێرت دەکەم کە ئەوەت لێ دەویسترێ کە بە گشتی و پوختی ئیمان بێنی و فەرمانت پێ نەکراوە بۆ زانینی ناوەڕۆك و حەقیقەت گەڕان و لێکۆڵینەوە بکەیت لەگەڵ ئەوەی هێزەکانی تێگەیشتنت دەستەوسانە لە دەرکپێکردنی حەقیقەتەکان.

پێغەمبەر ئیبراهیم (دروودی خوای لەسەر بێت) بە خوای گەورەی وت: پێم نیشاندە چۆن مردوو زیندوو دەکەیتەوە؟! خودا ژیاندنەوەی مردوویەکی نیشاندا بەڵام نیشانی نەدا چۆنی زیندوو کردەوە لەبەرئەوەی تواناکانی دەستەوسان بوو لە دەرکپێکردنی ئەوە.

پێغەمبەریش (صلی الله علیە وسلم) کە هاتووە بۆ ڕوونکردنەوەی پەیامی خودا بۆ خەڵك تەنها بەوە لە خەڵك قایل دەبوو ئیقرار بکەن و باوەڕی گشتی و پوختیان هەبێ.

هاوەڵانیش هەر وەها بوون، لێیان نەگێڕدراوەتەوە کە لەبارەی خوێندنەوە و خوێنراو، قسەیان کردبێت، نەشیانوتووە: (استوی) بە واتای (استولی) هاتووە! (ینزل) بە واتای (یرحم) هاتووە! بەڵکوو قایل بوون بە چەسپاندنی ئەو ڕستانەی

گەورەكردنى خودا لە دڵەكان دەچەسپێنن و بەپێى فەرمايشتى خودا وازيان لە خەياڵبازى هێناوە: : ﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ﴾ (الشورى: ١١) واتە: هيچ شتێك هاوشێوەى ئەو (خودا) نييە..

پاشان ئەمە فريشتەى (مونكەر و نەكير) پرسيار تەنێ لە بنەما پوختەكان دەكەن و دەڵێن: كێ پەروەردگارتە؟ ئايينت چييە؟ پێغەمبەرت كێيە؟

هەركەسێ لەم بەشە تێ بگات لە لێكچوواندنى (المُجَسِّمة) و پەكخستنى (المُعَطِّلَة) سەلامەت دەبێ و لەسەر رێگاى پێشينانى يەكەم دەوەستێ.

## ٦٢- حەقیقەتی بیستن و دیتن

ئەم ئایەتەم خوێندەوە: ﴿قُلۡ أَرَءَيۡتُمۡ إِنۡ أَخَذَ ٱللَّهُ سَمۡعَكُمۡ وَأَبۡصَٰرَكُمۡ وَخَتَمَ عَلَىٰ قُلُوبِكُم مَّنۡ إِلَٰهٌ غَيۡرُ ٱللَّهِ يَأۡتِيكُم بِهِۗ ٱنظُرۡ كَيۡفَ نُصَرِّفُ ٱلۡأٓيَٰتِ ثُمَّ هُمۡ يَصۡدِفُونَ ٤٦﴾ (الأنعام: ٤٦) واتە: بڵێ: پێم بڵێن: ئەگەر خودا بیستن و بینینی لێ سەندنەوە و مۆری نا بەسەر دڵتانەوە، چ خودایەکی تری غەیری الله بۆتانی دێنێ؟!

لەم ئایەتەدا ئاماژەیەکم بۆ دەرکەوت ئەویش ئەوەیە:

ئەگەر مەبەستی لە ئایەتەکە هەمان (السمع) و (البصر) بێت کە (السمع) ئامێرێکە بۆ دەرکپێکردنی بیستراوەکان و (البصر)یش ئامرازێکە بۆ دەرکپێکردنی بینراوەکان، ئەم دووانە ئەوە بۆ دڵ دەخەنەڕوو، ئەویش ورد دەبێتەوە و پەند وەردەگرێ، ئەگەر مەخلووقات بۆ (سمع و بصر) نمایش کرا ئەوا ئەم دووانە هەواڵەکانیان بە دڵ دەگەیەنێ بەوەی کە بەڵگەن لەسەر خوڵقێنەر و هانی گوێڕایەڵیکردنی دروستکار دەدات و هۆشداری دەدات لە ئەشکەنجە و ئازاری خودا لە کاتی سەرپێچیکردنی.

ئەگەر مەبەستیشی واتای بیستن و دیتن بێت ئەوا بە بێئاگابوونیان دەبێت لەو ڕاستییانەی دەرکیان پێ نەکردووە بە هۆی سەرگەرمبوونیان بە ئارەزووەوە، مرۆڤ بە لێسەندنەوەی واتاکانی ئەو ئامرازانە سزا دەدرێ، دەبینێ بەڵام وەك ئەوەی نەیبینیوە، دەبیستێ بەڵام وەك ئەوەی نەیبیستوە، دڵیش بێئاگایە لەوەی ئازاری

پێ دەگەیەنێ، نازانێ چی دەویستریێ، بەلایەوە گرینگ و کاریگەر نییە کە ئەو تاقی دەکرێتەوە و ئامۆژگاریش سوودی نییە و نازانێ ئەو لەکوێیە و مەبەست لێی چییە و بۆ کوێ هەڵدەگیرێ و دەبردرێ، بەڵکوو بە خۆرپسك تێبینی بەرژەوەندەکانی دونیای دەکات و بیر لە لەدەستدانی ئاخیرەتی ناکاتەوە، پەند و ئامۆژگاری لە هاوڕێکەی وەرناگرێ و بۆ ڕێگاکەی زەخیرە دانانێ، هەروەك شاعیر دەڵێ:

النَّاسُ فِي غَفْلَةٍ وَ الْمَوْتُ يُوقِظُهُمْ     وَمَا يُفِيقُونَ حَتَّى يَنْفَذَ الْعُمُرُ

يُشَيِّعُونَ أَهَالِيهِمْ بِجَمْعِهِمْ     وَيَنْظُرُونَ إِلَى مَا فِيهِ قَدْ قُبِرُوا

وَيَرْجِعُونَ إِلَى أَحْلَامِ غَفْلَتِهِمْ     كَأَنَّهُمْ مَا رَأَوْا شَيْئًا وَلَا نَظَرُوا

واتە: خەڵك لە بێئاگاییدایە و مردن بەئاگایان دێنێتەوە، بێداریش نابنەوە تا تەمەن تەواو دەبێ..هەموویان کەسوکاریان بەرەو گۆڕستان دەبەن و تەماشای ناشتن و لەگۆڕنانیان دەکەن..دواتر دەگەڕێنەوە بۆ خەونەکانی بێئاگاییان وەك ئەوەی هیچیان نەبینیبێ و سەیریان نەکردبێ!

ئەمە دۆخی زۆربەی خەڵکە، پەنا بە خوا لە لێسەندنەوەی سوودەکانی ئامرازەکان چونکە ئەمە ناشیرینترینی دۆخەکانە.

## ٦٣- لەبارەی عیشقەوە

لە قسەی دانایان لەبارەی عیشق و هۆکارەکانی و دەرمانەکانی وردبوومەوە و لەوبارەوە کتێبێکم دانا و ناوم لێ نا (ذم الهوی)، تێیدا باسی ئەوەم کردووە کە دانایان وتوویانە: هۆکاری عیشق بزاوتی دەروونێکی بەتاڵە، ئەوان بۆچوونی جیاوازیان هەبووە و هەندێك وتوویانە: عیشق تەنها تووشی خەڵکی جوان و کەشخە و قۆز دەبێت..هەندێکی تر وتوویانە: تووشی ئەو کەسانە دەبێت کە لە وردبوونەوە و ڕامان لە ڕاستییەکان بێئاگان..

بەڵام دوای ئەوە، ئەز واتایەکی سەیرم بۆ هات کە لێرەدا ڕوونی دەکەمەوە کە بریتییە لەوەی کە عیشق ناچەسپێ و ڕەگ داناکوتێ تەنها لەگەڵ کەسێکی وەستاوی چەقیو نەبێ، بەڵام ئەوانەی هیممەت بەرزن هەر کات خەیاڵی شتێك بکەن کە ئەوین دێنێتە بەرەوە ئەوا خەوش و نەنگییەکانی بۆ دەردەکەوێ — جا بە بیرلێکردنەوە بێت یان بە تێکەڵبوون — ئیتر خاترجەم دەبن و دەروونیان بە خوازراوێکی ترەوە پەیوەست دەبێ.

هیچ کەس لەسەر پلیکانەی عیشق — کە وا پێویست دەکات دەست بەو وێنە و شێوەیە بگری و لە ئاست خەوش و نەنگییەکانی کوێر بیت — ناوەستێ مەگەر چەقیوێکی وەستاو نەبێ.

بەلام کەسانی سەربلند و دوور لە کەموکورتی هەمیشە لە بەرزبوونەوە و بالاکردندان، هیچ ڕێگرێك ناتوانێ لاڕێیان بکات، ئەگەر خۆشەویستیی کەسێك بە دەروونیانەوە نووسا ئەوا ناگەنە پلەی عیشقی زاڵ و تایبەت، بەلکوو ڕەنگە لە سەرەتاوە مەیلێکی توند بکەن یان بە هۆی کەم بیرکردنەوە یان بە هۆی کەم تێکەلاوبوون و ئاگاداربوون لە نەنگییەکان، یان بە هۆی وابەستەبوون بە هەندێ سیفەتی باشی کەسەکان لە ڕووی هاوڕێکییەك کە لەنێوان دوو کەسدا ڕوودەدات، وەکوو کەشخە و قسەخۆش لەگەڵ کەشخە و قسەخۆش، زیرەك لەگەڵ زیرەك، ئەوەش خۆشەویستی دێنێتە ئاراوە، بەلام عیشق نا، ئەوان بەردەوام لە ڕۆیشتندان و ناوەستن، وشتری سروشتی مرۆڤ (تەبیات) شوێنی سروودبێژی تێگەیشتن دەکەوێ، بەدڵنیاییەوە تەبیات شتێکی هەیە خۆی پێوە پەیوەست و وابەستە بکات کە لە دونیادا دەستی ناکەوێ، چونکە ئەو شتێکی گەورەکە کە ناشێ لە کەسەکاندا بەتێروتەواوی هەبێ، جا ئەگەر نەنگی و خەوشەکانی دیت دوور دەکەوێتەوە.

بەلام ئەوەی دڵی بە خۆشەویستیی خودا وابەستە بووە، ئەو خۆشەویستییە دەبێتە ڕێگر لەوەی ئەویندراری کەسی تر ببێت، ئەگەرچی خۆشەویستیی ئەو هاوشانی خۆشەویستیی مەخلووق نییە بەلام خاوەنانی مەعریفەت شێت و شەیدای ئەون، خۆشەویستیی ئەو لە خۆشەویستیی ئەوانیتر بێئاگای کردوون و دڵ و دەروونەکان بەتەواوی نقوومی هێزی مەعریفەت و خۆشەویستیی دڵەکان بوون، هەروەك (ڕابیعەی عەدەوی) وتوویە:

أُحِبُّ حبيبا لا أُعابُ بِحُبّهِ وأَحبَبْتمُ مَنْ فِي هَواهُ عيوبُ

واتـه: خۆشەویسـتێکم خۆشـدەوێ کـه بـه هـۆی خۆشەویسـتییەکەیەوە عـەیبم لێ نەگیرێ، ئێوەش کەسانێکتان خۆشویست کە لە خۆشەویستیدا عەیبگەلێك هەیە..

لە فەقیرێکی زاهید گێڕدراوەتەوە کە ڕۆژێکیـان بـە لای ئافرەتێکدا تێپـەڕی و پێـی سەرسام بوو، لـە بـاوکی خـوازبێنی کـرد و ئـەویش لێـی مـارەکرد، بردیـەوە مـاڵ و جلوبەرگی نوێی لەبـەرکرد، کـاتێ شـەو داهـات فەقیرەکـە هـاواری کـرد: جلـەکانم! جلەکانم! ئەوەی هەمبوو لەدەستم دا!

ئەمە ساتمەیەك بوو لە ڕێی ئەم فەقیرە کە پێی گوت ئەو لە ڕێگا لایداوە..

ئەم حاڵەتانە تووشی خواناسان و ئـەو کەسـانە دەبـێ کـە لـە خـۆ لـە کـاری بـەد و نەشیاو بەدوور دەگرن..

(ئـیبن مەسـعوود) وتوویـە: ئەگـەر ئـافرەت سـەرنجی یـەکێکتانی ڕاکێشـا و پێـی سەرسام بوون با میزڵدانەکەی بیربێتەوە!

نموونەی ئەم حاڵە ئەوەیە کە عەقڵ لە کاتی خواردنی خۆراکێکی بەتام بێئاگا دەبێ لـە بیرکردنـەوە لـە هـەڵگێڕ و وەرگێڕکردنـی لـەناو دەم و قووتـدانی، لـە کـاتی جووتبـوونیش لەبـەر زاڵبـوونی شـەهوەت ئاگـای لـە بەرکـەوتنی پـیس و چـەپەڵی نامێنێ، لە شاردنەوەی ئەو دۆخانەدا سوود و چاکە هەیە.

بەڵام کەسانی بێدار لە زۆربەی حاڵوبارياندا بێ داواکردن تووشی ئەم هەستپێکردنە دەبن و وایان لێ دەکات خۆ لە قێزەونیی هەوا و ئارەزوو بەرز ڕابگرن.

به ئەندازەی ڕوانین لە سـەرەنجامەکان عیشـق لـە دڵـی عاشـق سـووك دەبـێ و، بـە ئەندازەی بەستەڵەکی بیر و زەین نیگەرانی و دڵەڕاوکێ بەهێز دەبێ.

(موتەنەببی) شاعیر وتوویەتی:

لو فكّر العاشق في منتهى حسن الذي يسبيه لم يسبه

ئەگەر عاشق بیری کردبایەوە لەوەی جوانییەکانی مەعشووقەکەی لە ئاییندە چی لێ دێت ئەوا وازی لە عیشقەکەی دێنا و جوانییەکانی مەعشووقەکەی دڵی نەدەبرد...

کۆی ئەوەی ویستم ڕوونی بکەمەوە: سروشتی بێداران هەڵدەکشـێ و بەرزدەبێتـەوە و لەگەڵ کەسێکی جوان و بەرچاو ناوەستێ، هۆی بەرزبوونەوەشی بیرکردنەوەیە لە کەموکورتی و نەنگییەکانی ئـەو کەسـە یـان داواکردنـی شـتێکە لـەو گـرینگتر، دڵـی عاریفان بەرزدەبێتەوە بـۆ مەعرووفەکـەی و لـە ڕاڕەوی پەنـدوەرگرتن دەپەڕێتـەوە، بەڵام بێئاگایان چەقبەستنیان لە دوو حاڵەتەکە و بێئاگاییان لە دوو پایەکە دەبێتـە هۆی بەندبوون و سەرکوتکردن و سەرلێشێوانیان..

## ٦٤- ددانـنان بە کەمتەرخەمیکردن

شتێکم هاتە پێش کە پێویست بوو داوا لە خودا بکەم و لێی بپاڕێمەوە، دوعام کرد و پاڕامەوە، هەندێ کەس لە ئەهلی چاکە لەگەڵ من دەستیان بە دوعا کرد، جۆرێك لە شوێنەواری گیرابوونم دیت..نەفسم پێی وتم: ئەمە بە پاڕانەوەی ئەو بەندەیە بووە نەك بە پاڕانەوەی تۆ...پێم وت: من خۆم ئەو گوناه و کەمتەرخەمییانەم دەزانم کە دەبێتە ڕێگری گیرابوون بەڵام ڕێشی تێدەچێ پاڕانەوەکەی من گیرابووبێت، چونکە وا گومان دەبەم ئەم دوعاخوێنە چاکە ساغ و سەلیم بێت، لەبەرئەوەی لە کەمتەرخەمیم هەست بە شکانەوە دەکەم و بە مامەڵەکردن لەگەڵیدا دڵخۆشی هەیە، ڕەنگە ددانـنان بە کەمتەرخەمی بۆ گیرابوونی پێویستییەکان سەرکەوتووتر بێت، لەبەرئەوەی من و ئەو داوای فەزڵ و بەخشش دەکەین نەك بە کردەوەکانمان، ئەگەر من بە شکانەوە و ددانـنان بە گوناهەکانم وەستام و وتم: بە فەزڵ و بەخششی خۆتان پێم ببەخشن ئەوا لە داواکردنم هیچ شتێکم نییە منەتی پێ بکەم، ڕەنگە ئەوە باشیی کردەوەی خۆی بینیوە و ڕێگری بووە.

ئەی نەفس مەمشکێنە، شکانی زانیاریم بەو بەسە بۆم!

ئەوەندە زانیارییەم هەیە کە ببێتە هۆی ئەدەب و ددانـنان بە کەمتەرخەمی و زۆر پێویستبوون بەوەی داوام کردووە و یەقینم بە فەزڵی داوالێکراو کە لەگەڵ ئەم بەندەیەدا نییە، خودا بەرەکەت بخاتە خواپەرستییەکەیەوە، ڕەنگە ددانـنان بە کەمتەرخەمیم باشتر و تێروتەواوتر بووە.

## ٦٥- بیرکردنەوەی لە نیعمەتەکانی خودا

هەندێ شتی سەیروسەمەرەی زانست و دانایم بەسەر هەندێ کەس خوێندەوە کە بانگەشەی زانستیان دەکرد دیتم لە بیستنی ئەوە دەپەشۆکێت و ناچێتە قووڵاییەکەی و پەرۆشی هیتر و دواتر نییە، ئیتر منیش لە پێ گوتنی شتی تر وازم هێنا و وتم: ئەم زانست و داناییانە شیاوی هۆشمەندێکە کە چەشنی تینوو بۆ ئاو بیقۆزێتەوە..

پاشان لەمەوە ئاماژەیەکم وەرگرت کە بریتییە لەوەی کە ئەگەر ئەم کەسە لەوەی رووبدا تێگەیشتبا و پەسنی کارە باشەکەمی کردبا ئەوا لە لای من رێزی زیاتر دەبوو و، وتە و قسە جوانەکانی خۆم پێ نیشان دەدا بەڵام کاتێ بینیم ئەهلی ئەوە نییە ئیتر لێیم لادا و رووم لێ وەرگێڕا.

ئاماژەکە ئەوە بوو: خوای گەورە ئەم مەخلووقاتەی بە جوانترین دروستکردن و مکومترین ریزبەندی پۆلێن کردوون، پاشان پیشانی هۆش و عەقڵەکانی داوە، هەر هۆشێك باش و ورد لێی وردبۆتەوە ئەوا بە ئەندازەی تێگەیشتنی ستایش کراوە و پۆلێنکار(کە خودایە) خۆشی ویستووە.

بەم جۆرەش قورئانی هەناردووە کە حیکمەت و داناییە نایاب و جوانەکانی تێدایە، هەر کەسێك بە تێگەیشتنەوە پشکنی و لێی روانی و لە خەڵوەتی فیکردا وتووێژی

لەگەڵدا کرد ئەوا ڕەزامەندی خودای بەدەست هێناوە و لە نزیکایەتی ئەو بەهرەمەند بووە، هەر یەکێکیش زەین و هۆشی بە بەرهەستەکان مژوول و ڕۆچوو بوو ئەوا لەو پایە و مەقامە دوور دەخرێتەوە.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿سَأَصْرِفُ عَنْ ءَايَٰتِيَ ٱلَّذِينَ يَتَكَبَّرُونَ فِي ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ﴾ (الأعراف: ١٤٦) واتە: ئەو کەسانەی بەناهەق لەسەر زەوی خۆبەزلزانی دەنوێنن لە ئایەت و نیشانەکانی خۆم ڕوویان وەردەگێڕم.

## ٦٦- باشترین کەس

ڕۆژێك نزام كرد و وتم: خودایە! بمگەیەنە بە ئاواتەکانم لە زانین و کردەوە و تەمەنیشم درێژکە تا بگەم بەوەی کە لەوەدا حەزم پێیەتی.

وەسوەسەیەك لە ئیبلیسەوە بەرهەڵستی کردم و وتی: پاشان چی؟ هەر مردن نییە؟ درێژیی ژیان سوودی چییە؟

پێم وت: ئەی گەمژە! ئەگەر لە ناخی داواکەم گەیشتبای دەتزانی کە فشە و گاڵتە نییە. ئەی لە هەر ڕۆژێك کە زانست و زانیاریم زیاد دەبێ بەرهەمی دەسچێنەکەم زیاد نابێ؟! ئیتر لە ڕۆژی دروێنە و خەرماندا سوپاس دەکرێم! ئایا پێم خۆش بوو بیست ساڵ لەمەوبەر مردبام؟! نە بەخوا، چونکە دەیەکی ئێستا ئەو کات خودام نەدەناسی. هەموو ئەوە بەروبوومی ژیانە کە تێیدا بەڵگەکانی یەکتاییی خودام ڕنی و لە نزمایی تەقلید بەرەو بەرزاییی چاوکرانەوە هەڵکشام و شارەزای زانستگەلێك بووم کە بە هۆیانەوە قەدرم زیاد و نەفسم زێرکفت بوو، پاشان دەسچێن و بەرهەمم بۆ ئاخیرەتم زیاد و بازرگانیم بەهێز بوو بۆ ڕزگارکردنی هاوبەش و تێکەڵبووان.

لە (صەحیحی موسلیم)دا هاتووە کە ئەبوو هورەیرە گێڕایتییەوە، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: ((لا يَزِيدُ الْمُؤْمِنَ عُمْرُهُ إِلا خَيْراً)) واتە: تەمەنی درێژ بۆ ئیماندار هەر خێر و چاکەی بۆ زیاد دەکات..

لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە: (( إن من سعادةِ المرءِ أن يطولَ عمرُه ويرزقَه اللهُ الإنابة))(رواة أحمد و الحاكم) واتە: لە خۆشبەختیی مرۆڤ ئەوەیە کە تەمەنی درێژ بێت و خوداش تەوبە و گەڕانەوەی پێ ببەخشێت))...

## ٦٧- وابەستەبوون بە هۆکارخوڵقێن نەك بە هۆکارەکان

بە هۆی هۆکارەکانەوە دڵی عاریفان غیرەی لێ دەکرێ ئەگەرچی هۆکارەکان لە دڵدا لانە ناکەن، ئەگەر دڵ بۆ ناسینی خودا یەکلا بوویەوە ئەوا خوداش سەرپەرشتیی و چاودێریی کاروبارەکانی ئەو لەئەستۆ دەگرێ، ئەگەر بە هۆکارەکان ڕووبەڕوو بوویەوە ئەوا شوێنەواری هۆکارەکان دەسڕێتەوە. ﴿وَيَوْمَ حُنَيْنٍ إِذْ أَعْجَبَتْكُمْ كَثْرَتُكُمْ فَلَمْ تُغْنِ عَنكُمْ شَيْئًا﴾ (التوبة: ٢٥) واتە: ڕۆژی شەڕی حونەین کە سەرسام بوون بە زۆرییتان بەڵام ئەم زۆرییەتان هیچ سوودێکی پێ نەگەیاندن..

سەرنج بدە حاڵی یەعقوب و ترس و وریایی لە یوسف (سەلامی خوایان لێ بێت) تا ئەوەی وتی: ﴿وَأَخَافُ أَن يَأْكُلَهُ الذِّئْبُ﴾ (یوسف: ١٣) دەترسم گورگ بیخوات، وتیان: ﴿فَأَكَلَهُ الذِّئْبُ﴾ (یوسف: ١٧) گورگ خواردی.. کاتێکیش دەرگای خۆشی بە ڕوویدا کرایەوە (یەهودا) کراسەکەی یوسفی بۆ هێنا (با) پێشی کەوت ﴿إِنِّي لَأَجِدُ رِيحَ يُوسُفَ﴾ (یوسف: ٩٤) هەست بە بۆنی یوسف دەکەم.

هەروەها قسەی یوسف بۆ مەیگێڕەکە ﴿اذْكُرْنِي عِندَ رَبِّكَ﴾ (یوسف: ٤٢) لە لای خاوەنەکەت باسم بکە و بیری بخەوە..بە مانەوەی حەوت ساڵ لە زیندان سزا درا، ئەگەرچی یوسف دەیزانی کە بەبێ ئیزنی خودا ڕزگاربوون نییە و دەسگرتن بە هۆکارەکان ڕێپێدراوە بەڵام غیرە کاری کردە سەر سزاکە!

هەر لەم بارەوە چیرۆكی (مەریەم) هەیە (سەلامی خوای لێ بێت) ﴿وَكَفَّلَهَا زَكَرِيَّا﴾ (آل عمران: ٣٧) زەكەرییا بەخێوكردنی گرتە ئەستۆ..هۆكارخولقێن لە هاونشینیی هۆكارەكان غیرەی كرد﴿كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيْهَا زَكَرِيَّا الْمِحْرَابَ وَجَدَ عِندَهَا رِزْقًا﴾ (آل عمران: ٣٧) هەر كاتێ زەكەرییا دەچووە لای لە میحرابەكەیدا خۆراكی لە كن دەبینی.. لەم ڕووەوە لە پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) گێڕدراوەتەوە كە فەرموویەتی: ((خوای گەورە ڕۆزی بەندە ئیماندارەكەی بە جۆرێك دەدا كە هیچ حیسابی بۆی نەكردبێت.)) زانایان ئەم فەرموودەیە بە زۆر لاواز دادەنێن.

هۆكارەكان ڕێگایەكن هەردەبێ بگیرێنەبەر، عاریف و خواناس هاونشینی هۆكارەكان نابێ بەڵام ئەوەی بۆ ئەو لەبارەیەوە دەردەكەوێ بۆ غەیری وی دەرناكەوێ لەوەی كە هاونشین نابێ، ڕەنگە ئەگەر بەلایدا وەرچەرخێنێ سزاش بدرێ ئەگەر مەیلێك بێت خودا قەبوولی نەكات، بەڵام كەمترین هەڵە و ساتمە ئەدەب پێویست دەكات.

سەرنج بدە لە سەرەنجامی (سولەیمان) (سەلامی خوای لێ بێت) كاتێ وتی: ((ئەمشەو بەسەر سەت ژندا دەسووڕێمەوە كە هەر یەكێكیان كوڕێكی ببێت، نەیوت: إن شأء الله! هیچكام لە ژنەكان ئاووس نەبوون تەنها یەكێكیان نەبێ ئەویش كوڕێكی سەقەتی هێنا!))

دۆخێك ڕووی تێ كردم كە وای پێویست كرد وابەستەی هەندێ هۆكار بم بەڵام ئەوە وای دەخواست كە دیداری هەندێ ستەمكار بكەم و بە وشەیەك موداراتی بكەم، كاتێ بیرم لەم حاڵە دەكردەوە قورئانخوێنێك هاتە لام و دەستی كرد بە قورئان

خوێندن، بەوەی خوێندی گەشبین بووم: ﴿وَلَا تَرْكَنُوٓاْ إِلَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ فَتَمَسَّكُمُ ٱلنَّارُ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِنْ أَوْلِيَآءَ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ﴾ (هود: ١١٣) واتە: مەیل مەکەن بۆ لای ئەوانەی ستەمیان کردووە چونکە ئاگر دەتانگرێ و بێجگە لە خودا هیچ دۆستێکتان نییە و پاشانیش یارمەتی نادرێن..

لە وەڵامدانەوەی ئەم بیر و خەیاڵەم واقوڕمام و بە خۆم وت: گوێ بگرە! من لەم موداراتە داوای یارمەتی و سەرکەوتنم کرد قورئان پێی ڕاگەیاندم ئەگەر ئەمن مەیل بۆ ستەمکار بکەم ئەو سەرکەوتنەم لەدەست دەچوو کە لەپێناویدا ئەم مەیلەم کرد.

خەنی لەو کەسەی هۆکارخوڵقێنی ناسی و پێوەی وابەستە بوو، ئەوە مەبەستی هەرە باڵایە، لە خودا دەپاڕێینەوە پێمانی ببەخشێ.

## ٦٨- ئیماندار لەنێوان گوناه و تەوبەدا

ئیماندار زیادەڕەوی لە تاواندا ناکات، بەڵکوو هەندێ جار ئارەزوو زاڵ دەبێ و ئاگری شەهوەت گڕ دەگرێ ئیتر ئەویش شۆڕدەبێتەوە بەڵام ئەوەندە ئیمانەی هەیە کە گوناهی لەبەر چاو کرێت بکات و نەیەوێ ئەنجامی بدات و دوای لێبوونەوەشی نیازی ئەوەی نییە بۆی بگەڕێتەوە، ئەگەر تووڕەش بوو بەدوای تۆڵەکردنەوەدا ناگەڕێ و بەر لە خلیسکان و گوناه نیازی تەوبەی هەیە. سەرنجی براکانی یوسف بدە، بەر لە دوورخستنەوەی یوسف بڕیاری تەوبەیان دابوو، وتیان: ﴿ٱقۡتُلُواْ يُوسُفَ﴾ یوسف بکوژن، پاشان ئەوەیان بە گەورە زانی و وتیان: ﴿أَوِ ٱطۡرَحُوهُ أَرۡضٗا﴾ یان دووریخەنەوە بۆ شوێنێکی تر، پاشان بڕیاری گەڕانەوە و پەشیمانبوونەوەیان دا و وتیان: ﴿وَتَكُونُواْ مِنۢ بَعۡدِهِۦ قَوۡمٗا صَٰلِحِينَ﴾ دوای وی دەبنە پیاوی چاك، کاتێکیش بردیانە بیابان بە هۆی ئەو ئیرەیییەی لە دڵیاندا بوو ویستیان بیکوژن بەڵام براگەورەکەیان وتی: ﴿لَا تَقۡتُلُواْ يُوسُفَ وَأَلۡقُوهُ فِي غَيَٰبَتِ ٱلۡجُبِّ﴾ (یوسف: ٩ - ١٠١٠) یوسف مەکوژن، فڕێیدەنە ناو بیرەوە، نەیویست بمرێ بەڵکوو هەندێ ڕێبوار هەڵیگرنەوە، ئەوانیش بە قسەی ویان کرد..

هۆکاری ئەم حاڵ و دۆخانە ئەوەیە کە ئیمان بەگوێرەی بەهێزییەکەی نەفس سەرکوت دەکات، جارێك لە کاتی هەوڵدا دەیگەڕێنێتەوە، جارێك لە کاتی بڕیاردا، جارێك لە هەندێ کردەوە، جا ئەگەر بێئاگایی زاڵ بوو و گوناهەکەی کرد، سروشت سارد دەبێتەوە، ئیتر ئیمان بۆ کارکردن هەڵدەسێتەوە، زۆر زیاتر لەوەی چێژی وەرگرتووە ئازاری پەشیمانی دەچێژێ.

## ٦٩- باشترین شت ومدەسهێنانی زیاتری زانسته

باشـترینی شـتەكان زیـادكردنی زانسـت و زانیارییـە. هـەر كەسـێك تـەنها بەوەنـدە زانسـتەی دەیزانـێ وازی هێنـا و پێـی وابـوو ئەوەنـدە بەسـە ئـەوا خودپەسـند و لـەخۆڕازی دەبـێ و خۆبەلزانییەكـەی دەبێتـە ڕێگـر لـە سـوودوەرگرتن، گفتوگـۆ و وتوویژ بۆی دەردەخات كە هەڵەیە، ڕەنگە لـە دڵـی خەڵكدا گـەورەكراو بووبێـت و كەس بوێری وەڵامدانەوەی نەبووبێت، ئەگەر ئـەو سـوودوەرگرتنی دەرخسـتبا ئـەوا كەموكورتییەكانی پێشكەش دەكرا و وازی لێ دێنان.

(ئیبن عەقیل) لـە (ئـەبی ئەلمـەعالی ئـەلجوەینی) گێڕاوەتـەوە كـە وتوویـە: خـودای گەورە كۆی شتەكان دەزانێ و وردەكارییەكان نازانێ!

نازانم چ گومانێك لە ڕووی ئەم داماوە قەوماوە تا ئەمە بڵێت!

هـەروەها (ئـەبوو حامیـد ئەلغـەزالی) كـاتێ وتوویـەتی: (النـزول التنقـل، والاسـتواء مماسة)..

چۆن ئەمە بە تێگەیشتن یان ئەمە بە زوهد وەسف بكەم كە نازانێ لەبارەی خوداوە چ شتێ دروست و ڕێپێدراوە و چ شتێكیش نـا؟! ئەگـەر ئـەو وازی لـە خۆبەگـەورە

زانین بهێنایە ئەوا فەریکە نووسەر ڕایەکەیان بەرپەرچ دەدایەوە و ڕاستیی ئەوانی بۆ دەردەکەوت.

هەر لەم بوارەدا، (ئەبووبەکر کوڕی میقسەم) کتێبێکی بە ناوی ((الاحتجاج)) بۆ قورئانخوێنان داناوە، هەندێ شتی باشی تێدایە بەڵام زانستەکەی بەوە تێکداوە مۆڵەتی خوێندنەوەی هەندێ ئایەتی بە شێوەیەك داوە کە قەت ئەوها نەخوێنراوەتەوە، پاشان وەهای شێواندووە تا ڕێی بە خوێندنەوەی وا داوە کە واتای ئایەتەکە بگۆڕێت وەکوو ئەم ئایەتە: ﴿فَلَمَّا ٱسۡتَيۡـَٔسُواْ مِنۡهُ خَلَصُواْ﴾ یوسف: ٨٠)

وتوویەتی: دەشێ لێرەدا بوترێ: ﴿نَجِيًّا﴾ واتە: بەڕێز و بێتاوان لە دزییەکە ڕزگاربوون!

ئەمە خراپ تێگەیشتنە لە چیرۆکەکە، ئەوەی دزی درایە پاڵی و شتەکەشی لە کن دەرکەوت ڕزگار نەبوو، ئیتر ڕزگاربوونیان سوودی چییە؟! چیرۆکەکە بۆ ئەوە هێنراوەتەوە تا ڕوونی بکاتەوە کە ئەوان جودا بوونەتەوە و ڕاوێژیان لەنێوان خۆیاندا کردووە کە چی بکەن و چۆن بگەڕێنەوە لای باوکیان لە کاتێکدا براکەیان گیراوە، لێرەدا چ باسێکی ڕزگاربوون هەیە؟!

هەر کەسێ سەرنجی کتێبەکە بدات، لەم بابەتە ناشرینانە زۆر دەبینێ کە ناژمێردرێن، ئەگەر گوێی لە زانایانی سەردەمەکەی بگرتایە و وازی لە خۆ گەورەکردن بهێنایە ئەوا ڕاستی بۆ دەردەکەوت. بەڵام تەنها ڕازیبوونی بەوەندە زانستەی هەیەتی و تێکەڵکردنی بە جۆرێك لە خۆبینی و خودپەسندی لە گەیشتن بە ڕاستی گیری کرد..پەنا بە خوا دەگرین لەوە..

## ٧٠- خواپەرستی، سوپاسگوزاری دەوێ

لەم ئایەتەی خوای گەورە ڕامام: ﴿يَمُنُّونَ عَلَيْكَ أَنْ أَسْلَمُوا ۖ قُل لَّا تَمُنُّوا عَلَيَّ إِسْلَامَكُم ۖ بَلِ اللَّهُ يَمُنُّ عَلَيْكُمْ أَنْ هَدَاكُمْ لِلْإِيمَانِ﴾ (الحجـرات: ١٧) واتــە: منــەتی ئــەوەت بەســەردا دەکەن کە موسڵمان بوون، بڵێ: منەتی موسڵمانبوونتانم بەسـەردا مەکـەن، بـەڵکوو خودا منەتی ئەوەتان بەسەردا دەکات کە بۆ ئیمان ڕێنوێنی کردوون..

لەم ئایەتەدا واتایەکی سەیرم دیت کە بریتییە لەوەی: کاتێ ئەوان هۆش و ئاوەزیان پێ بەخشرا، بە هۆیـەوە سـەرنجی کـەموکورتی بتـەکانیان دا و زانیـان بـۆ پـەرستن ناشێن، ئیتر پەرستنیان ئاراستەی ئەو زاتە کرد کە شتەکانی دروست کردووە، ئـەم زانین و زانیارییـە بـەری ئـەو هۆشـە پێبەخشـراوە بـوو کـە بـە هۆیـەوە لـە ئـاژەڵان جیاکرانەوە، جا ئەگەر باوەڕیان هێنا بەو کارەیان کە هۆشە پێبەخشراوەکە بانگی بۆ کردوون ئەوا ڕێز و قەدری پێبەخشراوەکەیان نەزانیوە و بێ ئاگا بوون لەو زاتەی پێی بەخشیون. هەر شتێکیش لە بەر و درەختەکە موڵکی ئەوان نییە؟!

بینا لەسەر ئەمە: هـەر خواپەرست و کۆششـکارێك لـە زانسـت و کـار بـە ڕووناکیی ئاگایی و هێزی تێگەیشـتن و ئـاوەز ڕاسـتییەکی دیتـووە و داواکـراوی دۆزیوەتـەوە، پێویستە سوپاسـی ئـەو زاتـە بکـات کـە لـە تاریکـاییی دەروونـدا تروسـکاییەکی بـۆ ناردووە.

لەم هونەرەوە ئەم فەرموودەیەی باسی سێ کەسەکە دەکات کە چوونە نێو ئەشکەوتێکەوە و گابەردێك خلۆر بۆوە و دەرگای ئەشکەوتەکەی لێ گرتن، وتیان: با بە کردەوە چاکەکانمان لە خودا بپاڕێینەوە و (توسل) بکەین! هەر یەکێك لەوان وتی: ئەمە و ئەوەم کرد...باسی کردەوە باشەکانیان کرد.(بۆ درێژەی چیرۆکەکەیان دەتوانی سەیری کتێبەکانی فەرموودە بکەیت بەتایبەتی بوخاری و موسلیم)..

ئەمانە ئەگەر تێبینی ئەو نیعمەتەیان کردبێت کە خودا لە پاراستن لە تاوان پێی بەخشی بوون ئیتر هەر بەو نیعمەت پێ بەخشینە لە خودا پاڕانەوە، ئەگەریش تێبینی کردەوەکانیان کردبێت و سەرنجی دەرەنجامەکەیان دا و پێیان وابوو کە ئەوان ئەو کردەوانەیان کردووە ئەوا ئەوان ئەهلی بزرن نەك ئامادە، وەڵامدانەوەی داواکارییەکەشیان بۆ بڕینی شانازییە بەردەوامەکانیان بووە.

نموونەی ئەمە دیتنی تەقواکارە بۆ تەقواکەی، تا ئەوەی پێی وایە کە ئەو لە زۆرێك لە خەڵك باشترە، ڕەنگە سووك بڕوانێتە تاوانکاران و خۆی لەسەریان بە گەورە بگرێ! ئەمە بێئاگاییەکە لە ڕێی ڕەفتارەوە و ڕەنگە خاوەنەکەی لە ڕێ لابدات.

پێت ناڵێم: وەك خۆبەکەمزانینێك تێکەڵی تاوانکاران بە! بەڵکوو لە ناخەوە لێیان تووڕەبە و لە ڕوواڵەت پشتیان تێکە، پاشان سەرنجی قەدەر بە سەریانەوە بدە.

زۆربەیان نازانن سەرپێچی کێی کردووە و مەبەستیان یاخیبوون نییە بەڵکوو دەیەوێ بەگوێی ئارەزووی بکات و پێشی ناخۆشە سەرپێچی بکات! هەیانە تەمای

لێخۆشبوون و ئارامیی خودا بەسەریدا زاڵ بووە، لەبەرئەوەی یەقینی بە لێخۆشبوون زۆر بەهێزە بۆیە گوناهەکانی بەلاوە سووك و سادەیە! هەموو ئەمانە بۆی بیانوو نین.

بەڵام تۆ ئەی خاوەن تەقوا! سەرنجی بدە و بزانە بەڵگە لەسەر تۆ زیاترە نەك ئەو، چونکە تۆ ئەو زاتە دەناسیت کە سەرپێچی دەکەیت و دەزانیت چ کردەوەیەك دەکەیت، بەڵکوو سەیری هەڵگێڕو وەرگێڕی دڵەکان لەنێو دوو پەنجە(ی خودا) بکە، ڕەنگە دۆخەکە بگۆڕێ و تۆ ببیتە لە خوادابڕاو و ئەویش ببێتە پەیوەست.

سەیر ئەو کەسەیە کە شانازی بە کارێکی باشی خۆی دەکات و ئەو زاتە لەبیر دەکات کە دەسباری کردووە.

## ٧١- عەقیدەی ڕاست

بزانە شەرعەکەمان بنچینەکان (أصول)ی پتەو و بنەماکان(قواعد)ی پارێزراون، هیچ کەموکورتی و نارێکییەکی تێدا نییە، هەروەها هەموو شەریعەتەکان وان، بەڵام لە لایەن بیدعەکاران یان نەزانانەوە تێکدان و بەڵا دەچێتە نێو ئایینەوە.

وەکوو ئەوەی لە مەسیحییەکانەوە هاتووە کاتێ زیندووبوونەوەی مردووانیان لەسەر دەستی پێغەمبەر عیسا دیت سەرنجی ئەو کارەیان دا کە لە نەریتی مرۆڤ بەدەرە و لێی ناوەشێتەوە ئیتر بکەریان (مەبەست عیسایە) نیسبەت دایە لای خوایەتی و ئەگەر سەرنجی زاتی ئەویان دابایە دەیانزانی کە ئەو لە چەندان کەموکورتی و ئاتاجی پێکهاتووە، ئەم ئەندازەیەش بەسە بۆ شیاونەبوونی خوایەتیی ئەو، ئەوکات دەزانرا کە ئەوەی لەسەر دەستی وی ڕوویداوە کاری غەیری وییە.

لە شتە لاوەکییەکانیش هەروایان کرد: وەکوو گێڕدراوەتەوە مانگێك بەڕۆژووبوون بەسەر مەسیحییەکاندا فەرز کرا ئەوان بیست ڕۆژی تریان بۆ زیادکرد، پاشان بە ڕاوبۆچوونی خۆیان خستیانە وەرزێکی دیاریکراوی ساڵ.

هەر لەم ڕووەوە جوولەکەکانیش هەڵیت و پەڵیتیان لە بنچینە و لقەکاندا(أصول و فروع)دا زۆرە.

ئوممەتی ئیسلامیش لە هەندێ ڕێبازی گومڕایی نزیك بۆتەوە ئەگەرچی زۆربەیان لە شیرك و گومان و ناكۆكیی دیار و قێزەون پارێزراون چونكە ئەوان ژیرترین و تێگەیشتووترینی ئوممەتانن، بەڵام شەیتان هەندێك لە گومڕایی نزیكی خستوونەتەوە و تەمای نقوومكردنیانی نەكردووە ئەگەرچی هەندێكیانی لە دەریای گومڕاییدا نقووم كردوون.

ئەوەش وەكوو ئەوەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پەڕتووكێكی بەڕێزی لە نك خوداوە هاوردووە كە لەبارەی سیفەتی ئەم كتێبەوە وتراوە: ﴿مَا فَرَّطْنَا فِي الْكِتَابِ مِنْ شَيْءٍ﴾(الانعام: ٣٨) واتە: لەم كتێبەدا هیچ شتێكمان فەرامۆش نەكردووە..

ئەگەر شتێكیش لێڵ و ئاڵۆز بێت پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ڕوونی كردۆتەوە هەروەكوو وتراوە: ﴿لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ﴾(النحل: ٤٤) واتە: ئەوە ڕوون بكەیتەوە كە بۆ خەڵك هاتووەتە خوارەوە..دوای ڕوونكردنەوەش پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە فەرموودەیەكی صەحیحدا فەرموویەتی: ((لەسەر ڕێیەكی ڕووناك دامناون))..

ئیتر دوای ئەوە خەڵكێك هاتوون بە ڕوونكردنەوەی ئەو قایل نەبوون و بە ڕێبازی هاوەڵانی ڕازی نەبوون، گەڕان و لێكۆڵینەوەیان كرد، پاشان دابەش بوون:

هەیانە ئەوەی شەرع هەوڵیداوە لە دڵان بیچەسپێنێ ئەوان هاتوون سڕیویانەتەوە، قورئان و فەرموودە خودا بە وەسفگەلێك دەچەسپێنن كە لە دڵاندا جێگیر بێت،

وەکوو ئایەتی: ﴿ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ﴾(الاعراف: ٥٤) واتە: لەسەر عەرش جێگیربوو...هەروەها ئایەتی: ﴿بَلْ يَدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ﴾(المائدة: ٦٤) واتە: بەڵکوو دەستەکانی کراوەن...هەروەها ئایەتی: ﴿وَلِتُصْنَعَ عَلَى عَيْنِي﴾(طه: ٣٩) واتە: بەبەرچاوی منەوە پەروەردە و بەخێوبکرێیت..هەروەها ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کە دەفەرموێت: ((خودا بۆ ئاسمانی دونیا دێتەخوارەوە)) یان ((دەستی بۆ تاوانباری شەو و ڕۆژ واڵا دەکات)) یان پێ دەکەنێت و تووڕە دەبێت..

هەموو ئەم شتانە – ئەگەرچی ڕوواڵەتیان پێکچوواندن دێنێتە خەیاڵ – بەڵام مەبەست لێیان چەسپاندنی هەبوویەکە(موجود)، کاتێ شەرع زانی کە لە کاتی بیستنی ئەمانە وەهم و خەیاڵ ڕوودەکاتە دڵ، ئەو وەهمەی بەم ئایەتە بڕی: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ﴾ (الشورى: ١١) واتە: هیچ شتێك وەکوو ئەو (خودا) نییە..

پاشان ئەمانە گەڕانەوە لای قورئان کە موعجیزەی هەرە گەورەیە و شەرع بڕیاری بوونی داوە و فەرموویەتی: ﴿إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ﴾ (القدر: ١) واتە: ئێمە قورئانمان ناردووەتە خوارەوە.. ﴿نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلْأَمِينُ﴾ (الشعراء: ١٩٣) واتە: جیبریل قورئانی لەلایەن خوداوە هاوردووە.. ﴿فَذَرْنِى وَمَن يُكَذِّبُ بِهَٰذَا ٱلْحَدِيثِ﴾ (القلم: ٤٤) واتە: وازیان لێ بێنە و بۆ منیان بەجێ بهێڵە ئەو کەسەی ئەم قورئانە بەدرۆ دەخاتەوە و باوەڕی پێ ناکات..بەم ئایەتەش قورئانی لە دڵان چەسپاندووە: ﴿بَلْ هُوَ ءَايَٰتٌۢ بَيِّنَٰتٌ فِى صُدُورِ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ ۚ وَمَا يَجْحَدُ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ (العنكبوت: ٤٩) واتە: لە دڵی ئەوانەی زانستیان پێ دراوە..لەبارەی پەڕاوەکانی قورئانیش فەرموویەتی: ﴿فِى لَوْحٍ مَّحْفُوظٍۭ﴾ (البروج: ٢٢) واتە: قورئان لە تابلۆیەکی پارێزراودایە..هەروەها

فەرموودەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کە وتوویەتی: ((قورئان مەبەنە خاکی دوژمن)) بوخاری و موسلیم گێڕاویتیانەوە.

هەندێ لەم کەسانە وتوویانە: قورئان خولقێنراو (مخلوق)ە! حورمەت و ڕێزی قورئانیان لە دڵان نەهێشت و وتیان: نەهاتووەتە خوارەوە و هاتنەخوارەوەشی خەیاڵ ناکرێ! چۆن سیفەت لە وەسفکراو (موصوف) جودا دەبێتەوە لە کاتێکدا لە پەڕاوی قورئاندا تەنها مەرەکەب و پەڕ هەیە؟! ئیتر ئەوەی شەرع هەوڵی چەسپاندنی دابوو ئەوان سڕیانەوە.

هەروەك وتیان: خوای گەورە لە ئاسمان نییە! ناشوترێ: لەسەر عەرش جێگیر بوو! بۆ ئاسمانی دونیاش نایەتە خوارەوە! بەڵکوو ئەوە ڕەحمەتەکەیەتی!

ئەوەی دەویسترا لە دڵان جێگیر بکرێ ئەوان سڕیانەوە! ئەمەش مەبەستی شەرعدانەر نییە..

هیتر هاتن و لەو سنوورە نەوەستان کە شەرع دیاری کردووە بەڵکوو بە ڕاوبۆچوونی خۆیان کاریان تێدا کرد و وتیان: خودا لەسەر عەرشە و بەم ئایەتەی خودا قەناعەتیان نەهات: ﴿ثُمَّ اسْتَوَىٰ عَلَى الْعَرْشِ﴾ (الأعراف: ٥٤)..

هەندێ خەڵکیش لەلایەن پێشینانیانەوە هەندێ شاردراوەیان بۆ شاردنەوە و بێباوەڕەکانیش فەرموودەیان بۆ هەڵبەستن، ئیتر ڕەوا و ناڕەوایان لێ تێکەڵ بوو و نەیانزانی جوێیان بکەنەوە، بەهۆیانەوە سیفەتگەلێکیان چەسپاند کە زۆربەی ڕاستەکەیان لە فراوانخوازیی زمانی عەرەبەوە هاتووە، ئەوانیش ڕووالەتیان وەرگرت، وەکوو ئەو نموونەیەی مەلا مەشهووریان لێ هات کە دایکی پێی وت:

دەرگاکە بپارێزە! ئەویش دەرگاکەی دەرهێنا و بردی! ئیتر دز هات و ئەوەی لە ماڵەکەدا هەبوو حەپەلووشی کرد! دایکی سەرکۆنەی مەلا مەشهووری کرد، ئەویش وتی: ئەتوو وتت دەرگاکە بپارێزە، خۆ نەتوت: ماڵەکە بپارێزە!

کاتێ وێنەیەکی گەورەیان لەسەر عەرشدا هێنایە بەر خەیاڵ ئیتر دەستیان کرد بە تەئویل بە جۆرێك پێچەوانەی بوونی خودایە لەسەر عەرش، وەکوو ئەو فەرموودەیەی لەبارەی خوداوە دەفەرموێت: ((ئەگەر بەندەکەم بە ئاسایی بێت بۆ لام ئەوا من بە نەرمەغار بۆی دەچم.)) بوخاری و موسلیم گێڕاویتیانەوە.

وتوویانە: مەبەست لەمە نزیکبوونەوەی نزیك نییە بەڵکوو مەبەست نزیکبوونەوەی پایە و ڕێزە...لەبارەی ئەم ئایەتەش: ﴿إِلَّآ أَن يَأۡتِيَهُمُ ٱللَّهُ فِي ظُلَلٖ﴾ (البقرة: ٢١٠) واتە: مەگەر خودا لەنێو هەوردا بۆیان بێت..وتوویانە: هاتنی زاتی خودا بە ڕوواڵەت لێکدەدرێتەوە..ساڵێك حەڵاڵی دەکەن و ساڵێکیش حەرامی دەکەن.
بە ئیزافە و درانەپاڵەکانی خوداش دەڵێن سیفات، (فوو — النفخ) و (گیان — الروح) دراوەتەپاڵ خودا.

خوڵقاندن بە (دەست)یان بۆ ئەو چەسپاندووە، ئەگەر بیانوتایە: ئادەمی بە قودرەتی خۆی خوڵقاندووە ئەوا نەدەکرا نکووڵی لەمە بکرێت بەڵام وتیان: ئەوە سیفەتێکە تەنها بۆ ئادەم بەکاری هێناوە، ئیتر چ سیفەتێك بۆ ئادەم دەبوو؟! ڕوانینیان بۆ گەورەیی ئادەم بێئاگای کردن لە ڕوانین بۆ ئەوەی چ شتێك شیاوی خوای گەورە و چ شتێکیش شیاوی گەورەیی ئەو نییە، بۆ خودا (دەست لێدان) و (کارکردن بە ئامرازەکان) دروست نییە، بەڵکوو ئادەمی خستۆتە پاڵ خۆی.

وتیان: ناوی شێوه بەسەر خودای گەورە دادەبڕین لەبەر ئەو فەرموودەیەی کە دەڵێت: ((خودا ئادەمی لەسەر شێوە و وێنەی خۆی خوڵقاندووه.)) بوخاری و موسلیم گێڕاویتیانەوە..ئەم تێگەیشتنەشیان لەم فەرموودەیە هێناوە کە دەڵێت: (( إِذَا ضَرَبَ أَحَدُكُمْ فَلْيَجْتَنِبِ الْوَجْهَ، وَلَا يَقُلْ: قَبَّحَ اللهُ وَجْهَكَ وَوَجْهَ مَنْ أَشْبَهَ وَجْهَكَ، فَإِنَّ اللهَ تَعَالَى خَلَقَ آدَمَ عَلَى صُورَتِهِ)) بوخاری و موسلیم گێڕاویتیانەوە..واتە:ئەگەر یەکێکتان دەستی وەشاند با لە ڕووخسار نەدات و نەشڵێت: خودا ڕووی تۆ و ئەوەی بە تۆش دەچێت ناشیرین و ڕەش بکات، خوای گەروە ئادەمی لەسەر شێوەی خۆی دروست کردووه..

ئەگەر مەبەست خودا بووایە ئەوا ڕووخساری خودا لە ڕووخساری ئەم نەیارە دەچوو چونکە فەرموودەکە وەها هاتووه..

هەروەها هاتوون فەرموودەیەکی لاوازیان هێناوە کە دەڵێ: ((إن آخر وطئة وطأه الله بوجّ)) لەبارەی گواستنەوە و ژیاننامە و فەرموودەی پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) هیچیان نەزانیوە کە دەڵێت: ((اللهُمَّ اشْدُدْ وَطْأَتَكَ عَلَى مُضَرَ))... مەبەست لەوەی یەکەم کۆتا شەڕە کە موسڵمانان لە (وەج) کردیان کە بریتییە لە شەڕی حونەین.. وتوویانە: ئەم فەرموودەیە بە ڕوواڵەت وەردەگرین و خوای گەورە پێی ناوەتە ئەم شوێنە ! !بێگومان لای ئەوان خودا لە زەوی بووە و پاشان چووەتە ئاسمان! !((مەبەستی دانەر ئەوەیە ئەوان وشەی (وطئة)یان بە قاچ دانان لە شوێنێك لێکداوەتەوە))..

هەروەها لەبارەی فەرموودەی ((فَإِنَّ اللهَ لاَ يَمَلُّ حَتَّى تَمَلُّوا)) بوخاری و موسلیم گێڕایتیانەوە، وتوویانە: دروستە خودا بە بێزاربوون وەسف بکرێ..ئەوان تەنانەت لە زمانیش شارەزا نین دەنا مەبەست لەم فەرموودەیە ئەوەیە: ئەگەر ئەوانیش بێزار بن خودا هەر بێزار نابێ..

هەروەها لەبارەی فەرموودەی ((الرحم شجنة من الرحمان تتعلق بحقوي الرحمان)) واتە: سیلەی ڕەحم بەشێکە لە خودا، خۆی بە کەمەری خودا هەڵواسیوە، وتوویانە: کەمەر سیفەتی زاتە.

فەرموودەگەلێکیان گێڕاوەتەوە کە تەنانەت ئەگەر لەبارەی شکانی دەسنوێژیشەوە گێڕدرابانەوە قەبووڵ نەدەکران و هەمووشیان لەلایەن بێباوەڕانەوە دانراون.

هەروەها لە (عەبدوڵڵای کوڕی عەمرو)یان گێڕاوەتەوە کە وتوویە: ((خوای گەورە فریشتەکانی لە ڕووناکیی قۆڵەکان و سینگ چێ کردووە)) (ئەمە قسەی عەبدوڵڵایە و فەرموودەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نییە، بەپێی وتەی (شێخ ئەلبانی) بێت ئەم جۆرە قسانە لە ئیسرائیلیاتن و پەیوەندییان بە فەرموودەوە نییە).

وتوویانە: ئەمە بە ڕوواڵەت وەردەگرین، پاشان هاتن خەڵکی ڕەشۆکی(عەوام)یان ڕازی کرد بەم قسەیەیان کە دەڵێن: دەست و پێ و ئەندامەکان ناچەسپێنین! وەکوو ئەوەی دەڵێن: فلان وەستاوە و وەستاویش نییە! (ناشەلێت پای شکاوە!).

لەمەشدا ڕاجیاییان هەیە: ئایا دەوترێ خودا دانیشتووە یان وەستاوە؟ وەکوو ئەو ئایەتەی خوای گەورە: ﴿قَآئِمَۢا بِٱلۡقِسۡطِۚ﴾ (آل عمران: ١٨)..

ئەمانــە لــە مــەلا مەشــهوور ناتێگەیشــتووترن چــونکە ئایــەتی: ﴿قَآئِمَۢا بِٱلۡقِسۡطِۚ﴾ مەبەســت لێــی بــەپێوە وەســتان نییــە، بــەڵکوو وەکــوو ئەوەیــە کــە دەوتــرێ: مــیر دادپەروەرە..

لەبەرئەوە باسی هەندێ لە قسەکانم کردن تاوەکوو دڵ بۆ هــیچ شــتێکیان نــەبزوێت، ئیتر دەبێ لەمانە وریابین، نە تێگەیشتنیان هەیە نـە خواپەرستی. ڕێگـا هـەر ڕێـی پێشینانی چاکە و من پێت دەڵێم: (ئەحمەدی کوڕی حەنبەل) ڕەحمـەتی خـوای لـێ بێت وتوویەتی: (نیشـانەی کـەمی زانسـتی پیـاو ئەوەیـە لـە دینیـدا لاسـایی پیـاوان بکاتەوە). نابێ لە بنچینەکان (أصول)دا گوێ لە هیچ شتێکی ئەو کەسانە بگریت کـە لە دڵاندا گەورە کراون، ئەگەر شتێکت لێیان بیست کە هاوڕێکی بنچینە دروسـتەکان نەبوو بڵێ: ئەمە لە گێڕەرەوە (الراوي)ە، چونکە سەلماوە کە ئیمامی ئەحمـەد هـیچ شتێك لە ڕاوبۆچوونی خۆی ناڵێت، ئەگەر وامان دانا کە قسەکە هـی ئـەوە، ئـەوا لـە بنچینەکان (أصول)دا نـە لاسـایی ئـەو و نـە ئەبووبـەکر و عومـەر (خـودا لێیـان ڕازی بێت) ناکرێت.

ئەمە بنچینەیەکە (أصل) دەبێ بینای لەسەر بکەین، ئیتر باسکردنی کەسـێك کـە لـە دڵان گەورە کراوە سەرسام و تۆقیوت نەکات.

مەبەست لە ڕوونکردنەوەی ئەمە ئەوەیە کە ئایینەکەمان ساغ و سـەلامەتە، بـەڵکوو خەڵکێك شتگەلێکیان تێ خستووە کە ئێمە بە هۆیەوە ئازارمان پێ گەیشتووە.

## ٧٢- لەبارەی زاهید و سۆفییانەوە

زاهیدەکان شتی وایان خستۆتە ناو ئایینەوە کە خەڵك لە ئایین دوور دەخاتەوە تەنانەت خەڵك کردەوەی زاهیدەکان دەبینێ و ئایینی لە کن سەخت دەبێت و ڕێگای گەیشتن بە خودا بە دوور دەزانێت.

زۆرترینی ڕێنوێنیکارانی ئەم ڕێگایەش چیرۆکخوێنەکانن، ئەگەر ڕەشۆکییەك بچێتە نێو کۆڕیانەوە کە هێشتا نازانێ بەباشی دەسنوێژ بگرێت کەچی ئەوان لەبارەی قسە وردەکانی (جونەید) و ئاماژەکانی (شبلی) قسەی بۆ دەکەن، ئەو ڕەشۆکییەش وا دێتە بەرچاوی کە ڕێگای ڕوون ئەوەیە گۆشەیەك بگریت و واز لە نان پەیداکردن بۆ خێزان بێنیت و لە خەڵوەتدا موناجاتی خودا بکەیت، ئەوە لە کاتێکدا ئەم داماوە ڕوکنەکانی نوێژ نازانێ و زانست پەروەردەی نەکردووە و تێکەڵبوونی لەگەڵ زانایان ڕەوشتی ڕاست نەکردۆتەوە ! !

گوێدرێژ چەند سوود لە تەویلە دەبینێ، ئەویش هەر ئەوەندە سوود لە خەڵوەتەکەیەوە دەبینێ، ئەگەر ماوەیەك لە کەمخۆری و کەمخەوی بەردەوام بێت ئەوا وشك دەبێتەوە و بێتاقەت دەبێت، ڕەنگە بە هۆی تووشبوونی بە مالیخولیاوە (مێشك تێکچوون) تارمایی و ڕەشکەوپێشکەی چاوی لێ ببێتە فریشتە، پاشان

سەری کز بکات و دەستی بۆ ماچکردن درێژ بکات! !(واتە خۆی لێ ببێتە پیاوچاك و نزیکەخوا! !)..

چەندان جووتیارمان دیت وازی لە کشتوکاڵ هێنا و لە گۆشەیەك دانیشت و تەنبەڵ و تەوەزەل لێی پاڵدایەوە! ئەگەر پێی بوترێ: سەردانی نەخۆشێك بکە! دەڵێ: عادەتم نییە..نەفرەتی خودا لە عادەتێك کە پێچەوانەی شەریعەت بێت..ڕەشەخەڵك پێیان وایە ڕێگای شەرع ئەو قسانەیە چیرۆکخوانەکان دەیڵێن نەك ئەوەی زانا تێگەیشتووەکان لەسەرین، ئیتر دەکەونە نێو گومڕاییەوە..زاهید هەیە بایەخ بەوە نادات بە شەرع کاری کردووە یان نا! ! پاشان نەزانەکانیان لە یەکتر جودان، هەیانە ڕێڕەوی بەرهەڵدایی گرتووە و دەڵێت: نابێ بەرهەڵستی شێخ بکرێت و ئیتر لە سەرپێچی و گوناه ڕۆدەچێت! ! هەیانە نهێنی خۆی دەپارێزێ و بە بێ زانست و زانیاری فەتوا دەدات نەوەك بوترێ شێخ نازانێت!

(شێخ ئەبوو حەکیم) بۆی باس کردم کە: (شەریف دەحالی) – خەڵك سەردانیان دەکرد و بە پیرۆزیان دەزانی – ڕۆژێك هاتە کنم و پرسی: ئایا ژنێك سێ بە سێ تەلاقدرا بێت ئەگەر کوڕێکی بوو دروستە بگەڕێتەوە لای پیاوی یەکەمی؟ گوتم: ناوەڵلا..گوتی: بێدەنگبە، سوێند بە خوا لێرەوە تا بەسرە فەتوام بۆ خەڵك داوە کە دروستە!

هەروەها (شێخ ئەبوو حەکیم) بۆی گێڕامەوە کە: باپیری (ئازاد حەدداد) ژنێك هاتە لای و لە پیاوێك مارەی کرد و لە تەواوبوونی (عیددە)ش لێی نەپرسی، دادوەر ڕەخنەی لێ گرت و ڕێگەی پێ نەدا و ژن و پیاوەکەی لێك جیاکردەوە و سەرکۆنەی

ئەو کەسەشی کرد کە لە یەکتری مارە کردوون، ژنەکە تووشی ئازاد حەدداد بوو لێی پرسی: گەورەم! ئەمن ژنێکم هیچ نازانم، باشە ئەتوو کوو ئەمنت مارە کرد؟! کابرا وتی: واز لە قسەی ئەوان بێنە! ئەتوو خاوێن و پاکبووەوەیت!!

زانایەك باسی پیاوێکی عابیدی بۆ کردم کە سالانێك لە نوێژدا سوژدەی سەهووی دەبرد و دەیوت: وەڵڵاهی سەهووم نەکردووە بەڵام وەکوو خۆپارێزییەك ئەوە دەکەم! زاناکەش پێی وت: هەموو نوێژەکانت پووچەڵ بوون چونکە لە خۆتەوە سوژدەیەکی ناڕەوات زیاد کردووە!

ڕێگای سۆفییەکان یەکێکە لەو نەخۆشی و شتە نامۆیانەی هاتۆتە نێو ئایینەکەمانەوە، ئەوان ڕێگاگەلێکیان گرتۆتەبەر کە زۆربەیان پێچەوانەی شەریعەتە و دیندارەکانیان هەندێ شت کەم و سووك دەکەن، ئەمەش شەرع نییە. تەنانەت پیاوێکی نزیك لە سەردەمی من پێی دەوترا(کثیر)، هاتە مزگەوتی (مەنصوور) و وتی: بەڵێنێکم بە خوادا و شکاندم، بۆیە نەفسم پابەند کرد کە تا چل ڕۆژ هیچ نەخۆم! ئەوانەی بینیبوویان بۆیان باس کردم کە ١٠ ڕۆژ مایەوە و پاشان لە دەی چوارەم نزیکی مردن بوویەوە، بەڵێنەکەی نەشکاند تا گەیشتە لێواری مردن، ئیتر ئاوی دەرخوارد درا، گوێمان لە قوڵپەقوڵپی ئاوەکە بوو، پاشان دوای چەند ڕۆژێك مرد!!

تەماشای ئەم داماوە بکەن ببینن نەزانییەکەی چی بەسەرهێنا؟!

هەشیانە جڵەی بۆ خۆی شلکردووە و هەرچی خۆشیی و چێژێك حەزی پێ بووە کردوویە و لە تەسەووفدا هەر بەوەندە قایل بووە کە کراس و شەرواڵ و مێزەرێك بپۆشێت، ئیتر سەیری ئەوەی نەکردووە لەکوێ دەخوات و دەخواتەوە، لەگەڵ دونیادۆستان و ئاوریشمپۆشان و مەیخۆران تێکەڵ بووە ئەوەش تەنێ بۆ پاراستنی ماڵ و پایەی.

هەیانە هەندێ ڕەفتار دەکەن کە لە وشەگەلێك وەریانگرتووە کە زۆربەیان ساغ نەبوونەتەوە و ڕاست نین!!

هەیانە خووی داوەتە گوێگرتن لە گۆرانی و سەما و یاری، پاشان ئەمانە دابەش بوون: هەیانە بانگەشەی عیشق دەکات و هەشیانە توانەوە، هەیانە لە ڕووی ئارەزوو و یارییەوە گوێ دەگرێ، هەردوو ڕێگاکەش بەتەواوی ڕەشەخەڵك تێکدەدات و بەرەو خراپەیان دەبات.

مەبەست ئەوەیە بزانیت کە شەرع تێروتەواوە، ئەگەر تێگەیشتنت لەبارەیەوە پێدرا ئەوا شوێن پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) و هاوەڵانی دەکەویت و واز لە ڕێچکە و کوێرەڕێیان دێنیت و لە ئایینەکەتدا لاسایی پیاوان ناکەیتەوە، ئەگەر ئەمەت کرد ئەوا تۆ پێویستت بە ئامۆژگارییەکی تر نییە.

لەمانەش وریابە: چەقبەستوویی زانست گوێزەرەوەکان، کراوەیی و شلڕەویی موتەکەلیمەکان، سەرەڕۆیی زاهیدەکان، چلێسیی ئارەزووپەرستەکان، ئەو

زانایانەی تەنها بە شێوە و ڕووكەشی زانست وازدێنن بۆ ئەوەی كار بكەن، هەروەها كاری بۆ زانیاریی عابیدەكان.

هەر كەسێك خودا بە لوتفی خۆی پاڵپشتی بكات ئەوا تێگەیشتنی پێ دەبەخشێ و لە كۆت و بەندی چاولێكەری دەری دێنێ و دەیكاتە پێشەوای سەردەمی خۆی، گرینگیی بە گاڵتە و سەرزەنشتی كەس نادات و جڵەوی خۆی تەسلیمی ڕێبەرەكەی كردووە.

خوای گەورە ئێمە و ئێوەش لە لاساییكردنەوەی زلكراوەكان بپارێزێت و شوێنكەوتنی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بخاتە نێو دڵمانەوە...

## ٧٣- تەقوا بنچینەی سەلامەتییە

بزانە کە زەمان لەسەر یەك بارودۆخ نامێنێتەوە هەروەکوو خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَتِلْكَ ٱلْأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيْنَ ٱلنَّاسِ﴾ (آل عمران: ١٤٠) واتە: دونیا هەر ڕۆژەی بۆ یەکێکە و وەکوو ئەنگوستیلە وایە هەر ڕۆژەی لە دەستی یەکێکە..
جاریٚ هەژاری و کەڕەتیٚ دەوڵەمەندی، گاهیٚ پایەداری و چەڵیٚ زەلیلی، جاریٚ دۆستان دڵخۆش دەبن و کەڕەتێکیش دوژمنان بە شکستت شادمان دەبن.

بەختەوەر کەسێکە کە لە هەموو بارێکدا دەست بە یەك بنچینەوە بگریٚ ئەویش ترس و تەقوای خودایە، ئەگەر دەوڵەمەند بوو ئەم تەقوایە جوانی دەکات و ئەگەریش هەژار کەوت دەرگاکانی ئارامگری بە ڕوودا دەکاتەوە، ئەگەر ساغ و سەلامەت بوو ئەوا نیعمەتی تەواوی بەسەردا ڕژاوە و ئەگەریش گرفتار بوو ئەوا خۆڕاگری پیٚ دەبەخشیٚ، نزمبوونەوە یان بەرزبوونەوە یان ڕووت و ڕەجاڵی یان تێری یان برسێتی زیانی پیٚ ناگەیەنیٚ، چونکە هەموو ئەم شتانە دەڕۆن و دەگۆڕێن..تەقوا ئەسڵ و بنچینەی سەلامەتییە، پاسەوانێکی بێدارە، لە کاتی کەوتن دەستت دەگریٚ و هەڵت دەستێنێتەوە و لە سنووربەزاندن ڕێت لیٚ دەگرێت.

داماو ئەو کەسەیە کە دەسکەوتنی چێژێك لەگەڵ بیٚ تەقوایی فریوی بدات، چونکە چێژەکە دەڕوات و بە دۆڕاوی بەجێی دێڵێت..

له هەموو بارێکدا پەیوەستی تەقوا بە، ئیتر بەمە تۆ لە تەنگانەدا خۆشی و فراوانی، لە نەخۆشی هەر ساغی دەبینی، ئەمە دیاریی دونیایە و پاداشتی ئایندەش دیار و زانراوە.

## ٧٤- بەری ئارامگرتن

سەرنجی شتێکی سەیر و بنچینەیەکی جوانم دا کە بریتییە لە داباڕینی بەڵا و تاقیکردنەوە بەسەر ئیماندار و پێ نیشاندانی شێوەی چێژەکان لەگەڵ توانای وەدەسهێنانی، بەتایبەتی ئەوەی لە بەدەسهێنانیدا هیچ ئەرکێکی نییە وەکوو بوونی خۆشەویستێکی هاوڕێك لە خەڵوەتێکی تۆکمە و پارێزراودا.

وتم: پاك و بێگەری بۆ خودا! ئا لێرەدا کاریگەری و شوێنەواری ئیمان دەردەکەوێ نەك لە دوو ڕەکات نوێژ. سوێند بە خوا پێغەمبەر یوسف تەنها و تەنها بەمە پلەوپایەی بەرز بۆوە و مەزن بوو.

بۆ خاتری خوا براکانم، سەرنجی حاڵی (یوسف) بدەن ئەگەر هاوئاوازی ئارەزووی بووایە دەبووە کێ و چی دەبوو؟ لە نێوان ئەو حاڵەتە و حاڵەتی ئادەم پێوانە بکەن پاشان بە تەرازووی عەقڵ سەرەنجامی ئەو هەڵەیە و ئەم ئارامگرتنە بکێشن و تێگەیشتنی حاڵەکە بکەنە ئامرازێك بۆ هەر ئارەزوو و حەزێك..

چێژ و خۆشی دەخرێتە بەردەم ئیماندار، هەر کاتێ لە ڕیزی شەڕدا تووشی بوو بەڵام سەربازی ڕامان لە سەرەنجام بە هانایەوە نەهات ئەوا تێکدەشکێ.

خەریکە ئەو کەسە دەبینم کە کەوتۆتە نێو هەندێ لە داو و تەڵەکانییەوە و بە زمانی حاڵ پێی دەڵێ: لە شوێنی خۆت بوەستە، تۆ و ئەوەی بۆ خۆت هەڵتبژاردووە...سەرەنجامەکەی هەر پەشیمانی و گریانە..ئەگەر لەم چاڵە هاتەدەر ئەوا بە ساغی نایەتەدەر..چەندان کەس قاچی خلیسکا و دواتر هەڵنەستایەوە..هەر کەسێ سەرنج بداتە زەلیلیی براکانی یوسف ئەو کاتەی وتیان: ﴿وَتَصَدَّقْ عَلَيْنَآ﴾ (یوسف: ٨٨) خێرمان پێ بکە، شوومیی هەڵە و خلیسکان دەزانێ، هەر کەسێ لە حاڵوباریان ڕابمێنێ جیاوازییەکانی نێوانیان دەزانێ، ئەگەرچی تەوبەیان قەبووڵ کرا بەڵام کراسی پینەکراو وەکوو هی ساغ نییە..ڕەنگە ئێسکێك کە شکا یەکنەگرێتەوە، ئەگەر یەکیشی گرتەوە ئەوا بەلاوازی..براکانم، لە نمایشی حەزبزوێن و ئارەزووەکان وریابن و جڵەوی ئەسپەکان باش توند بکەن، وریا بن کاتێ هەور لەسەر بەرزاییەك کەڵەکە دەکات ڕەنگە بەرچاوی ڕێبوار بگرێ و سەرەنگرێ ببێت..

## ٧٥- ڕازی دواکەوتنی وەڵامدانەوەی نزا

سەرنجی حاڵەتێکی سەیرم دا ئەویش ئەوەیە کە ئیماندار کاتێ تووشی بەڵایەك دەبێت زۆر بەگەرمی نزا و دوعا دەکات بەڵام هیچ شوێنەوارێکی وەڵامدانەوە نابینێ، ئەگەر لە بێئومێدی نزیك بوویەوە ئەوا ئەو کات تەماشای دڵی دەکرێ: ئەگەر بە قەدەر ڕازی بێت و لە بەخششی خودا بێهیوا نەبووبێت ئەوا ئەو کات بە زۆری وا ڕوودەدات دوعاکەی خێرا وەڵام بدرێتەوە چونکە لێرەدا ئیمان شەیتان تێك دەشکێنێت، پلەوپایەی پیاوان دەردەکەوێ..لەم ئایەتەشدا ئاماژە بۆ ئەمە کراوە: ﴿حَتَّىٰ يَقُولَ ٱلرَّسُولُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ مَتَىٰ نَصۡرُ ٱللَّهِۗ﴾ (البقرة: ٢١٤) تاوەکوو پێغەمبەر و هاوەڵەکانی دەڵێن: کەی یارمەتیی خودا دێت؟

هەروەها ئەوەی بەسەر پێغەمبەر یەعقوب (سەلامی خوای لێ بێت) هات کاتێ کوڕێکی لێ ون بوو و ماوەیەکی زۆر درێژەی کێشا بێئومێد نەبوو، ئەم جارە کوڕێکی تریشی بردرا کەچی هەر لە فەزڵی خودا بێهیوا نەبوو و وتی: ﴿عَسَى ٱللَّهُ أَن يَأۡتِيَنِي بِهِمۡ جَمِيعًاۚ﴾ (یوسف: ٨٣) بەدڵنیاییەوە خودا هەمووانم بۆ دەگەڕێنێتەوە.

هەروەها پێغەمبەر زەکەریا(سەلامی خوای لێ بێت) وتی: ﴿وَلَمۡ أَكُنۢ بِدُعَآئِكَ رَبِّ شَقِيّٗا﴾ (مریم: ٤) واتە: خودایە هەرگیز لە گیرابوونی دوعاکانم بێهیوات نەکردووم.
ئامان نەکەی ماوەی وەڵامدانەوە و گیرابوونی دوعا بە زۆر و درێژ بزانیت!

وەها بۆ خودا بڕوانە کە ئەو خاوەنی هەموو شتێکە و لە بەڕێوەبردن و ئەنجامدانی کارەکاندا دانایە و لەبارەی سوود و بەرژەوەندەکانەوە زانا و شارەزایە، وەها بڕوانە کە ئەو دەیەوێ تاقیت بکاتەوە و گەرەکێتی لالانەوەت ببینێ و بە هۆی ئارامگرتنتەوە پاداشتت بداتەوە، هیتریش..دەیەوێ بە دواخستنی وەلامدانەوە تاقیت بکاتەوە تا شەڕی وەسوەسەی شەیتان بکەیت، هەر یەکێك لەم شتانە زیاتر یەقینت بە فەزڵی وی بەهێز دەبێت و سوپاسی دەکەیت کاتێ بە بەلا تۆی شیاند تا ئاوڕ لە داواکردن لەو بدەیتەوە، هەزاریی ناچاربوون بۆ پەنابردن بۆ ئەو هەموو دەوڵەمەندییەکە.

## ٧٦- چێژ تەنها مەبەستی باڵا نییە

لەبەرئەوەی جەستەی مرۆڤ بە بێ دەسخستنی شتە باشەکان و دوورخستنەوەی زیانبەخشەکان ڕاستەڕێ نابێت بۆیە ئارەزووی تێدا چێندرا تاوەکوو ببێتە هۆی وەدەسهێنانی سوودەکان، هەروەها تووڕەییشی تێدا چێندرا تاوەکوو ببێتە هۆی دوورخستنەوەی شتە ئازاردەرەکان.

ئەگەر حەزی خواردن نەبووایە خۆراکی نەدەخوارد و جەستەی دامەزراو نەدەبوو بۆیە حەز و ئارەزووی خواردنی بۆ دانراوە، ئەگەر ئەوەندەی دەست کەوت کە جەستەی ڕابگرێت ئەوا ئارەزووەکە نامێنێت.

خواردنەوە و پۆشاك و پەڕین (سەرجێی)یش هەروایە.. سوودی پەڕین (سەرجێی) لە دوو ڕووەوەیە: یەکەم: مانەوەی ڕەگەزی مرۆڤ کە ئەمە زیاتر مەبەستە. دووەم: فڕێدانی ئەو ئاوە زیادەی کە هێشتنەوەی زیانی هەیە! (ئەمە زانیاری سەردەمی دانەر بووە بەڵام ئێستا زانستی نوێ وەها نالێ).

ئەگـــەر ئـــەو ئـــارەزووەی حـــەزی پـــەڕین دەبزوێنـــێ لـــە مرۆڤـــدا نەچـــێنرابایە ئـــەوا کـــەس ئـــارەزووی پـــەڕینی نـــەدەکرد و ئـــیتر مـــرۆڤ لەناودەچـــوو و کەســـی ئاوهـــەڵگریش زیـــانی پـــێ دەگەیشـــت..بەڵام زانایـــان لـــە مەبەســـتەکە تـــێ گەیشـــتوون وەلێ نەزانـــەکان لەگـــەڵ شـــەهوەت و ئـــارەزوو هاوئـــاواز بـــوون و لـــە مەبەســـتی دانـــانی نەگەیشـــتن، تەمـــەن و کاتیـــان لـــەوەی ســـوودی نییـــە بـــەفیڕۆ چـــوو و ئـــەوەیان لەدەســـت چـــوو کـــە بـــۆی خولقـــابوون و ئارەزووەکانیـــان بـــەرەو تێکچـــوونی مـــاڵ و لەناوچـــوونی ئـــابڕوو و ئـــایینی بـــردن پاشـــان بەرەو ماڵوێرانی.

چـــەندان دەوڵەمەنـــدمان دیـــت زیـــادەڕەوی کـــرد لـــە کڕینـــی کـــەنیزەك تـــاوەکوو حـــەز و ئـــارەزووی بـــە هـــی نـــوێ ببزوێنێـــت، بـــەڵام زۆری پـــێ نەچوو کە هێز و توانا بنجییەکەشی لاواز بوو و زوو لەناوچوو.

هـــەروەها بینیمـــان ئـــەوەی تـــووڕەیی زۆر بـــوو و لـــە ســـنوور دەرچـــوو زیانی بە خۆی و ئەوەی خۆشی دەویست گەیاند و لەناوی برد.

هـــەر کەســـێك زانـــی کـــە ئـــەم شـــتانە بـــۆ ئـــەوە دروســـت کـــراون تـــا لـــە بڕینـــی قۆناغـــەکانی دونیـــا هاوکـــاریی جەســـتە بکـــات و تـــەنها بـــۆ خـــودی چـــێژ وەرگـــرتن نـــەخولقێنراوە و چـــێژی وەکـــوو فێڵێـــك تێـــدا دانـــراوە تـــا ســـوودی پـــێ بگەیـــەنێ ئـــەوا بەرچـــاوڕوون دەبـــێ، ئەگـــەر مەبەســـت هـــەر

خۆشی بووایە ئەوا نەدەکرا ئاژەڵان لەم بابەتەدا بەشیان لە مرۆڤ زیاتر بێت.

خۆشی بۆ ئەو کەسەی لە ڕاستییەکان تێگەیشتووە و حەز و ئارەزوو لە تێگەیشتنی حیکمەتی مەخلووقات لارەڕێی نەکردووە..

## ٧٧- دوو جۆر خەڵك

هەرکەسێك سەرنج بداتە سەرەنجامی گوناھ و سەرپێچییەکان ئەوا دەبینێ چەندە قێزەونن..بیرم لە خەڵکێك کردەوە کە دەیانناسم، دان بەوەدا دەنێن کە داوێنپیسی و شتی تریش دەکەن، هیچ سنوورێك نازانن دەڵێی بەرگی تاریکییان پۆشیوە، دڵەکان لێیان دوور دەکەونەوە، ئەگەر دەوڵەمەند بن بەزۆری لە ماڵی خەڵکە، ئەگەریش دەستەنگ بن ئەوا نارەزایی بەرانبەر قەدەر دەردەبڕن. ئیتر بەم پیس و پۆخڵانە لە یادی ئاخیرەت بێئاگا بوون.

پاشان پێچەوانەم کردەوە و بیرم لە خەڵکێك کردەوە کە لە بەرانبەر حەز و ئارەزووەکان ئارامیان گرت و ئەوەی حەڵاڵ نەبوو وازیان لێ هێنا لە: خواردنی بەتام و جێی خۆش و ژیانی بەچێژ و پلەوپایەی گەورە، ئەگەریش تووشی تەنگانە بوونایە ئارامیان دەگرت و بە قەدەری خودا ڕازی بوون.

ئیتر بەم جۆرە لە فەرموودەی خوای گەورە گەیشتم: ﴿إِنَّهُۥ مَن يَتَّقِ وَيَصْبِرْ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُحْسِنِينَ﴾ (یوسف: ٩٠) واتە: هەر کەسێ تەقوای خودا بکات و ئارام بگرێ ئەوا خودا پاداشتی چاکەکاران ون ناکات..

## ٧٨- وابەستەی تەنها دەرگای خودا بە

پێویستە لەسەر مرۆڤی ژیر هەمیشە و لە هەموو حاڵ و بارێکدا وابەستەی دەرگای خودا بێت، لە کاتی خەڵوەتدا ئەو بکاتە هاودەم و ئەگەریش هەستی بە تەنیایی کرد با بۆ هەڵگرتنی هۆکاری هەستکردن بە ترس و تەنیایی هەوڵ بدات، هەروەك شاعیر دەڵێ:

أُستوحِشُ أنتَ مما جنيتَ فأحسِن إذا شئتَ واستأنس

لەوەی کردووتە هەست بە تەنیایی و ترس دەکەیت، ئەگەر دەتەوێ ئەم ترس و تەنیاییەت نەمێنێ چاکە بکە و هاودەم پەیداکە.

مرۆڤ ئەگەر بینی نەفسی ئارەزووی بەرەو دونیا هەیە ئەوا داوای دونیا لە خودا دەکات، ئەگەریش بۆ ئاخیرەت هەیەتی ئەوا داوا دەکات یارمەتی بدرێت تا کاری بۆ بکات، ئەگەر ترسا ئەوەی لە دونیا دەیەوێ زیانی بۆی هەیە ئەوا داوا لە خودا دەکات دڵی چاك بکات و چارەسەری نەخۆشییەکەی بکات، ئەگەر چاك بوو ئەوا داوای شتێك نەکات کە ئازاری دەدات..هەر کەسێك ئاوا بوو ئەوا لە ژیانێکی خۆش دایە. بەڵام پابەندبوون بە تەقوا لە پێویستیی ئەم حاڵەیە، چونکە تەنها بە تەقوا هاودەمیبوونی خودا دێتەدی. تەقوادارەکان دەسبەرداری هەموو شتێك دەبن تەنها پەنابردن و داواکردن لە خودا نەبێت.

گێڕدراوەتەوە کە (قوتەیبەی کوڕی موسلیم) کاتێ لە شەڕدا ڕووبەڕووی تورکەکان وەستا ژمارەی زۆر و بەهێزییان ترسی بە دڵدا هێنا بۆیە وتی: کوا (محەمەدی کوڕی واسیع)؟ وترا: وا لەوپەڕی بەری دەستە ڕاستی سوپایە، پاڵی داوەتە سەر کەوانەکەی و پەنجەی بۆ ئاسمان بەرز کردۆتەوە. قوتەیبە وتی: ئەم تاکە پەنجەیە لام خۆشەویستترە لە سەت هەزار شمشێری هەڵکێشراو و تیری تیژ!

کاتێ بەسەر تورکاندا سەرکەوتن، قوتەیبە پێی وت: چیت دەکرد؟ وتی: سەرجەم ڕێگاکانم بۆ دەگرتیت (واتە دوعام بۆ دەکردیت).

## ٧٩- گرنگیی پاراستنی نهێنی و شاردنەوە

پێویستە لەسەر کەسێك کە نیعمەتەکانی خودای بەسەردا باری و لێی نمایان بوو تەنها شوێنەوارەکەی دەربخات نەك هەمووی، ئەمە لە گەورەترین خۆشییەکانی دونیایە کە دەبێ دەسبەرداری ببێت چونکە چاوپیسی ڕاستە و هەیە. ئەز سۆراغی نیعمەتەکانم کرد دیتم دەرخستنیان بۆ نەفس شیرین و چێژبەخشە، بەڵام تەنانەت ئەگەر بۆ دۆستیش دەربخرێت ئەوا دوور نییە لە ناخەوە هەست بە قین و تووڕەیی بکات، ئەگەریش بۆ دوژمن دەرخرا ئەوا لەبەر ئێرەیی ڕەنگە تووشی چاوپیسی ببێت! بەڵام من پێم وایە خراپەی حەسوود هەمیشە هەیە، لە حاڵی بەڵادا دڵی خۆش دەبێت و لە حاڵی نیعمەتیشدا چاوپیسی دەکات!

سوێند دەخۆم ئەوەی نیعمەتی بەسەردا ڕژاوە حەز دەکات حەسوودەکەی تووڕە بکات بەڵام جێی دڵنیایی نییە کە نیعمەتەکەی تووشی مەترسی دەکات چونکە بە زۆری وادەبێ کە حەسوودەکە بە چاوپیسی دەیپێکێت، ئیتر چێژ وەرگرتن لە تووڕەکردنی حەسوود و تووشبوونی ئەو بە چاوپیسی وەکوو یەك نییە.

لە هەموو بارێکدا شاردنەوەی شت و نهێنییەکان کاری کەسە خاوەن بڕیار و یەکلاکەرەوەکانە: ئەگەر تەمەنی خۆی ئاشکرا بکات ئەگەر گەورە بوو بە پیری دادەنێن و ئەگەریش گچکە بوو سووك بۆی دەڕوانن. ئەگەر بیروباوەڕی خۆی

ئاشكرا كرد دژەكانی دوژمنایەتی دەكەن. ئەگەر داهاتی خۆی ئاشكرا كرد، ئەگەر كەم بوو سووك سەرنجی دەدەن و ئەگەریش زۆر بوو حەسوودی پێ دەبەن. لەبارەی ئەم سێ شتەوە شاعیر دەبێژێت:

احفظ لسانك لا تبح بثلاثة    سن ومال ما استطعت ومذهب

فعلى الثلاثة تبتلى بثلاثة    بمموه و بمخرق و مكذب

واتە: زمانت بپارێزە و سێ شت ئاشكرا مەكە: تەمەن و ماڵ و مەزهەب، چونكە بە هۆی ئەم سێیەوە گرفتاری سێ جۆرە كەس دەبیت: شێوێنەر و حەپەساو و بەدرۆخەرەوە.

ئەوەی باسم كرد بیكە پێوەر بۆ ئەوەی باسم نەكردووە و لەو دەمشڕ و چەنەبازە كاڵ و نەزانانە مەبە كە هیچ نهێنییەكیان ناپارێزن تا ئەوەی بە كەسانی نەشیاوی دەڵێن! ڕەنگە قسەیەك بەسەر زماندا بێت بە هۆیەوە مرۆڤ سەری تێدا بچێت.

## ٨٠- پەندی ساتمە

دیتم هەر کەسێك ساتمە لە شتێك دەکات یان لە کاتی باراندا خلیسك دەبات ئاوڕ دەداتەوە لەو شتەی ساتمەی لێ کردووە و تەماشای دەکات: یان بۆ ئەوەی وریای بێت ئەگەر جارێکی تر بەسەریدا ڕۆیشت یان بۆ ئەوە تەماشای دەکات کە نەیتوانیوە خۆی لە شتێکی وەها بپارێزێ؟! لەوەدا ئاماژەیەکم وەرگرت و وتم: ئەی ئەو کەسەی چەندان جار ساتمەت کردووە! ئایا بینیت چ شتێك ساتمەی پێ کردوویت تا لە هاوشێوەی وی خۆت بپارێزی یان ئەو ڕووداوەت لە خۆت ناشرین دیتبێ؟! زۆربەی ئەوانەی ئاوڕ لە شتەکە دەدەنەوە واتای ئاوڕدانەوەکەیان ئەوەیە کە چۆن کەسێکی وەکوو من — لەگەڵ خۆپاراستنیدا — لەو شتەی دەیبینم ساتمەم کردووە؟!

سەیر لە تۆ! ساتمەت لە فلان گوناه و فلان تاوان کرد! شتێکی ڕازاوە کە بە عەقڵ ناوەڕۆکەکەی دەزانیت و بە چاوی بیرت سەرەنجامەکەی دەبینیت چۆن فریوی دایت؟! چۆن شتێکی لەناوچووت باودا بەسەر شتێکی هەمیشەیی؟! چۆن بە کەم و زیان فرۆشتت؟! چۆن چێژی خەوێکت هەڵبژارد بەسەر ئاگایی مامەڵەیەك؟!

ئاخ بۆ تۆ! بەوەی فرۆشتت کۆڵێك باری پەشیمانی وەهات کڕی کە هیچ پشتێك ناتوانێ هەڵیگرێ و سەرێکی بەرزت نزم کردەوە و دەریایەك فرمێسکی خەم لەسەر

کردەیەوەکی ناشیرینی وەها کە هەر نابڕێتەوە.. لە هەمووی ناشیرینتر پێت بوترێ: بە چی؟! لە پێناو چی؟! ئەمە لەسەر چی؟ ئەی ئەو کەسەی لەخۆباییبوون پەڕاوەکەی لەسەر هەڵگێڕاوەتەوە و بۆی کێشاوە و تەرازووەکەش پەکی کەوتووە..

## ٨١- تەقوا بەختەوەریی دونیا و ڕزگاربوونی دواڕۆژە

لەم ئایەتەی خوای گەورە ورد بوومەوە کە دەفەرموێت: ﴿مِّنِّي هُدًى فَمَنِ ٱتَّبَعَ هُدَايَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشْقَىٰ﴾ (طه: ١٢٣) واتە: هەر کەسێك شوێن ڕێنوێنی و بەرنامەی من کەوت ئەوا نە گومڕا دەبێ و نە بەدبەخت..

ڕاڤەکارانی قورئان وتوویانە: مەبەست لە ﴿هُدًى﴾ پێغەمبەر و قورئانە. من بە ڕاستی و حەقیقەت بینیم کە هەر کەسێك شوێن قورئان و سوننەت بکەوێت و کاریان پێ بکات ئەوا بێگومان لە گومڕایی سەلامەت دەبێت و بەدبەختیی قیامەتیشی لەکۆڵ دەبێتەوە ئەگەر لەسەر ئەوە مرد، هەروەها چارەڕەشیی دونیاش کە هەر بەدبەخت نابێ، ئەمەش ئەم ئایەتەی خودا ڕوونی دەکاتەوە: ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّهُۥ مَخْرَجًا ۝٢﴾ (الطلاق: ٢) واتە: هەر کەسێك تەقوای خوا بکات ئەوا دەروویەکی لێ دەکاتەوە.

ئەگەر تووشی تەنگانە بوو ئەوا یەقینێکی وەهای بە پاداشت هەیە کە گوڕاڵك لە کنی دەبێتە هەنگوین، وەگەرنا لە هەموو بارێکدا خۆشگوزەرانی زاڵ دەبێ.

بە زۆریش تووشی ناخۆشی نابێ مەگەر لە ڕێی تەقوا لابدات، بەڵام ئەو کەسەی ڕێی تەقوا دەگرێت نە ئافەتێك لە دەرگای دەدات و نە بەڵایەك تووشی دەبێ، ئەمە زاڵترینە.

ئەگەر لەگەڵ تەقوادا كەمێك بەڵا ڕووی تێ كرد ئەوا بەزۆری ئەوە بە هۆی گوناهێكەوەیە و لەسەری سزا دراوە.

ئەگەر وامان دانا بێ گوناه و تاوانە ئەوا لەبەرئەوەیە زێڕی ئارامگرتنی خراوەتە نێو كوورەی بەڵاوە تا بە زێڕێكی خاوێن و پوخت دێتەدەرێ، ئیتر شیرینیی سزا دەبینێ چونكە دەبینێ كەسی گرفتار لە چ بەڵایەكی بەئازاردایە.

(ئەلشیبلی) وتوویە: خەڵك لەبەر بەخشش و نیعمەتەكانت تۆیان خۆشویستووە بەڵام من لەبەر بەڵایەكانت خۆشمدەوێیت.

## ٨٢- تاوان چێژی نییه

تەنها سەرخۆشی بێئاگا چێژ لە گوناه و تاوان دەکات، بەڵام ئیماندار چێژ وەرناگرێ لە کاتی چێژ لێ وەرگرتن ئاڵای حەرام و سزا بە ڕوویدا دەشەکێتەوە. ئەگەر زانست و زانیاری بەهێز بوو ئەوا بە چاوی زانیارییەکەی نزیکیی خودا دەبینێ کە نەهی ئەم کارەی لێ کردووە ئیتر لە کاتی چێژوەرگرتنی ژیانی لێ دەبێتە ژەهری مار.

ئەگەریش مەستیی ئارەزوو بەسەریدا زاڵ بوو ئەوا دڵ بەم چاودێرییانە توند و گوشراو دەبێ. ئەگەر بە سروشتیش شەهوەتی بۆی هەبێ ئەوا هەر ساتێکە و پاشان تووشی پەشیمانییەکی بەردەوام و گریانێکی بێوچان و داخ و خەفەتێکی دوورودرێژ دەبێ، تەنانەت ئەگەر یەقینیشی هەبێ کە عەفوو کراوە بەڵام هێشتا ترسی سەرزەنشت بەرەو ڕووی وەستاوە.

ئۆف لە دەست گوناه و تاوان! شوێنەوارەکانی چەند ناشیرین و هەواڵەکانی چەند خراپن! هیچ شەهوەتێك نایەتەدی تەنها بە ئەندازەی هێزی بێئاگایی نەبێ.(واتە چەند بێئاگا بیت ئەوەندە زیاتر بەدوای شەهوەتەوە دەبیت).

## ٨٣- له فرتوفيڵەكانى شەيتان

ڕۆژێك بۆ خەڵوەت بەيانى زوو چووم بۆ مزگەوتى (ئەلروصافه)، بەتەنيا دەسوڕامەوە و بيرم لەم جێگايە و ئەو زانا و پياوچاكانه دەكردەوە كە لێى بوون، هەندێ كەسم ديت تێيدا نيشتەجێ بوون، لە يەكێكيانم پرسى: چەند دەبێت لێرەيت؟ ئاماژەى بە نزيكەى (٤٠) چل ساڵ كرد! ديتم لە ژوورێكى پيس و پۆخڵدايە، بيرم لەم ماوەيە كردەوە كە خۆى لە پەڕين (النكاح) بێبەش كردووە!!

نەفس دەستى كرد بە ستايشكردنى ئەمە و زەمكردنى دونيا و دەسخەڕۆبوون پێى..زانست ڕەخنەى لە نەفس گرت و تێگەيشتن لە ڕاستيى شتەكان و بابەتى شەرع پاڵپشتى قسەكانى زانستى كرد، لێرەدا بابەتەكەم بۆ ڕوون بۆوە و بە نەفسم گوت: بزانە ئەمانە دوو جۆرن:

جۆرى يەكەم: هەيانە بۆ ئارامگرتن لەسەر ئەم بارودۆخانە جيهادى نەفسى خۆى دەكات، ئيتر باشييەكانى تێكەڵبوون لەگەڵ زانايان و منداڵ و سوودگەياندن بە خەڵك و بە خۆى بە تێكەڵبوونى لەگەڵ تێگەيشتووان لەدەست دەچێت، بەم چەشنە وەكوو جۆرێك لە كێوى لێ دێت، تەنێ لەبەر تەنيايى حەز بە تەنيايى دەكات، ڕەنگە سروشتى وشك و ڕەوشتى

خــراپ ببێــت، لەوانەیــە بــە هــۆی قەتیســکردنی ئاوەکەیــەوە تووشــی ژەهراویبــوون بــبێ کــە جەســتە و ئــاوەزی تێکبــدات، ڕەنگــە خــەڵوەت تووشــی وەسوەسـەی بکـات، لەوانەیـە وا گومـان ببـات کـە ئـەو لـە پیاوچـاکانە و بـەوەی دەیزانــێ پێویســتی بــە هــیچ نییــە، ڕەنگــە شــەیتان هەنــدێ شــتی بێنێتــە بــەر خـەیاڵ کـە ئـەو بـە کـەڕاماتی دابنـێ! ! لەوانەیـە گومـانی وابـێ کـە ئـەو حاڵـەی ئـەو تێیدایـە ئامـانج و مەبەسـتە و ناشـزانێت کـە لـە کەڕاهـەت نـزیکترە چـونکە پێغەمبـەری خـوا (صـلی الله علیـه وسـلم) نـەهی کـردووە لـەوەی پیـاو بـە تـەنیا بخــەوێت، ئەوانــەش هــەموویان بەتــەنیا دەنــوون! وە نەهیشــی کــردووە لــە هاوســەرگیری نــەکردن، ئەمــەش هاوســەرگیری نەکردنــە! وە نــەهی کــردووە لــە ڕەبــەنێتی و دابــڕان لــە خــەڵك و چۆڵنشــینی..ئەمانە لــە فرتوفێڵــەکانی ئیبلیســە کە بە چەندان ڕووی پەنهان و نادیار تووشی تەڵەزگەی گومڕاییان دەکات.

جـۆری دووەم: ئــەو پیرانــەن کــە بــە هــۆی پیرییــەوە دابــڕاون و هــیچ شــوێن و پەنایەکیان نییە، ئەمانە وەکوو نەخۆش و کەنەفت وان..

ئەگــەر جــۆری یەکــەم بــە خۆیــان، خۆیــان لــە زانســت و کــردەوە و ئــیش و کەسـابەت پچـڕاندووە و چـاویان لـە دەرگایـە شـتێکیان بـۆ بێـت، چاوسـاغ بـوون و بـــەکۆرەیی ڕازی بـــوون، ســـاغ و تەندروســـت بـــوون و خۆیـــان کـــرد بـــە پەککەوتە و کەنەفت.

نەفس پێی وتم: بەم قسانەت ڕازی نیم، تۆ سەرجێیی ژنانی جوان و خواردنی بەتامت پێ باشترە، ئەگەر لە ئەهلی خواپەرستییش نیت تانەیان لێ مەدە.

پێیم وت: ئەگەر تێ بگەیت قسەت بۆ دەکەم، ئەگەریش تەنها ڕواڵەت دەبینی و چاویان لێ دەکەیت ئەوا فام و تێگەیشتنت نییە.

سەبارەت بە ژنانی جوان، مەبەست لە هاوسەرگیری چەند شتێکە: منداڵبوون، شیفای نەفس بە هۆی دەرکردنە دەرەوەی پاشماوەی ئازاردەر، ئەو پاشماوەیەش بەتەواوی دەرناچێت تەنها بە بوونی جوانێك نەبێ! وادانێ ئەمە بە پەڕین لە خەمشە (کونی پێشەوەی ژن) نەبوو ئەوا ئەو پاشماوانەی دەردەچن بە پەڕین لە غەیری خەمشە دەرناچن! بە تەواو دەرچوونی ئەو پاشماوەیە نەفس لەو شتانە بەتاڵ دەبێ کە مەشغوولی دەکەن و دەزانێ لە کوێیە، هەروەك فەرمان دەکەین بە دادوەر کە بەر لە دەرکردنی بڕیار نان بخوات و نەهیشی لێ دەکەین کە لە کاتی تووڕەیی یان تەنگاویدا حوکم دەربکات.

پاشان نەفسیش هەقی بەشی خۆی هەیە، چۆن وشتر لە کاتی سەفەردا هەقی خۆیەتی بەشی خۆی لە ئالیك بەتەواوی وەربگرێ، ئەمەش لە ڕۆیشتندا کۆمەکی دەکات.

لــەبارەی خــۆراك و خواردنەكانیشــەوە ئــەوا كەســی نــەزان لەبــەر خــودی خــواردن یــان لەبــەر چــێژەكانی، خــواردنی مەبەســتە، بــەلام مەبەســت لــە خواردن ئەوەیـە مـرۆڤ هێـز و توانـای هـەبێ و بـیر و هـزری بـە بیركردنـەوە لێـی سەرقاڵ نەبێ.

ئەگــەر ســەرنج بدەیتــە حــاڵی كۆمەڵــەی یەكــەمی موســڵمانان شــتی ســەیر دەبینی:

پێغەمبـەر (صـلی الله علیـە وسـلم) عائیشـەی بـۆ خـۆی هەڵبـژارد كـە جـوان بـوو، زەینـەبی دیـت و كەوتـە بـەردڵی و مـارەی كـرد، هـەروەها صـەفییەی هەڵبـژارد، ئەگــەر ئــافرەتێكی بــۆ وەســف كرابایــە خــوازبێنی دەكرد! (بەداخــەوە ئــەم قســانەی دانــەر زیــادەڕەوی زۆری تێدایــە و پێچــەوانەی ئــەو فــەرموودە ڕاســتانەیە كـە لـە سـوننەتدا هـاتوون، پێغەمبـەر (صـلی الله علیـە وسـلم) هـیچ كـات لەبـەر خـاتری جـوانی و بـۆ زەوقـی خـۆی ژنـی نـەهێناوە، ئەمـەش ڕاسـت نییــە كــە پێغەمبــەر (صــلی الله علیــە وســلم) هــەر ئــافرەتێكی بــۆ وەســف كرابێــت خــوازبێنی كــردووە! بــەپێی ئــەم قســەیە بێــت پێغەمبــەر (صــلی الله علیـە وسـلم) هـیچ كـارێكی نـەبووە جگـە لـە گـەڕان بـەدوای كـچ و ژنـی جـوان نەبێ! دوور لە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم))..

عەلی كوڕی ئەبی تاڵیب چوار ژنی ئازاد و حەڤدە كەنیزەكی هەبوون!

هەروەها پێغەمبەر داوود (سەلامی خوای لەسەر بێت) سەت ژنی هەبووە و پێغەمبەر سولەیمانیش هەزاری هەبووە! (ئەوەی عەلی و ئەمەی ئەم دوو پێغەمبەرە هیچ بنچینەیەکی ڕاستیان نییە).

هەر کەسێك پێی وابێت کەموکورتییەك لەم ڕێگایانەدا هەیە یان پێی وابێت ئەمانە بەدوای هەوا و ئارەزوویان کەوتوون و تەمەنیان لەم مەبەستانە خەرج کردووە و غەیری ئەم شتانە باشترن ئەوا ئەو کەسانە پێی وایە کەسانی کامڵ کەموکورتیان هەبووە، بەڵکوو ئەم کەسە لە تێگەیشتنیدا کەموکورتە نەك ئەوان!!

سوفیانی سەوری ئەگەر سەفەری کردبایە لە سفرەکەیدا بەرخێکی برژاو و فالودە هەبوو، خواردنی باشی دەخوارد و دەیوت: هەموو زیندەوەرێك گەر بایەخی پێ نەدەیت کار ناکات.

ئەم بابەتانەی ئاماژەم پێ دان ئەگەر بۆ مەبەستی پێویستی پێیان یان بۆ دامرکاندنەوەی حەزی نەفس یان بۆ مەبەستی دینی و دنیایی ئەنجام دران ئەوا هەموو ئەوانە مەبەست و نیازێکی دروستن، کەسێك ناتوانێ لێی تێکبدات کە تەنها چەند ڕەکاتێك دەکات کە لێی تێ ناگات و تەسبیحاتێك دەکات کە تەنها وەکوو تووتی دەیڵێتەوە و هیچی لێ تێ ناگات!

نەخێر، ئەوە تەنها زانستە کە باشترین سیفەت و بەڕێزترین خواپەرستییە، فەرماندەرە بە چاکە و سوود و دەربڕی ئامۆژگارییە.

پاشان سوودی زانست دیار و زانراوه و زوهدی زاهیدیش پێش دەرگای خۆی تێناپەڕێنێ، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: ((لئن یهدي الله علی یدیك رجلا واحدا خیر لك مما طلعت علیه الشمس)) واتە: ئەگەر خوای گەورە لەسەر دەستی تۆ کەسێك هیدایەت بدات لە هەموو دونیا بۆت باشترە..

ئامانجی زانایان ئەوەیە بە زانستەوە رەفتار لە شتە رێپێدراوەکاندا بکەن و زۆربەی زاهیدانیش نەزانن لەپێناو دەست ماچکردنیان واز لە شتە رێپێدراوەکان دێنن. بە هۆی گۆشەگیرییەوە چەندان زانستی سوودبەخش بۆ دین لە دەست چوون، چەندین کەس تووشی بەلا بوو کە دینی پێ لەناوچوو! بەڵکوو گۆشەگیریی رێپێدراو تەنها دابرانی زانایە لە خراپە.

## ٨٤- وریای سەرەنجامی تاوانەکان بن

پێویستە هەموو خاوەن هۆش و ئاوەزێك وریای سەرەنجامی سەرپێچی و گوناهەکان بێت، چونکە لەنێوان ئادەمیزاد و خوادا هیچ خزمایەتییەك نییە، بەڵکوو خودا دادپەروەرە و بە دادپەروەرییەوە بڕیار دەدات..ئەگەرچی ئارامی و لەسەرخۆیی زۆرە کە بەشی چاوپۆشی لە گوناهەکان بکات بەلاّم ئەگەر بیەوێ دەبووریّ و هەموو گوناهەکان دەسڕێتەوە، بە پێچەوانەش ئەگەر بیەوێ بە گوناهێکی کەم سزای ئادەمیزاد دەدات. کەواتە زۆر وریا و بەئاگا بن!

خەڵكێكم لە خۆشگوزەرانەکان بینی کە لە ستەم و تاوانی ناوەکی و دەرەکی دەگەوزان، لە کات و شوێنێکی وەها سزایان بۆ هات کە هەر بە خەیاڵیشیاندا نەدەهات، ڕەگ و ڕیشەیان دەرهێنرا و ئەوەی بۆ منداڵ و نەوەکانیان بنیاتیان نابوو تێکوپێك شکێنرا، ئەوەش تەنیّ لەبەرئەوەی لای خودایان فەرامۆش کرد و پێیان وابوو ئەو خێرەی دەیکەن بەرەنگاری خراپە دەبێتەوە، ئیتر کەشتی گومانەکانیان لار بۆوە و ئەوەندە ئاوی فێڵی چووە ناو کە نقوومی کردن.

خەڵكێکم بینی لەوانەی ئەهلی زانست بوون لەبەرئەوەی سەیرکردنی خودایان لە کاتی تەنیاییدا پشتگوێ خست ئیتر باسی چاکەکانیان لە کاتی ئاشکرادا سڕایەوە،

بوون و نەبوونیان وەكوو یەكی لیّ هات، هیچ شیرینییەك لە دیتنیاندا نەما و هیچ دڵێكیش پەرۆشی دیداریان نەبوو.

بۆ خاتری خودا ئاگاتان لە خودای هەق بێت، تەرازووی دادی تەنانەت گەردیلەیەكیش دەخوێنێتەوە و سزاشی بۆ تاوانكار لە بۆسەدایە ئەگەر دوای ماوەیەكیش بێت، لەوانەیە تاوانكار وابزانێت ئەمە لێبووردنە بەڵام نا، ئەمە مۆڵەتدانە و گوناهیش سەرەنجامی خراپی هەیە.

بۆ خاتری خودا ئاگاتان لە خەڵوەت و ناخ و نیازتان بێت، چاوی خودا هەمیشە بەسەرتانەوەیە! ئامان نەكەن بە ئارامی و لەسەرخۆیی و بەخشندەیی خودا دەسخەڕۆ بن، چەندان كەس خودا وردە وردە جڵەوی بۆ شلكردووە و لەپڕ گرتوویەتی! وریای گوناهەكان بن و هەوڵی سڕینەوەیان بدەن! هیچ شتێكیش هێندەی لاڵانەوە لەگەڵ پارێزی لە گوناهەكان سوودبەخش نییە، بەڵكوو سوودی هەبیّ!

ئەو كەسەی مامەڵە لەگەڵ خودا دەكات ئەگەر لەم بەشە وردبێتەوە سوودی بۆی هەیە. خواناسێك دەڵیّ: چێژێكم بۆ هاتەپێش و گەورەش نەبوو، نەفسم بۆی خرۆشا لەبەرئەوەی گچكە بوو و فەزڵ و بەخشندەیی خواش گەورەیە، بە نەفسم وت: ئەگەر ئەمەت تێكشكاند ئەوا تۆ تۆیت و پیاویت، ئەگەریش ئەنجامتدا ئەوا تۆ كێیت؟! باسی دۆخی ئەو كەسانەم بۆ كرد كە ئاسانكارییان بۆ خۆیان دەكرد و چۆن ناوودەنگیان پوكایەوە و خودا بە ڕوو لیّ وەرگێڕان سزای دان! ئیتر بەم قسانە وازی هێنا و لەوەی دەیویست بیكات پەشیمان بوویەوە...

## ٨٥- وریای گوناهە بچووکەکان بن

زۆرێك لە خەڵك لە هەندێ شت چاوپۆشی دەکەن کە پێیان وایە ئاساییە بەڵام وانییە بەڵکوو ئەم شتانە تانەدانە لە بنچینەکان (الاصول) وەکوو: خواستنی کتێبێك لەلایەن زانستخوازان و نەگەڕاندنەوەی بۆ خاوەنەکەی، یان چوونە ماڵی کەسێك کە نان دەخوات بۆ ئەوەی نانی لەگەڵدا بخۆیت، یان چاوپۆشیکردن لە سووکایەتیکردن بە ئابڕووی دوژمن وەکوو چێژوەرگرتنێك و بەگچکەزانینی ئەم گوناهە، یان چاو بەڕەڵاکردن و بەکەمزانینی ئەم هەڵەیە، یان فەتوادانی کەسێك لەبارەی بابەتێك کە لێی نازانێ نەوەك پێی بوترێ نەزان..هەروەها هیتری هاوچەشن کە پێی وایە بچووکە بەڵام لە ڕاستیدا گەورەیە.

ساناترین شت کە ئەم ڕەفتارە بە خاوەنەکەی دەکات ئەوەیە لە ئاستی هەڵکەوتووان لەنێو خەڵکدا دەیهێنێتە خوارەوە و لە پایەی بڵندی ڕێز لە کن خودا دایدەبەزێنێ..ڕەنگە بە زاری خودای هەقەوە پێی بوترێ: ئەی ئەو کەسەی کارێکی سادەت بە ئەمانەت پێ سپێردرا و خیانەتت لێی کرد! چۆن بە گوناهەکانتەوە هیوات بە ڕەزامەندیی خودا هەیە؟!

پیاوچاکێك وتوویە: لە خواردنی پاروویەك چاوپۆشیم کرد، ئێستا ئەمن ئەمڕۆ چل ساڵ لە دواوەم..

بۆ خاتری خودا گوێ لەو کەسانە بگرن کـە ئـەزموونیان هەیـە ! وریـا و ئاگـادارین و سـەیری سـەرەنجامەکان بکـەن و گـەورەیی قەدەغـەکار(الناهی) بـزانن و وریـای فوویەکی کەم و پڕیشکێکی بچووك بن، ڕەنگە ئـەم فـووە کـەم و پڕیشـکە بچووکە وڵاتێك بسووتێنن!

ئـەوەی ئامـاژەم پێـدا کەمێکـە و نیشـانەیە بـۆ زۆر و نموونەیەکـە هـەموو گوناهـە گچکەکان دەناسێنێت. زانست و چاودێری پێت دەڵێن لە یادکردنی کێدا کەمتەرخەم بوویت و ئەگـەر بـە چـاوی دڵ بڕوانیـت شـوێنەواری شـوومی ئـەم کردەوەیـەت پـێ نیشان دەدەن..

## ٨٦- ئادابی نزا و پاڕانەوە

لە نەفسی خۆمدا شتێکی سەیرم بینی! داوای پێویستییەکانی لە خودا دەکات و گوناهەکانیشی لەبیردەکات!!

وتم: ئەی نەفسی بەد! نموونەی وەکوو تۆ قسان دەکات؟! ئەگەر قسەی کرد دەبێ تەنها داوای لێخۆشبوون بکات. وتی: لە کێ داوای خواستەکانم بکەم؟!

وتم: لە داواکردنی خواستەکانت ڕێگریت لێ ناکەم بەڵکوو دەڵێم: تەوبە بکە و قسە بکە، هەروەك بە کەسێکی گوناهکار کە سەفەری کردووە ئەگەر ناچاری خواردنی گۆشتی مردار بوو دەڵێین: بۆی نییە گۆشتی مردار بخوات! ئەگەر پێمان وترا: ئایا لە برسان بمرێت؟! دەڵێین: نا، بەڵکوو تەوبە دەکات و دەخوات.

بۆ خاتری خوا وریای ئەوە بن بوێری ئەوەتان هەبێ لەگەڵ فەرامۆشکردنی گوناهەکانتان داوای پێویستییەکان لە خودا بکەن، ئەگەر بە چاکردن و پەشیمانبوونەوە لە گوناهەکان سەرقاڵ بن خواست و داواکارییەکانت دێنەدی.

هەروەك لە فەرموودەیەکدا هاتووە: ((مَن شغَلهُ ذِكري عن مسألتي أعطيتُهُ أفضلَ ما أعطي السائلين) ضعيف، رواه الدارمي و الترمذي.. واتە: هەر کەسێك یادکردنی من لە

داواکردنم سەرقاڵی کرد ئەوا باشترینی ئەو شتانەی پێ دەدەم کە بە داواکاران دراوە..

(بیشری حافی) دەستەکانی بۆ داواکردن لە خودا بەرز دەکردەوە پاشان دەیهێنانە خوارەوە و دەیوت: کەسی وەکوو من داوا ناکات! گوناهەکان ڕوویان نەهێشتووم! (واتە بەهۆی گوناهەوە ڕووی داواکردن لە خودام نییە)!

ئەمە تایبەتە بە (بیشر) بە هۆی هێزی مەعریفەتەکەیەوە، کاتی داواکردنەکە وەکوو ئەوە وابووە ڕووبەڕوو قسە لەگەڵ دوێنەر بکات ئیتر لەبەر گوناهەوە شەرمی کرد. بەڵام ئەهلی غەفلەت داواکردنیان لە دوورەوەیە. لەوەی باسم کرد تێ بگە و بە تەوبەکردن لە گوناه و تاوان سەرقاڵ بە.

پاشان داواکارییەکانت سەیروسەمەرەن! تۆ زۆر بەکەمی داوای شتی گرینگ لە دونیا دەکەیت بەڵکوو داوای زێدە گوزەرانی دەکەیت و ئەوەندەی داوای چاکەی دونیا دەکەیت ئەوەندە داوای چاکەی دڵ و دین ناکەیت!

لە حاڵوباری خۆت تێ بگە، تۆ لە بێشەرمی و بێئاگاییدا ئەوەندە شوولت لێ ڕاکێشاوە لەسەر لێواری هەڵدێریت، با ئیتر خەم و پەژارەت لە گوناه و هەڵەکانت سەرقاڵت بکەن لە داوا و خواستەکانت، حەسەنی بەصری ترسی زۆر بوو، کاتێ لەم بارەوە پرسیاری لێ کرا وتی: کێ ناڵێ خودا ئاگاداری هەندێ گوناهم بووە و وتوویەتی: بڕۆ ئیتر لێت خۆشنابم؟!

## ٨٧- بەخۆسەرسامبوون دەردی نەزان و بێئاگایانە

سەیرترینی سەیرەکان ئەوەیە لەگەڵ دووربوون لە ناسینی خودا کەچی بانگەشەی مەعریفەت بکەیت! کەس خوای نەناسیوە تەنها ئەو کەسە نەبێ کە لێی ترساوە، بەڵام کەسی بێترس لە ئەهلی مەعریفەت نییە.

لەناو زاهیدان کەسانی بێئاگا هەن، هەیانە پێی وایە ئەو دۆستێکی خۆشەویست و پەسندکراوی خودایە! ڕەنگە هەندێ میهرەبانییشی بەسەردا بباریێ کە ئەو بە کەرامەتی تێ بگات و ئەو پەلکێشانەی(استدراج) لەبیرچووبێت کە لەم میهرەبانییەدا ئاڵاوە! ڕەنگە غەیری خۆی سووك سەرنج بدات و پێی وابێ کە ناوچەکەی بە هۆی ئەمەوە پارێزراوە! چەند ڕەکاتۆکەیەك یان خواپەرستییەك کە پێوەی ماندوو دەبێ فریوی دەدات و لەخۆبایی دەکات! لەوانەیە وا گومان ببات کە ئەو قوتبی زەوییە و هیچ کەس دوای وی پلەوپایەی ئەو بەدەست ناهێنێ!! دەڵێی نەیزانیوە کە پێغەمبەر موسا ئەگەرچی خودا قسەی لەگەڵ کردبوو بەڵام دواتر پێغەمبەرایەتی درایە (یوشەع)! پێغەمبەر زەکەریا دوعای هەمیشە گیرا بوو بەڵام بە هەرە(مشار) دوو لەت کرا! پێغەمبەر یەحیا کە بە گەورە وەسف کراوە بێباوەڕێکی بەسەردا زاڵ کرا و سەری لێ کردەوە! (بەلعام)

کە ناوێکی گەورە بوو وەکوو سەگی لێ هات! (بەداخەوە ئەم قسانەی دانەر لەبارەی ئەم پێغەمبەرانەوە هیچیان بنچینەی ڕاستییان نییە و لە ئیسرائیلیاتەوە وەرگیراون)!

ئەو شەریعەتەی کاری پێ دەکرا هەڵوەشاوە و حوکمی پووچەڵ بۆوە! ئەو جەستەیەی زیندوو بوو وێران بوو و داڕزا! ئەو زانایەی دەکۆشا تا بگاتە ئەو ئاستەی مەبەستیەتی کەچی منداڵێك لە سەردەمی ئەودا پێگەیشت و بەرز بۆوە و عەیبوعار و هەڵەکانی وی دۆزیەوە...

چەندان قسەوێژ دەڵێن: وێنەی من نییە! ئەگەر بژیێت ئەو ڕەوانبێژییە ببیستێ کە دوای وی پەیدا بووە ئەوا خۆی بە لاڵ دادەنێ! ئەمە ئامۆژگاری (ئیبن ئەلسەماك و ئیبن عەممار و ئیبن سەمعون)ە، بە کەڵکی هەندێ لە قوتابییەکانیشمان نایەت و پێی ڕازی نابن! ئیتر چۆن ئێمە بە خۆمان سەرسام بین؟! ڕەنگە ئەوەی دوای ئێمە دێت هەر حیسابیشمان بۆ نەکات.

با کەسی هۆشیار و بەئاگا هەمیشە نیگەران بێت و زۆرێك لە پەرستشەکانی بە کەم بزانێ و لە ئاڵوگۆڕەکانی نەفسی خۆی و دەسەڵاتی قەدەر بترسێ.

بزانە سەرنجدانی ئەم شتانەی ئاماژەم پێدان ئەستۆی سەرسامبوون و خۆبەلزانی تێك و پێك دەشکێنێ.

## ٨٨- خۆئامادەکردن بۆ کاتی تەنگانە

هەر کەسێك لە کاتی سەلامەتی و بێوەییدا لەگەڵ خودا بە خۆشنوود و ڕەزامەند ژیا ئەمە ئازایەتی نییە بەڵکوو کاتی بەڵا و چەرمەسەری سەنگی مەحەکە. ڕازیبوون لە دەمی ناخۆشیدا گرینگە دەنا مرۆڤ لە کاتی فەرەحناییدا هەمیشە خۆشنوودە.

ئەوەی نیعمەتەکانی بەردەوام بەسەردا دەباریێ بەمە دڵشادە، ئەگەریش ناخۆشییەك بەرببینی بگریێ دەشڵەژێت. حەسەنی بەصری وتوویە: (مرۆڤەکان لە کاتی خۆشی و نیعمەتدا وەکوو یەکن، کە بەڵا و ناخۆشی هات جیا دەبنەوە).

ژیر ئەو کەسەیە زەخیرەیەك ئامادە بکات و توێشوویەك دەست بخات و چەك و تفاق بۆ شەڕی بەڵا زیاد بکات. ڕووبەڕوو بوونەوەی بەڵا هەر دێتە پێش تەنانەت ئەگەر تەنها لە کاتی مردنیشدا بێت، ئەگەریش مردن هات و مرۆڤ مەعریفەتێکی نەبوو کە ببێتە مایەی ڕەزامەندی یان ئارامگرتن ئەوا پەنا بە خوا بەرەو بێباوەڕی دەچیێ.

هەندێك کەس کە گومانی خێری زۆرم پێی هەبوو گوێم لێی بوو لە شەوی مردندا دەیوت: پەروەرێنم ئەوەیە ستەمم لێ دەکات! ئیتر لەو ساوە بێتاقەت بووم و خەریکی وەدەسهێنانی ئامادەکاری بووم بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەو ڕۆژە.

گێڕدراوەتەوە کە شەیتان لەم کاتەدا بە هاوکارەکانی دەڵێ: ئاگاتان لەمە بێت ئەگەر لەدەستتان چوو ئەوا ناتوانن بەسەریدا زاڵ بن!

چ دڵێك لە کاتی گیانکێشاندا دامەزراو دەبێ کە دەزانێ وا خۆشەویستانی بەجێ دەهێڵێ و نازانێ بەرەو کوێ دەچێ؟! ئەوەی دیاریشە تەنها گۆڕ و بەڵایە.

داوای یەقینێك لە خودا دەکەین لە خراپەی ئەو ڕۆژە بمانپارێزێ بەڵکوو ئارام لەسەر بڕیاری خودا بگرین و پێی ڕازی بین و بە ئومێدی ئەوە بین خودا لەو نیعمەتانەی دەیدات بە خۆشەویستانی بەشی ئێمەش بدات تاوەکوو دیداری ئەو خۆشەویستتر بێت لامان لە مانەوەمان و خۆسپاردنمان بە تەقدیری ئەو پێ خۆشتر بێت لە بژاردەی خۆمان.

پەنا دەگرین بە خودا لەوەی پێمان وابێت تەگبیرمان تێروتەواوە تا ئەوەی ئەگەر کارێکمان لێ پێچەوانە بوویەوە لە قەدەر تووڕە بین، ئا ئەمە نەزانیی پەتی و پشتبەردانی ڕوونە، خودا پەنامان بدات.

## ٨٩- ناسینی خودا مایەی ئاسوودەییە

نە لە دونیا و نە لە ئاخیرەت هیچ کەسێك ژیانی وەکوو خواناسان خۆش نییە. خواناس لە خەڵوەت و تەنهاییدا هاونشین و هۆگری خودایە، ئەگەر نیعمەتێکی بەسەردا باری دەزانێ کێ پێشکەشی کردووە و ئەگەریش تاڵییەك هات ئەوا تامی لە زاریدا شیرین دەبێ چونکە دەزانێ کێ گرفتاری کردووە، ئەگەر داوای کرد و مەبەستەکەی تەگەرەی تێکەوت ئەوا مەبەستەکەی دەبێتە ئەو شتە کە قەدەر هێناویەتی چونکە دەزانێ چاکە هەر ئەوەیە لە لایەن خوداوە بێت و یەقینی تەواوی بە حیکمەت و تەگبیری جوانی خودا هەیە.

خواناس(عاریف) ئەو کەسەیە دڵی ئاگاداری خودایە و لەبەر دەستی وی وەستایە، بە چاوی یەقین بۆی دەڕوانێ، بەرەکەتی ناسینی خودا چۆتە نێو هەموو ئەندامانی لەشییەوە و پاکی کردوونەتەوە و بژاری کردوون.

ئەگەر ئازارێك تووشی خواناس بوو ئەوا ڕوو لە هۆکارەکە وەردەگێڕێ و جگە لە هۆخوڵقێن هیچی تر نابینێ بۆیە ئەو لەگەڵیدا لە باشترین ژیاندایە: ئەگەر بێدەنگ بوو بیر لە بەجێهێنانی مافی خودا دەکاتەوە و ئەگەریش قسەی کرد بەو شێوەیە دەدوێ کە ئەو پێی ڕازی بێت، دڵی لە کن ژن و منداڵ ئارام ناگرێ و خۆی بە کلکی

خۆشەویستیی هیچ کەسێك هەڵناواسێت بەڵكوو بە جەستە مامەڵە لەگەڵ خەڵك دەكات و ڕۆحیشی لای خاوەنەكەیەكەتی.

ئەمە ئەو كەسەیە كە لە دونیا هیچ خەمێكی نییە و كاتێكیش بەجێی دێڵێت خەفەتی بۆ ناخوات، لە گۆڕیش هەست بە تەنهایی ناكات و لە ڕۆژی مەحشەریشدا هیچ ترسێكی لەسەر نییە.

بەڵام ئەو كەسەی خوانەناسە و مەعریفەی بە خودا نییە ئەوا كەوتووە و ژیانی پڕ لە كۆسپ و تەگەرەیە: بەردەوام لە دەست بەڵا و ناخۆشی هاتوهاواریەتی چونكە ئەو زاتە ناناسێ كە تووشی كردووە و بە لەدەستدانی مەبەستەكەی ترس و تەنهایی دایدەگرێ چونكە نازانێ بەرژەوەندی لەكوێدایە، دڵی بە هاوڕەگەزەكەی خۆشە و هۆگری دەبێ چونكە هیچ مەعریفەت و ناسینێك لەنێوان ئەو و خوداكەیدا نییە و لە مردنیش دەترسێ چونكە هیچ توێشوویەكی نییە و شارەزای ڕێگا نییە.

چەندان زانا و زاهید تەنها ئەوەندە مەعریفەتەیان پێدرا كە بە ڕەشۆكییەكی دەسبەتاڵ درا! ڕەنگە ئەو لەمان زیاتری پێدرابێت! لەگەڵ ماندووبوونیان ئەوەی بە چەندان ڕەشۆكی درا بەوان نەدرا! ئیتر ئەمە بەخشش و بەشەكانە. ﴿ذَٰلِكَ فَضۡلُ ٱللَّهِ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُۚ﴾ (المائدة: ٥٤) واتە: ئەمە فەزڵ و بەخششی خودایە بە ویستی خۆی كێی بوێت پێی دەبەخشێ.

## ٩٠- ئارامگرتن له‌ به‌رانبه‌ر گوناه و سه‌رپێچی

ئـه‌ی ئـه‌و كه‌سـه‌ی بـه‌ هـۆی تـه‌قواوه سـه‌نگین و گرانقـه‌در و پایه‌بـه‌رز بوویـت، بـۆ خـاتری خـودا ئـه‌م شـكۆمه‌ندییه‌ بـه‌ زه‌لیلـی گوناهـه‌كان مه‌فرۆشـه‌! لـه‌ گـه‌رمایی تونـدی ئیشـتیا و حـه‌زلێكراودا (مشـتهی) به‌رگـه‌ی تینـوێتیی ئـاره‌زوو بگـره‌ ئه‌گه‌رچـی بـه‌ژان و هه‌ڵقرچـاویش بێـت، ئه‌گـه‌ر گه‌یشـتیته‌ دوا پلـه‌ی ئـارامگرتن بڕیـار بـده‌ و بڵـێ چـونكه‌ ئـه‌وه‌ پایـه‌ و ئاسـتێكه‌ هـه‌ر كه‌سـێك به‌ سوێنده‌وه‌ داوای هه‌ر شتێك له‌ خودا بكات خودا بۆی دێنێته‌دی.

سـوێند بـه‌ خـودا ئه‌گـه‌ر سـه‌بر و ئـارامیی عومـه‌ر نه‌بووایـه‌ ده‌سـتی كـراوه نـه‌ده‌بوو بـۆ ئـه‌وه‌ی بـه‌ قامچـی لـه‌ زه‌وی بـدات. ئه‌گـه‌ر كۆششـی (ئه‌نه‌سـی كـوڕی نـه‌زر) نه‌بووایـه‌ لـه‌ ته‌ركـدانی ئـاره‌زووی كـه‌ لـه‌باره‌ی ویسـت و ئـیراده‌ی بیسـتووته‌ كـه‌ وتوویـه‌: ئه‌گـه‌ر خـودا پێشـهاتێك بێنێتـه‌ پـێش ده‌بـێ پیشـانی بـده‌م كـه‌ چـی ده‌كـه‌م! ئـیتر لـه‌ شـه‌ڕی ئوحـوددا په‌لاماریـدا و ئه‌وه‌نـده‌ شـه‌ڕی كـرد تـا كـوژرا، له‌به‌رئـه‌وه‌ی هـه‌موو له‌شـی بـرین و زام بـوو بۆیـه‌ ته‌رمه‌كـه‌ی بـه‌ سـه‌ره‌په‌نجه‌كانی ناسـرایه‌وه‌..ئه‌گه‌ر ئـه‌م ئـیراده‌ پۆڵایینـه‌ نه‌بووایـه‌ ئـه‌و ڕۆژه‌ی سـوێندی خـوارد دڵـی خـۆش و ڕووی گـه‌ش نـه‌ده‌بوو كـاتێ وتـی: سـوێند بـه‌ خـوا ددانـی (ئـه‌لره‌بیع) ناشـكێنرێ! (ڕه‌بیعـی كچـی نـه‌زر ددانێكـی

کەنیزەکێکی شکاند، کەسوکاری ڕەبیع لە بەرانبەر دداشکاندنەکە داوای لێخۆشبوونیان کرد و ئامادەییان دەربڕی لەبری ددانەکە خوێنبایی بدەن بەڵام کەسوکاری کەنیزەکەکە ڕازی نەبوون و هاتنە لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمانی تۆڵەکردنەوەیدا بە شکاندنی ددانێکی ڕەبیع، ئەنەسی کوڕی نەزر گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ددانی ڕەبیع دەشکێنیت؟! نا، سوێند بە خودا ددانی ناشکێنرێ..پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: ئەی ئەنەس! تۆڵەکردنەوە یاسا و بڕیاری خودایە..ئیتر دوای ئەمە کەسوکاری کەنیزەکەکە لە ڕەبیع خۆشبوون و بە خوێنبایی ڕازی بوون..پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: هەندێ بەندەی خودا هەن ئەگەر سوێند بخوات خودا سوێندەکەی ناشکێنێ و داواکەی دێنێتەدی!).

بۆ خاتری خودا، شیرنایی وازهێنان لە قەدەغەکراو تامکە، ئەم وازهێنانە درەختێکە شکۆمەندی و پایەداریی دونیا و گەورەیی ئاخیرەت بەرهەم دێنێ.

هەر کاتێ تێنوێتیت بۆ ئەوەی ئارەزووی دەکەیت زۆر بوو دەستی هیوات بۆ ئەو زاتە بەرزکەوە کە تێراوکردنی تەواوی لەلایە و بڵێ: خودایە سروشتم ئارامی لەبەر بڕاوە و لاواز و کەلەلا بووە، بە ساڵی پڕپیت و بەرەکەتەوە بە هاوارم وەرە و فریامکەوە.

بۆ خاتری خودا، بیر لەو کەسە بکەوە کە زۆربەی تەمەنی لە تەقوا و خواپەرستیدا بەسەربردووە، پاشان لە دوا کاتدا فیتنەیەك تووشی دەبێت، چۆن کەشتییەکەی وەبەر بەردێك دەکەوێ ئیتر لە کاتی سەرکەوتن و بەرزبوونەوە نقووم دەبێ!

ئۆف لە دنیایەك کە بەدەستهێنانی ببێتە هۆی تۆراندنی خۆشەویست! بنەچەی ڕەشۆکی بە ناوی خۆی و ناوی باوکێتی، بەڵام پایەدارەکان ناسناو بەر لە بنەچەیە. پێم بڵێ: تۆ کێیت؟ کارت چییە؟ تا چ ئاستێك ڕێز و پایەت بەرز بۆتەوە؟ ئەی ئەو کەسەی ساتێك لە بەرانبەر ئەوەی حەزی لێ دەکەیت ئارام ناگریت! بۆ خاتری خودا، دەزانی کێ پیاوە؟ سوێند بە خوا پیاو ئەو کەسەیە کە لەگەڵ ئەو کەسەی خۆشی دەوێت و لێی حەرامە بە تەنها بێت و تواناشی بەسەردا هەبێت و لە تێنوێتییان بۆی بپەشۆکێت و ببزوێت، ئیتر لەو دەمەدا بڕوانێتە تەماشاکردنی خودا بۆی و شەرم بکات لەوەی تەمای لە شتێك بێت کە خودا پێی ناخۆشە، ئیتر تێنوێتییەکە بڕوات و نەمێنێ.

دەڵێی تۆ تەنها ئەو شتانە واز لێ دێنیت کە حەزبزوێن نییە و ئارەزووت بۆی ناوروژێت یان دەسەڵاتت بەسەریدا ناشکێ!! سوێند بە خوا ئەوە نەریتە! شتێك دەبەخشی کە بە کەڵکت نایەت، یان لەناو کۆمەڵە خەڵکێك دەیبەخشی تا ستایشت بکەن.

سوێند بە خوا زۆر دوورە، لایەنگری و نزیکایەتی ئێمە بەدەست ناهێنی تا سەودا و مامەڵەت لەگەڵمان پاك و بێگەرد دەبێت: شتە خۆشەکانت دەبەخشی و واز لە ئارەزووەکانت دێنی و لەسەر ناخۆشییەکان ئارام دەگریت..بزانە کە پاداشتەکەت لەلای ئێمە هەڵدەگیرێ ئەگەر مامەڵەکار بیت، تۆ کرێگرتەی ئێمەیت و دوای تەواوبوونی کارەکەت کرێکەت وەردەگریت.. ئەگەر ئەویندار بیت کەمێك لەوە لە لایەن ڕەزامەندیی خۆشەویستەکەت لێت، دەبینی.

لەگەڵ سێیەمیش هیچ قسەیەکمان نییە.(سێیەم ئەو کەسەیە کە نە کرێگرتەیە و نە ئەویندار بەڵکوو گوناهکارە).

## ٩١- تەسلیمبوون بە حیکمەتی خودا

لە عەقلّدا جۆرێك لە پەرۆشیم دیت بۆ زانینی سەرجەم حیکمەتەکانی خوای گەورە لە حوکم و بڕیارەکانیدا! ڕەنگە شتێکی بۆ ڕوون نەبێتەوە — وەکوو هەڵوەشانەوە دوای دروستکردن — سەرگەردان بمێنێت! ڕەنگە شەیتان ئەم دەرفەتە بقۆزێتەوە و وەسوەسە بخاتە دڵیەوە: حیکمەت چییە لەمە؟

پێیم وت: ئەی داماو، وریابە هەڵنەخەڵەتێی! بە بەڵگەی یەکلاکەرەوە ڕادەی حیکمەتی دروستکەرت بۆ سەلماوە کە بینیوتە شتەکانی چەند بەوردی دروست کردوون، ئەگەر هەندێ حیکمەتت لێ ون بوون ئەوە بە هۆی لاوازیی تێگەیشتنی خۆتەوەیە. پاشان، پاشاکان نهێنیی خۆیان هەیە، تۆ کێیت تا بە لاوازیت ئاگاداری هەموو حیکمەتەکانی خودا بیت؟! ڕستەکانت بەسن!

ئامان نەکەیت وێڵی ئەو شتانە بیت کە لێت ونن، تۆش دانراوێك و گەردیلەیەك لە دروستکراوەکانیت، چۆن حوکم بەسەر زاتێك دەدەیت کە تۆ لەویەوە دەرچوویت؟! پاشان حیکمەتی ویت لە حوکم و موڵکیدا بۆت سەلماوە. ئیتر ئاوەزی خۆت بە ئەندازەی توانات لە گەڕان و زانینی ئەو حیکمەتانە بەکاربێنە کە لە تواناتدایە، ئەمە دەبێتە مایەی سەرسوڕمانت! چاوداخە لەوەی لێت ونە، هەقوایە ئەوەی چاوی کزە ڕووبەڕووی تیشکی خۆر نەبێتەوە.

## ٩٢- رامکردنی نەفس

سەیروسەمەرەترینی شتەکان شەڕی نەفسە (مجاهدة النفس)، چونکە پێویستی بە کارسازییەکی سەیر هەیە: خەڵکێك نەفسیان لەوەی پێی خۆشە بەرهەڵدا کرد، ئەویش تووشی ئەو شتانەی کردن کە پێیان ناخۆشە.

خەڵکێکیش لە سەرپێچیکردنی نەفس زیادەڕەوییان کرد تا ئەوەی لە مافی خۆشی بێبەشیان کرد و ستەمیان لێ کرد، ئەو ستەمەشیان لێی کاری کردە سەر پەرستشەکانیان: هەبوو خۆراکی خراپی پێدا، ئەوەش کاری کردە سەر ئەوەی جەستەی لە ئەنجامدانی ئەرکەکان لاواز بێت. هەبوو لە خەڵوەتێکی پڕ تەنهایی دانا کە بووە هۆی دوورکەوتنەوە و دابڕان لە خەڵك و سەری کێشا بۆ وازهێنان لە فەرزێك یان سوننەتێك وەکوو سەردانی نەخۆش یان چاکەکردن لەگەڵ دایك.

کەسی یەکلاکەرەوە و خاوەن بڕیار ئەو کەسەیە نەفسی جیددییەت و پاراستنی بنچینەکان دەزانێ: ئەگەر لە شتە ڕێپێدراوەکان بواری پێدا ئەوا نەفسەکەی بوێری ناکات سنوور ببەزێنێ، لەگەڵیدا وەکوو پاشایەك دەبێ ئەگەر گاڵتەی لەگەڵ هەندێ لە سەربازەکانی کرد ئەوا شکۆی خۆی دەپارێزێ و منداڵ و تواڵ ناتوانن گاڵتەوگەپ بکەن، ئەگەر لەگەڵ ئەوانیش کردی ئەوا سام و شکۆی مەملەکەتی لە بیر و بەرچاوە.

ئەو کەسەشی ئاگای لە خواستەکانی نەفسە ئەوا هەقی خۆی دەداتێ و مافی خۆیشی لێ وەردەگرێ.

## ٩٣- کات وەکوو شمشێر وایە نەیبڕی دەتبڕیٚ

دیتم زۆربەی خەڵك زۆر بەسەیری کات بەسەردەبەن: ئەگەر شەو درێژ بوو بە قسەی بێکەڵك یان خوێندنەوەی کتێبی شەڕوشۆڕ و گێڕانەوەی هەقایەت بەسەردەبەن! ئەگەر ڕۆژیش درێژ بوو بە نووستن! لە سەرەتا و کۆتایی ڕۆژیشدا لەسەر ڕووباری دیجلە یان لە بازاڕەکان! ئەم جۆرە کەسانەم بە کەسانێك چوواند کە لەناو کەشتییەکدان و هەر خەریکی قسانن و ئاگایان لە هیچ نییە و ئەویش دەیانئاژوات!

خەڵکێکی زۆر کەمم بینی کە لە واتای بوون تێگەیشتوون و سەرقاڵی کۆکردنەوەی توێشوو و ئامادەکاریی ڕۆیشتنن، بەڵام ئەوانیش لە یەکتر جیاوازن، هۆکاری جیاوازییەکەشیان کەم و زۆریی زانست و بەخشینییەتی لەپێناو قیامەت:

بێدار و بەئاگاکان بەدوای ئەو هەواڵ و زانیارییانەن کە برەویان هەیە و لەمانە زۆر وەدەست دێنن، ئیتر قازانجیان زۆر دەبیٚ.. بێئاگاکانیش ئەوەی ڕێککەویٚ هەڵدەگرن، ڕەنگە بە بیٚ پاسەوان دەرچن، چەندان کەس لەوانە ڕێیان لیٚ گیرا و ڕووت کرانەوە و نابووت و پەرپووت بوون!

بۆ خاتری خودا ئاگاتان لە وەرزەکانی تەمەن بێت! بەر لەوەی کار لە کار بترازیٚ و بمریت لە کاری سوودبەخش پەلە بکە، زانست بکەنە بەڵگە و شایەت، حیکمەت و دانایی بکەنە ڕێبەر و پێشبڕکێی زەمان بکەن و کاری چاکەی زۆری تێدا بکەن و

لێپرسینەوە لە نەفستان بکەن و خۆتان پشت قـاییم بکـەن بـە توێشـوو، دەڵێـی وا بانگبێـژی مـردن بانگتـان دەکـات و دەڵێـت دەی خێراکـەن بـەڵام لەبـەر بارانـدنی فرمێسکی پەشیمانی کەس لە دەنگی تیٰ ناگات.

## ٩٤- تێکەڵ و پێکەڵیکردنی زانا و زاهیدان

زیانبەخشترین شت بۆ نەخۆش تێکەڵ و پێکەڵی و خواردنی هەموو جۆرە خۆراکێکە. هیچ کەسێك نییە نەخۆشی ئارەزوو نەبێت. پارێزییش سەری هەموو دەرمانێکە و تێکەڵ و پێکەڵیش نەخۆشی بەردەوام دەکات. تێکەڵ و پێکەڵیی ئەهلی ئاخیرەت دوو جۆرە:

یەکەم: تێکەڵ و پێکەڵیکردنی زانایان، ئەوەش بە هۆی تێکەڵبوونی دژەکانە وەکوو دەسەڵاتداران، ئەوان هێزی یەقینی زانایان لاواز دەکەن، هەرچەند تێکەڵاوی زیاتر بێت ڕێبەرێتییان لە کن موریدەکانیان لەدەست دەدەن. ئەز ئەگەر بینیم پزیشکێك هەموو خواردنێك دەخوات و گوێ پێ نادات و داوای پارێزییش لە من دەکات ئەوا گومان لە قسەکانی دەکەم یان لە پارێزی دەوەستم.

دووەم: تێکەڵ و پێکەڵیی زاهیدان، ئەوەش بە هۆی تێکەڵاویی ئەهلی دونیا یان بەوە دەبێ کە بە دەرخستنی ملکەچی و سەرکزی بۆ وەدەسهێنانی خۆشەویستیی ڕەشۆکییان نهێنیی ڕاستەقینەی خۆیان دەپارێزن.

بۆ خاتری خودا وریابن، خوای پاداشتبەخش بینایە و ڕەسەن و زڕ لێك جیا دەکاتەوە، باشترین ڕێی سەلامەتبوون دڵسۆزیی ناخ و ڕاستگۆیی دڵ و داپۆشینی حاڵە.

## ٩٥- پیت و فەڕی زانست لە کارپێکردنیدایە

چەند مەشایخێکم دیت کە حاڵوباریان جیاواز بوو، لە بڕی زانستدا لە یەکتر جودا بوون، بەسوودترینیان بۆم لە هاوڕێیەتیدا ئەوەیان بوو کە بە زانستەکەی کاری دەکرد ئەگەرچی لەو زاناتر هەبوو.

وە بە کۆمەڵێك لە زانایانی فەرموودە گەیشتم کە فەرموودەیان لەبەر بوو و دەیانزانی، بەڵام بە ناوی (جرح و تعدیل)ەوە چاوپۆشییان لە غەیبەتکردن دەکرد و لەسەر خوێندنەوەی فەرموودە کرێیان وەردەگرت و بۆ ئەوەی پلەوپایەیان دانەلەگێ خێرا وەڵامیان دەدایەوە تەنانەت ئەگەر بە هەڵەش بووایە.

وە بە دیداری (عەبدولوەهاب ئەلئەنماتی) گەیشتم، ئەو لەسەر یاسای سەلەف بوو: لە کۆڕیدا غەیبەت نەدەبیسترا و لە بەرانبەر گوێگرتن لە فەرموودە کرێی وەرنەدەگرت، ئەگەر فەرموودەکانی دڵنەرمکردن(الرقائق)م بۆ خوێندبایەوە دەگریا و کڕ نەدەبووەوە، ئەو کات من گچکە بووم گریانەکەی کاری لە دڵم دەکرد و بنەمای دادەنا، سیفەتی ئەو مەشایخانەی هەبوو کە ئێمە سیفەتەکانیانمان لە نەقڵ و گێڕانەوەکاندا گوێ لێ بووە.

هەروەها بە دیداری (شێخ ئەبوو مەنصووری ئەلجەوالیقی) گەیشتم، زۆر بێدەنگ بوو، لەوەی دەیوت ورد بوو و بەجوانی لێی دەکۆڵییەوە، ڕەنگە پرسیاری لەبارەی

بابەتێکی دیار و سادە لیٚ بکرایە کە شاگردەکانی بیانزانیایە بەڵام ئەو بیری لیٚ دەکردەوە تا لە وەڵامەکەی دڵنیا دەبوو، بەپۆژووبوون و بێدەنگی زۆر بوو.

لە هەر کەسێك زیاتر سوودم لە بینینی ئەم دوو کەسە وەرگرت. لەم حاڵەتەوە تێگەیشتم کە ڕێبەری بە کردەوە باشترە لە ڕێبەری بە قسە.

هەندیٚ مەشایخیشم بینی کە خەڵوەتی کەیف و گاڵتەیان هەبوو، دڵئاسوودەیی و کەیفسازییان دەکرد، ئەم شلڕەوییەیان بووە هۆی پەرتبوونی ئەو زانستەی کۆیان کردبۆوە، لە ژیانیاندا کەم کەس سوودیان لیٚ وەرگرتن و دوای مردنیان لەبیر چوونەوە، زۆر بەکەمی ڕێك دەکەویٚ کەسێك ئاوڕ لە دانراوەکانیان بداتەوە.

بۆ خاتری خودا با زانست کردەوەی لەگەڵدا بێت چونکە ئەمە بنچینەی هەرە گەورەیە..داماوی زۆر داماو ئەو کەسەیە کە تەمەنی خۆی لە زانستێکی بیٚ کردەوە بەفیڕۆدا و، چێژەکانی دونیا و خێروبێرەکانی ئاخیرەتی لەدەست چوو، بە گوێرەی هێزی ئەو بەڵگەیەی لەسەریەتی پەرپووت مایەوە..

## ٩٦- خودا مۆڵەت دەدا بەڵام پشتگوێ ناخات

پاك و بێگەردی بۆ ئەو خوایە مەزنەی کە ئەو کەسەی بیناسێ لێی دەترسێ و هەرگیز لە سزای دڵنیا و ئەرخەیان نابێ.

سەرنجم دایە شتێکی گرینگ: خوای گەورە مۆڵەت دەدا و جڵەو شل دەکات تا ئەوەی وا دەزانرێ پشتگوێی خستووە، دەبینی دەستی ستەمکاران بەرەڵلا بووە وەك ئەوەی هیچ ڕێگرییەك نییە، کاتێ پێ ڕاکێشان و شووڵ هەڵکێشانیان زیاد بوو و نە سەنگرانەوە ئەوا وەکوو خودایەکی بەدەسەڵات جڵەویان دەگرێت. ئەو مۆڵەتدانەش بۆ تاقیکردنەوەی ئارامیی ئارامگر بووە، ئەم لەسەر ئارامگرتنی خۆی دامەزراو بێت و ستەمکارەکەش سزای کردەوەی قێزەونی خۆی وەرگرێتەوە.

لەگەڵ ئەوەی لەم حیلم و لەسەرخۆییەی خوادا هەندێ نهێنی هەیە کە ئێمە نایزانین. کاتێ سزا بۆ ستەمکار دێت دەبینی بۆ هەر هەڵەیەك سزایەك هەیە و ڕەنگە هەموو کۆببنەوە و وەکوو بەردێك بەر نێوچەوانی ستەمکار بکەوێت و تخێل و یەخی بکات.

ڕەنگە هۆی سزاکەی لە خەڵك شاراوە بێت و بوترێ: فلان لە ئەهلی چاکە بوو هۆی چی بوو ئەوەی بەسەرهات؟! قەدەر دەڵێ: سنوور و حەددی هەندێ تاوان شاراوە و نادیارن، جێبەجێکردنی حەددی ئەم گوناهانە وایکرد دەرکەون.

پـاك و بێگـەردی بـۆ ئـەو خودایـەی وەهـای دەرخسـت وەك ئـەوەی هـەر شـاراوە نەبووبێت و، وەهاشی داپۆشی وەك ئەوەی کە هەر پێی نازانرێ، ئەوەنـدە مۆڵـەتی دا تا ئەوەی تەما کرایە لێبووردەیی و چاوپۆشییەکەی، ئەوەندە لێپێچینەوەی کـرد تا ئەوەی عەقڵەکان لە سزادانی سەرسام بوون! لا حول ولا قوة إلا بالله.

## ٩٧- بەکارهێنانی حیکمەت لە چارەسەرکردنی حاڵوباری نەفس

سەرنجی زانست و ئارەزووکردن و سەرقاڵبوون پێوەیم دا دیتم هێزێکی وەها دەداتە دڵ کە بەرەو جۆرێك لە ڕەقی دەبات، ئەگەر هێزی دڵ و هیوادرێژی نەبایە سەرقاڵبوون بە زانست ڕووی نەدەدا، من کاتێ فەرمووده دەنووسم بە ئومێدم بیگێڕمەوە و، کە دەست دەکەم بە کتێب دانان ئومێدەوارم تەواوی بکەم.

ئەگەر سەرنجی بابەتی (مامەڵە)م دا ئەوا ئومێد کەم و دڵ نەرم دەبێ و فرمێسك دێتەخوارێ و لالانەوە شیرین دەبێ و دڵئارامی دادەبارێ، وام لێ دێت وەك ئەوەی لە پایەی چاودێریدا (المراقبه) بم. وەلێ زانست باشتر و بەڵگەی بەهێزتر و پایەی بەرزترە ئەگەر شتێکیش ڕوویدات کە سکاڵام لێی هەبێ. (مامەڵە) ئەگەر ئەو سوودانەشی زۆر بێت کە ئاماژەم پێدان بەڵام نزیکە لە حاڵوباری ترسنۆکی تەنبەڵ، ئەوەی کە تەنها بە باشیی نەفسی خۆی قایل بووە و هیدایەتدانی غەیری بەلاوە گرینگ نییە و بە گۆشەگیرییەکەی وازی لەوە هێناوە خەڵك بەرەو لای خودا کەمەندکێش بکات.

ڕاست ئەوەیە کە سەرقاڵی زانست بیت لەگەڵ داخکردنی نەفس بە هۆیەکانی دڵنەرمکردن بە جۆرێکی وەها زیان نەگەیەنێ بە تێروتەواویی مژوولبوون بە زانست. من بۆ خۆم لەبەر لاوازی و نەرمیی دڵم پێم ناخۆشە زۆر سەردانی گۆڕستان بکەم و

لە کاتی گیانەڵای مردووان ئامادەبم، چونکە ئەوە کار لە هـزرم دەکـات و لـە بـواری سەرقاڵبووان بە زانست دەرمدەهێنێ بەرەو پایەی بیرکردنەوە لە مـردن و ماوەیـەك ناتوانم سوود بە خۆم بگەیەنم.

قسەی یەکلاکەرەوە لەم بارەیەوە ئەمەیە کـە پێویسـتە بـەرەنگاریی نەخۆشـی بـە دژەکەیـەوە بکرێـت: هـەر کەسـێك دڵـی زۆر ڕەق بێـت و چـاودێرییەکی وەهاشـی بەسەرەوە نەبێت کە لە هەڵە بیگێڕێتـەوە ئـەوا بـە یـادی مـردن و ئامـادەبوونی لای ئەوانەی لەسەرە مەرەگدان بەرەنگاری ببێتەوە. ئەوەشـی دڵـی زۆر نـەرم و ناسـکە ئەوەندەی بەسە بەڵکوو پێویستە بە شتێك سەرقاڵ بێت کە ئـەوەی لـەبیر بباتـەوە تاوەکوو سوود لە ژیانی وەرگرێت و فەتواکانی فام بکرێت. پێغەمبـەری خـوا (صـلی اللە علیە وسـلم) گاڵتـە و سـوعبەتی دەکـرد و لەگـەڵ عائیشـە پێشـبڕکەی دەکـرد و کەیفسازی و دڵنئاسوودەیی دەکرد. هەر کەسێك پەیڕەوی ژیانی ئـەو بکـات ئـەوا لـە ناوەڕۆکی قسەکەی من لەبارەی پێویستی دڵنئاسوودەیی و کەیفسازی تێ دەگات.

## ٩٨- یادی مردن

له باشترین شتەکان بەئاگاهێنانەوەی ئەو کەسەیە کە لە گیانەڵادایە، ئەو لەو کاتەدا زۆر بەباشی بەئاگا دێتەوە و بێ سنوور نیگەران دەبێ و خەم بۆ ڕابردوو دەخوات، حەز دەکات وازی لێ بهێنرێ تا ئەوەی لە دەستی چووە چاکی بکاتەوە و بە ئەندازەی یەقینی بە مردن لە تەوبەکەیدا ڕاستگۆ بێت، بەر لە مردن نزیکە بە داخ و خەفەت خۆی بکوژێت. ئەگەر گەردیلەیەك لەو حاڵوبارانە لە کاتی ساغییدا هەبووایە ئەوا هەموو مەبەستێکی کارکردن بە تەقواوە دەهاتەدی. ژیر ئەو کەسەیە ئەو ساتەی هەمیشە لەبەرچاو و نمایان بێت و بەم پێیە کار بکات.

ئەگەر نەیتوانی وێناکردنی ئەوە لەسەر شێوەی حەقیقی خۆی بێنێتە بەرچاو ئەوا با بە ئەندازەی بەئاگاییەکەی خەیاڵی بکات، بەمە جڵەوی ئارەزوو دەگرێ و تاوی دەدات بۆ هەوڵ و کۆششکردن. بەڵام هەر کەسێك ئەو ساتەی لەبەرچاو بێت ئەوا وەکوو دیلی لێ دێت.

هەروەك لە (حەبیب ئەلعەجمی) گێڕدراوەتەوە کە کاتێ بەیانی دەکردەوە بە هاوسەرەکەی دەوت: ئەگەر ئەمڕۆ مردم فلان دەمشوات و فلان هەڵمدەگرێت.

(مەعروفی کەرخی) بە پیاوێکی وت: بەرنوێژی نیوەڕۆمان بۆ بکە! ئەویش وتی: ئەگەر بەرنوێژی نیوەڕۆتان بۆ بکەم هی عەسرتان بۆ ناکەم. مەعروف وتی: دەڵێی خۆت داناوە تا عەسریش بژیت؟! پەنا بە خوا لە هیوادرێژی.

جارێك لەلای وی پیاوێك غەیبەتی پیاوێکی تری کرد، ئەویش پێی وت: بیر لەو لۆکەیە بکەوە کە لە کاتی کفنکردنت دەیخەنە سەر چاوەکانت!

## ٩٩- لە هەموو شتێکدا ئاماژەیەك هەیە

ڕەنگە کەسی وریا و بەئاگا دێڕە شیعرێك ببینێ و ئاماژەیەکی لێ وەربگرێ و سوودی لێ ببینێ. (جونەید) وتوویەتی: (سەری سەقەتی) پارچە کاغەزێکی دامێ لەسەری نووسرابوو: گوێم لە کەسێك بوو کە بە گۆرانییەوە وشتری بەرەو مەککە لێ دەخوڕی دەیوت:

أبكي وما يدريك ما يُبكيني

أبكي حِذارًا أن تفارقيني

وتُقطعي حبلي و تهجُريني

دەگریم و تۆ چووزانی چ شتێك دەمگریێنێت، لە ترسی ئەوە دەگریم نەوەك لێم دابڕێ و پەتەکەم بپچڕێنێ و بەجێم بێڵێ!!

تەماشای کاریگەری ئەم دێڕانە لە لای (سەری) بکە تا ئەوەی پێی خۆشبوو ئەوەی ئەو لێی تێگەیشتووە جونەیدیش لێی تێ بگات، جگە لە جونەیدیش کەسی تر نییە بەباشی لێی تێ بگات.

خەڵکێك هەن سروشتێکی تاریك و فامێکی ڕەقیان هەیە، هەندێکیان کاتێ ئەم شیعرەیان بیستووە وتوویانە: بەمە ئاماژە بۆ چی دەکات؟ ئەگەر ئاماژە بۆ خودا

دەكات ئەوا خودا بە واژەی مێینە (تأنیث) هێمای بۆ ناكرێ، ئەگەریش ئامـاژە بێـت بۆ ژنێك ئەی كوا زوهد؟!

سوێند بە خوا ئەمە گۆرانی بێئاگایانە ئەگەر وێنەی ئەمە ببیستن. بۆیە نەهی كراوە لـە بیسـتنی شـیعر و قسـەی ئـەهلی گـۆرانی چـونكە بـەزۆری ئـەو شـیعرانە وەهـا لێكدەدرێنەوە كە مەبەستەكانی نەفس و ئارەزوو دەردەبڕن... جا ئێمە هاوشێوەی جونەید و سەری لەكوێ بێنین؟! ئەگەر هاوشێوەی ئەوانیشمان دۆزیەوە ئەوا ئەوان شارەزان لەوەی دەیبیستن.

وەڵامـی ڕەخنـەی ئـەم سروشـت تاریكـە ئەمەیـە: (سـەری) ئامـاژەی لـە واژەكـە وەرنەگرت ئاخۆ مێینەیە یـان نێرینـە، بـەڵكوو ئامـاژەی لـە واتاكـەی وەرگـرت وەك ئەوەی بەم دێڕانە قسە لەگەڵ خۆشەویستەكەی دەكـات و دەڵـێ: لـە ترسـی پشـت تێكردن و دووركەوتنەوەت دەگریم!

بۆ ئەو ئەمە هاتۆتە ئاراوە و وەها تێی گەیشتووە بۆیە هـەرگیز سـەرنجی نەداوەتـە مێینە و نێرینەی واژەكە، تۆش لەمە تێ بگە. تا ئێستاش وریـا و بـەئاگاكان ئامـاژە لە شتێكی هاوشێوەی ئەمە وەردەگرن..

بە دەسخەتی (ئیبن عەقیل) ئەمەم دیت كـە لـە شـێخە گـەورەكانی گێڕابـووەوە كـە گوێی لە ژنێك بووە ئەم شیعرەی وتووە:

غسلتي له طول الليل      فركتي له طول النهار

خرج يعاين غيري      زلقي وقع في الطين

بەدرێژاییی شەو جلوبەرگم شووشت و بە ڕۆژیش ماڵم بۆ ڕێك خست کەچی چووە دەرێ سەیری غەیری من بکات، خلیسکا و کەوتە نێو قوڕ و چڵپاوەوە.

لەوەوە ئامازەیەکی وەرگرت کە واتاکەی ئەمەیە: ئەی بەندەکەم! ئەمن بەجوانیم دروست کردوویت و ڕێك و پێکم کردیت و جەستەتم قیت و قنج کردیت کەچی ڕوو لە غەیری من دەکەیت، دە بڕوانە سەرەنجامی سەرپێچیکردنت لە من!

## ١٠٠- خۆپاراستن له شته گوماندارەكان

وەدەسـهێنانی شـتێك لـه دونیـا تووشـی جۆرێـك لـه جۆرەكـانی دەسشـلكردن (الرخصـة)ی كـردم، هـەر چـەند شـتێكم لـه دونیـا بەدەسـت دێنـا شـتێكم لـه دڵ لـه دەسـت دەچـوو، هـەر كـات ڕێـی وەدەسـهێنانی دونیـام لـه بـەردەم ڕوونـاك دەبوو تاریكایی له دڵمدا نویێ دەبووەوە.

وتم: ئـەی نەفسـی بـەد! گونـاه دڵـبڕە، پێغەمبـەر (صـلى الله عليـه وسـلم) فەرموویـەتی: ((اسـتفت قلبـك)) حسـن صـحيح رواة أحمـد و الـدارمي.. واتـە: لـه دڵـت بپرسـه و فـەتوا لـەو وەربگرە..هـەموو دونیـا هـیچ خێرێكـی نییـه ئەگـەر بـه هـۆی بەدەسـهێنانیەوە لـه دڵـدا شـتێك دروسـت ببـێ كـه ببێتـه هـۆی جۆرێـك لـه لێڵـی و خـەم، بەهەشـتیش ئەگـەر بـه هۆیـەك بەدەسـت بێـت كـه تانـه بـدات لـه دیـن یـان مامەڵـه ئـەوا چـێژی نییـه! نووسـتن لەسـەر گوفـەك و سـەرەنوێلكەكان لەگەڵ سەلامەتیی دڵ له لێڵی خۆشتره له قەنەفەی پاشایان.

هێشـتا لەگـەڵ نەفسـم لـه ململانێـدام، جارێـك ئـەمن زاڵ دەبم و جارێـك ئـەو، پاشـان بانگەشـەی ئـەوە دەكـات كـه وەدەسـهێنانی هەنـدێ شـت پێویسـتە و دەڵـێ: لـه كەسـابەتی ڕێپێـدراودا ڕواڵـەت نابـەزێنم! منـیش پـێم وت: ئـەدی (ورع) ڕێ لەمـه نـاگرێ؟ وتـی: بـا.. وتم: ئـەدی بەمـه دڵ ڕەق نـابێ؟ وتـی:

بـا.. وتم: خێـرت لـه شـتێکدا نییـه کـه ئەمـه بەرهەمەکـەی بێـت! (ورع واتـه دووربوون له گوناه و ئەو شتانەی گومانیان لەسەره).

هـاوار بـۆ تـۆ! گـویٚ بگـره بـا قسـەت بـۆ بکـەم! ئەگـەر شـتێکت لـه دونیـا کـۆکردەوه کـه گومـانی تێـدا بـوو ئایـا تـۆ یـەقینت هەیـه کـه دەیبەخشـی؟! وتـی: نـا..وتم: مەینـەتی ئەوەیـه غـەیر ئەمـەی دەسـتکەوێت و تـۆش تـەنها ماندووبوونی دونیا و تاوانی دوارۆژت بۆ بمێنێتەوه..

واوەیلا بۆ تۆ! لـەپێناو خـودا واز لـەو شـته بێنـه کـه (ورع) ڕێگـری لیٚ دەکـات، بـه واز لیٚ هێنـانی لەگـەڵ خـودا مامەڵـه بکـە، وەك ئـەوەی تـۆ دەتـەویٚ تـەنها واز لـەو شـتانه بێنیـت کـه حـەرامن و دروسـت نین..ئـەی نەتبیسـتووه لـه فـەرمودەدا هـاتووه ((هـەر کەسـێك لەبـەر خـاتری خـودا واز لـه شـتێك بێنـیٚ خـودا بـه شـتێکی لـەو باشـتر بـۆی قـەرەبوو دەکاتـەوه.)) صـحيح رواة وكيـع في الزهد و أحمد و النسائي..

ئایـا پەنـد وەرناگریـت لـەو خەڵکانـەی مـاڵی دونیایـان کـۆکردەوه و کەسـانێتر دەسـتیان بەسـەردا گـرت و هیوایـان بـەم ماڵـه هـەبوو بـەڵام نەگەیشـتن بـه هیواکانیـان؟! چـەندان زانـا کتێبگـەلێکی زۆری وەسـەریەك نـا بـەڵام سـوودیان لیٚ وەرنـەگرت! چـەندان کەسـیش ده بـەش کتێبیشـی نـەبوو بـەڵام ئـەوەی هـەیبوو سـوودی لیٚ وەرگـرت! چـەندان کـەس ژیـانێکی ئاسـوودە و خۆشـی هـەبوو دوو دیناریشـی نـەبوو! چـەندان کەسـی دەوڵەمەنـد و زەنگینـیش ژیـانی ژەقنەبووت بوو!

ئایا عەقڵ و زیرەکییت نییە تا سەرنجی حاڵوباری ئەو کەسانە بدەیت لە ڕوویەك شلی دەکات و لە چەندان ڕوو لێی دەسەنرێتەوە؟! ڕەنگە خاوەن ماڵێك خۆی یان منداڵی تووشی نەخۆشییەك ببێت چەندان ئەوەندەی وەدەستی هێناوە خەرجی بکاتەوە، بەڵام کەسی خۆپارێز لە حەرام ساغ و سەلامەتە.

نەفس لە دەست سەرزەنشتی من هاواری لێ بەرز بۆوە و وتی: ئەگەر واجبی شەرع نەبەزێنم چیت لێم دەوێت؟ وتم: لە زیان و فێڵ دەتپارێزم، تۆش ناخی خۆت باشتر دەناسی. وتی: پێم بڵێ چی بکەم؟ وتم: ئاگات لە چاودێریی ئەو خودایە بێت کە دەتبینێت و خۆت وا بێنە بەرچاو کە لە بەردەم کەسێکدایت کە لە لای خەڵك گەورەیە، ئێستا تۆ لە بەردەمی پاشای هەرە مەزنیت کە خودایە، ئەوەی ئەو لە ناوەوەت دەبینێ گەورەکانی دونیا لە ڕواڵەتیشت نایبینن، دەست بەو شتەوە بگرە کە دوورە لە گومان و وریابە لە دەسشلکردن لە فرۆشتنی یەقین و تەقوا بە ئارەزوویەکی کاتی، ئەگەر نەفس و تەبیاتت بێتاقەت بوو لەوەی تووشی دەبیت پێی بڵێ: پەلە مەکە، هێشتا ماوەی ئامازە تەواو نەبووە! خوداش بەرەو وەدیهاتن و سەرکەوتن ڕێنوێن و هاوکارتە.

## ١٠١- هيچ تاوانێك فەرامۆش ناكرێ

هێشتا لە كۆمەڵێك لە پیاوە زل و پایەدارەكانم گوێ لێ دەبێ كە مەی دەخۆنەوە و بەدكاری و ستەم و كاری وەها دەكەن كە شیاوی سزادانن!

بەردەوام بیر لەمە دەكەمەوە و دەڵێم: كەی لەسەر ئەمانە تاوانێك ساغ دەبێتەوە كە ببێتە هۆی سزادانیان؟ ئەگەر ساغیش بۆوە كێ سزایان دەدات؟! ئەمە بەدوور دەزانم چونكە ئەمانە لەبەر پلە و پۆستیان ڕێزیان لێ دەگیرێ و دەستیان بۆ نابردرێ!

هەمیشە بیرم لەوە دەكردەوە كە ئەو سزایەی دەبێ بدرێن پەك خراوە تا ئەوەی دیتمانن شكستیان هێنا و بە داوەوە بوون و چەندان جار گیران و شتی سەیروسەمەرەیان بەسەرهات، لە بەرانبەر ستەمەكەیان ماڵ و سامانیان لێ سەندرا و پاش زیندانیكردنی دوور و درێژ و كۆت و بەندی قورس و زەلیلی زۆر چەند قات سزا دران، هەبوو دوای چەرمەسەرییەكی زۆر كوژرا! ئیتر زانیم هیچ شتێك فەرامۆش ناكرێ و پشتگوێ ناخرێ..زۆر وریا و ئاگادار بن، سزا بۆ هەموو ستەمكارێك لە بۆسەدایە.

## ١٠٢- دەسگرتن بە هۆکارەکان

هەوڵ و کۆششی کەسی ژیر و هۆشمەند لە پێناو ژیانێکی باش و خۆش بەپێی عەقڵ و شەرع پێویستە و داواکراوە، وەکوو پاراستنی ماڵ و سامان و هەوڵدان بۆ پەرەپێدان و ئارەزووی زیادکردنی، چونکە هۆکاری مانەوەی مرۆڤ ماڵ و سامانەکەیەتی.. نەهی کراوە لە تەخشان و پەخشانکردنی سامان و بە مرۆڤ وتراوە: ﴿وَلَا تُؤْتُوا۟ ٱلسُّفَهَآءَ أَمْوَٰلَكُمُ﴾ (النساء: ٥) واتە: ماڵ و سامانەکانتان مەدەنە دەست کەسانی نەزان و کەمفام..هەروەها بە مرۆڤ ڕاگەیەنراوە کە سامان هۆکاری مانەوەیە:﴿ٱلَّتِى جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمْ قِيَٰمًا﴾(النساء: ٥) واتە: خودا سامانی بۆ کردوون بە مایەی گوزەران..هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَلَا تَبْسُطْهَا كُلَّ ٱلْبَسْطِ﴾ (الإسراء: ٢٩) واتە: دەسبڵاو مەبە و لە خەرجکردن دەستەکانت بەتەواوی مەکەوە لێت بڕژێت. هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَلَا تُبَذِّرْ تَبْذِيرًا ﴿٢٦﴾﴾ (الإسراء: ٢٦) واتە: دەسبڵاو مەبە و سامانت تەخشان و پەخشان مەکە. دیسان فەرموویەتی: ﴿وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَنفَقُوا۟ لَمْ يُسْرِفُوا۟ وَلَمْ يَقْتُرُوا۟ وَكَانَ بَيْنَ ذَٰلِكَ قَوَامًا ﴿٦٧﴾﴾ (الفرقان: ٦٧) واتە: ئەو کەسانەی کاتێ دەبەخشن و خەرج دەکەن نە زێدەڕۆیی و دەسبڵاوی دەکەن نە دەسقوچاو و پیسکەیی، بەڵکوو ڕێگای مامناوەند هەڵدەبژێرن.

لەبارەی باشیی و گرینگیی سامانەوە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿مَّن ذَا ٱلَّذِى يُقْرِضُ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا﴾ (البقرة: ٢٤٥) واتە: کێ هەیە قەرزێکی جوان و باش بداتە خوای گەورە؟! هەروەها فەرموویە: ﴿وَأَنفِقُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ (البقرة: ١٩٥) واتە: لەپێناو خودا

ببەخشن..لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ﴾( البقرة: ٢٦١) واتە: ماڵ و سامانیان دەبەخشن.. هەروەها فەرموویە: ﴿لَا يَسْتَوِي مِنكُم مَّنْ أَنفَقَ مِن قَبْلِ ٱلْفَتْحِ﴾ (الحديد: ١٠) واتە: ئەوانەی پێش ڕزگارکردنی شاری مەککە و ئەوانەی دواتر بەخشیویانە وەکیەك نین..

خودا ماڵ و سامانی گێڕاوە بە نیعمەت و زەکات لێدانیشی کردووە بە مایەی پاکبوونەوەی، لەم بارەوە فەرموویەتی: ﴿خُذْ مِنْ أَمْوَٰلِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِم بِهَا﴾ (التوبة: ١٠٣) واتە: لە ماڵ و سامانیان سەدەقەیەك وەربگرە کە بە هۆیەوە لە ڕەزیلی و قرچۆکی پاکیان بکەیتەوە..پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ((نعم المال الصالح للرجل الصالح)) صحيح رواة البخاري و أحمد. واتە: باشترین ماڵ و سامانی باش ئەوەیە کە هی پیاوێکی باش بێت..هەروەها فەرموویەتی: ((هیچ سامانێك وەکوو سامانی ئەبووبەکر سوودی پێ نەگەیاندووم)). ئەبووبەکر (خودا لێی ڕازی بێت) بۆ بازرگانی دەڕۆیشت و پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) بەجێ دەهێشت بەلاَم پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ڕێگری لێ نەدەکرد. عومەری کوڕی خەتتاب (خودا لێی ڕازی بێت) وتوویەتی: (ئەگەر لەپێناو پەیداکردنی نان و پاراستنی ئاوڕووی خۆم لەنێوان دوو دۆڵدا بمرم پێم خۆشترە لەوەی لە غەزای پێناو خودا بمرم).

کۆمەڵێك لە هاوەڵان بازرگانییان دەکرد، هەروەها لە تابیعین سەعیدی کوڕی موسەییەب، لە دوای خۆی ماڵ و سامانێکی زۆری بەجێهێشت و ئەو بە تەنها بازرگانی ڕۆنی دەکرد..

پاشان مرۆڤ جاروبار تووشی هەندێ پێشهاتی وەکوو نەخۆشی دەبێ کە بۆ چارەسەر پێویستی بە پارە دەبێ، ئیتر ئەگەر پارەی نەبێ ڕەنگە پەنا بباتە بەر فرتوفێڵ بۆ دەسکەوتنی و لەم نێوەندەشدا ئابڕوو و دینی لەکەدار دەبێ.

پاشان لە کاتی بوونی ساماندا نەفسی مرۆڤ هێزێکی دێتەوەبەر کە بە لای پزیشکەکانەوە ئەمەش جۆرێکە لە دەرمان و حیکمەتێکە خودا دایناوە.

پاشان خەڵکێك پەیدا بوون بەدوای ڕێگای ئیسراحەتدا گەڕان و بانگەشەی ئەوەیان کرد ئەوان پشتیان بە خودا بەستووە و وتیان: ئێمە هیچ شتێك بەدەستەوە ناگرین و بۆ سەفەریش توێشوو نابەین و ڕۆزیی جەستەش بۆ خۆی دێت!

ئەمەش پێچەوانە و دژی شەرعە: پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) نەهی کردووە لە بەفیڕۆدانی ماڵ و سامان و پێغەمبەر مووساش کاتێ بۆ گەڕان بەدوای پیاوەباشەکەدا سەفەری کرد توێشووی هەڵگرت، پێغەمبەری خۆشمان (صلی الله علیه وسلم) کاتێ بۆ مەککە کۆچی کرد توێشووی هەڵگرت، لە هەموو ئەمانەش گرینگتر و کاریگەرتر ئەم ئایەتەی خوای گەورەیە: ﴿وَتَزَوَّدُواْ فَإِنَّ خَيْرَ ٱلزَّادِ ٱلتَّقْوَىٰ﴾ (البقرة: ١٩٧) واتە: توێشوو بکەن و باشترین توێشووش تەقوایە..

پاشان ئەم سۆفییانە بانگەشەی ڕقبوونەوە لە دونیا دەکەن، تێ ناگەن دەبێ ڕقمان لە چ شتێك ببێتەوە و پێیان وایە زیاد داواکردنی سامان سووربوون لەسەر دونیا و چڵێسییە!!

بە گشتی، بە بۆچوونی خۆیان ڕێگایەکیان داهێناوە کە ئەگەر ڕاست بکەن جۆرێکە لە ڕەهبانییەت، ئەگەریش بە ناوی زوهدەوە تۆڕی ڕاوکردنی خەڵکی سادەیان

دانابێ ئەوا ئەمە جۆرێکە لە ساختەیی و فرتوفێڵ!! ئیتر ئەوەی دەستیان دەکەوێ لە ڕۆزی و سامان ناویان لێ ناوە فەتحکردن!!

(ئیبن عەقیل) وتوویەتی: (هەر کەسێك وتی: ئەمن دونیام خۆش گەرەك نییە درۆزنە، پێغەمبەر یەعقووب کاتێ کوڕەکانی داوایان لێ کرد ڕێیان پێ بدات بنیامینیش لەگەڵ خۆیان بۆ میسر ببەن وتی: ﴿هَلۡ ءَامَنُكُمۡ عَلَيۡهِ﴾ (یوسف: ٦٤) لێتان دڵنیابم؟.. کوڕەکان وتیان: ﴿وَنَزۡدَادُ كَيۡلَ بَعِيرٖۖ﴾ (یوسف: ٦٥) باری وشترێك گەنم زیاتر وەردەگرین! وتی: بیبەن.

پێشینان وتوویانە: هەر کەسێك بانگەشەی بوغزاندنی دونیای کرد ئەوا لەلای من درۆزنە تا ڕاستگۆییەکەی دەسەلمێت، ئەگەر سەلماش کە ڕاست دەکات ئەوا شێتە!!

کۆمەڵێك لە سۆفییەکان خەڵکێکیان لە کاروکاسبی تەرە کرد و دوور خستەوە لەوەی کە کارکردن نەریتی پێغەمبەران و پیاوچاکانە..ئەم سۆفییانە بەدوای ڕێگای ئیسراحەت و تەنبەڵیدا وێڵ بوون و پاڵیان دابووەوە شتیان بۆ بێت، کە تێر دەبوون دەڕەقسین، کە خواردنەکەیان هەرس بووایە دیسان دەلەوەڕان، ئەگەر فێڵێکیان لە بەرانبەر دەوڵەمەندێك بدۆزیبایەوە دەعوەتێکیان بەسەردا دەسەپاند یان بە هۆی سوپاسێك یان بە هۆی داوای لێخۆشبوونێك.. گەورەترین کارەساتیش ئەوە بوو کە بانگەشەیان دەکرد گوایە ئەمە نزیکبوونەوەیە لە خودا! زانایان لەسەر ئەوە کۆدەنگن کە هەر کەسێك بانگەشەی ئەوە بکات کە سەما و ڕەقسین نزیکبوونەوەیە لە خودا ئەوا بێباوەڕ بووە، ئەگەر بیانوتایە: ڕێپێدراوە ئەوا شیاوتر بوو! چونکە

نزیكایەتی لە خودا تەنها بە شەرع دەزانرێ و لە شەرعیشدا نە فەرمانكردن بە سەما هەیە نە داواكردن.

پێم گەیشتووە كە كۆمەڵێك مۆمیان بە ڕووی مێرمندالّی لووسكە هەڵدەكرد و سەیریان دەكردن! كە لەبارەی ئەم كردەوەیان لێیان پرسیون گاڵتەیان بە خاوەن پرسیارەكە كردووە و وتوویانە: پەند لە خەڵقی خودا وەردەگرین!!

هەیهوو! شەیتان ئەو جڵەوانەی بە دەستەوە گرتووە و چۆنی ویستووە ئەوهای بردووە.(سەرچۆپی بكەوێتە دەست ڕێوی بەرەو لای سەبەتەی نانی دەبات!).

ئەو كەسانە سەیرن كە تێروپڕ دەخوات و سەیر ناكات كە ئەم خواردنە لەكوێوە هاتووە!

پیاوچاكانی پێشین هەمیشە لە خواردنیان دەپێچایەوە تا ئەوەی ئیبراهیمی كوڕی ئەدهەم خۆی و هاوڕێكانی شەونخوونییان دەكرد و دەیانوت: سبەینێ لەگەڵ كێدا كار بكەین؟! هەروەها (سەری سەقەتی) خواردنی پاك و باش بوو، لە (ورع)یش چەندان پلەوپایەی هەبوو.

پاشان خەڵكێك هاتن كە بە سۆفی ناودەبران و بانگەشەی شوێنكەوتنی ئەم بەڕێزانەیان دەكرد و لە ماڵی فلانیان دەخوارد و دەشیانزانی بنەچەی ئەم ماڵانە لە كوێوە هاتووە و دەیانوت: ڕۆزیمان درا!

ئای لەو سەیروسەمەرەیە! ئەگەر بخۆر بە لایەوە گرینگ نەبێ خواردن لەكوێوە هاتووە و خۆ نەگرێ لە شەهوەت یان كەمی بكاتەوە، تەكیەش لە ناندین خاڵی

نەبێ و هیچ شەوێك نەبڕێتەوە و بنەچەكەشی لە سامانێك بێت كە زانراوە لـەكوێوە هاتووە، گەرماویش هەڵكراوە و گۆرانیبێژیش دەف لـێ دەدات و هاوڕێكەشـی بلـوێر دەژەنـێ، (سـعدی و لیلـی)ش بـە سـرود دەوتـرێن و مـۆمیش لەبـەر ڕووخسـاری لووسكەڵان هەڵكراوە ! ! پاشان دوای ئەمە زەمی دونیـا دەكـات! پێمـان بڵـێن: كـێ گاڵتە بە خەڵك دەكات مەگەر ئەوانە ؟ !

بەڵام هەر كەسێك فرتوفێڵی ئەمانە بەسەردا تێپەڕێ لەوان سووكترە.

## ١٠٣- دروستکراوە سەیروسەمەرەکانی خودا

لە کاتی چوونمان بۆ حەج لە ترسی عەرەب ڕێگای (خەیبەر)مان گرتەبەر، چیا و شاخی وەها زۆر و گەورە و ڕێگای سەیروسەمەرەم دیت کە سەراسیمەی کردم و مەزنایەتیی خودای بەدیهێنەرم لە دڵدا زیاتر بوو، وام لێ هات لە کاتی باسکردنی ئەو ڕێگایانە جۆرێك لە بەگەورەگرتنی خودام دەهاتە بەرچاو لە باسکردنی شتی تر وانەبوو.

هاوارم لە نەفس کرد: هاوار بۆ تۆ! بڕۆ بۆ لای دەریا و بە چاوی هزر سەیری خۆی و سەیروسەمەرەکانی بکە شتی وەها گەورە دەبینی کە لەمە مەزنترە. پاشان بڕۆ ناو بوونەوەر و ئاوڕی لێ بدەوە دەبینی کە لەگەڵ ئاسمانەکان و خولگەکاندا وەکوو گەردیلەیەکی نێو بیابان وایە. پاشان گەڕێك بە خولگەکاندا بکە و بە دەوری عەرشدا بخولێوە و سەرنج بدە چی لەناو بەهەشت و دۆزەخدا هەیە. پاشان لە هەموو ئەمانە دەرچوو و ئاوڕی لێ بدەوە ئەو کات تۆ هەموو جیهان لە مشتێکی ئەو خودا بەتوانایە دەبینی کە توانای بێسنوورە.

پاشان ئاوڕ لە خۆت بدەوە و تەماشای سەرەتا و کۆتاییی خۆت بکە و بیر لە پێش سەرەتا بکەوە دەبینی جگە لە عەدەم و نەبوون چیتر نەبووە، دواتریش ڕزیبوونە و جگە لە خاك و خۆڵ چیتر نییە.

کەسێك بە چاوی فیکری سەیری سەرەتا و کۆتـایی کردبێـت چـۆن دڵبەسـتەی ئـەم بوونە دەبیّ؟! چۆن کەسی خاوەندڵ لە یادکردنی ئەم خودا مەزنە بێئاگا دەبیّ؟!

سوێند بە خوا، ئەگەر نەفس لـە مەسـتیی ئـارەزوو بێـدار ببێتـەوە لـە ترسـی خـودا دەتوایەوە یان لە خۆشەویستیی ئەودا ون دەبوو، بەڵام هەست زاڵ بووە و لە کـاتی بینینی چیادا توانای خودای مەزن دێتە بەرچاو، ئەگـەر عـەقڵ و زیرەکـی سـەرنجی واتاکانی دابوایە ئەوا توانای خـودا بەسـەر مرۆڤـدا بەڵگەیـەکی تێروتـەواوتر بـوو لـە چیا.

پاك و بێگەردی بۆ ئـەو خودایـەی زۆربـەی خـەڵکی بـەوەی تێیـدان مـژوول کـردووە لەوەی بۆی خوڵقێنراون!

## ١٠٤- ئارامگرتن لەسەر بەڵا

چورتم و بەڵا لە کن خودای گەورە وادە و کاتی کۆتاییهاتنیان زانراوە بۆیە پێویستە کەسی گرفتار ئارام بگریٚ تا کاتی بەڵاکە تەواو دەبێت، ئەگەر پێش وادەکە پەشۆکا و نیگەران بوو ئەوا ئەم پەشۆکانە سوودی نییە. پەلەکردن لە لاچوونی بەڵا لەگەڵ تەقدیرکردنی ماوەکەی سوودی نییە. ئارامگرتن واجبە، ئەگەرچی دوعا ڕێپێدراو و شەرعییە بەڵام ئەگەر لەگەڵ ئارامگرتن نەبیٚ هیچ سوودی نییە. بەڵام نابیٚ نزاخوێن پەلە بکات بەڵکوو بە ئارامگرتن و نزا و تەسلیمبوون بە خودای دانا و کارزان پەرستش دەکات و ئەو کەرەستە و هۆکارانە دەپچڕێنی کە بوونەتە هۆی بەڵایەکە، چونکە بەڵاکان ڕەنگە سزا بن.

ئەوەی پەلە دەکات ئەوا ملە لەگەڵ خودا دەکات و ئەمەش پایەی بەندایەتی نییە و، ڕازیبوون پایەی هەرە بڵندە. ئارامگرتن پێویستە و، سووربوون و پێداگری بە دوعای زۆر باشترین شتێکە پشتی پیٚ ببەستریٚ و ڕەخنە و پەلپ گرتن قەدەغەیە و پەلەکردنیش ملەکردنە لەگەڵ تەگبیری خودا..لەم شتانە تیٚ بگە چونکە ئەمانە بەڵا و چورتم سووک دەکەن.

## ١٠٥- ئەو شتانەی كۆمەكی ئارامگرتن دەكەن

هیچ شتێك لە بووندا هێندەی سەبر و ئارامگرتن دژوار نییە، جا لە شتی خۆشویستراو و حەزلێكراو بێت، یان لەسەر شتی ناخۆش و بەئازار، بەتایبەتی ئەگەر كاتەكەی درێژ بۆوە و زۆری خایاند یان بێهیوا بوویت لە هاتنی خۆشی و شادی. ئەو ماوەیەش پێویستی بە توێشوویەكە كە بە هۆیەوە سەفەری سەبر ببڕدرێ. توێشووش لە چەند جۆرێك پێكهاتووە:

- دەبێ سەرنجی ئەندازەی بەڵایەكە بدەین كە دەكرا زۆرتر بێت لەوەی هەیە.

- هەیە لە حاڵێكدایە كە سەرووتر گەورەترە، وەكوو مرۆڤ منداڵێكی لەدەست بدات بەڵام لەو خۆشەویستتری بۆ بمێنێتەوە.

- هەروەها ئومێدی قەرەبووكردنەوەی لە دونیا.

- لەبەرچاوگرتنی پاداشت لە ئاخیرەت.

- چێژبینین لە ستایش و پێداهەڵگوتنی خەڵك لەسەر ئەو ئارامییەی گرتووتە و ستایشت دەكەن، هەروەها پاداشتی خودا.

- هەروەها بێئارامی و بێتاقەتی سوودی نییە و حەیای خاوەنەكەی دەبات.

هەروەها شتی تریش کە عەقڵ و فیکر تانەی لێ دەدات، لە ڕێگای سەبڕ جگە لە بەخشینی ئارامگرتن شتێکی تر نییە، پێویستە ئارامگر خۆی پێوە مژوول بکات و کاتەکانی گرفتاربوونی پێ بەسەرببات و هاکا تەواو بوو و نەما.

## ١٠٦- له گیرابوونی دوعا پەلە مەکەن

پێویستە لەسەر ئەو کەسەی تووشی دەردەسەرییەك بووە و پاشان دوعای کردووە لە دواکەوتنی گیرابوون یان گیرانەبوونی دوعاکەی دڵتەنگ و دڕدۆنگ نەبێ چونکە ئەو زاتەی کە دەبێ داوای لێ بکات خاوەنی هەموو شتێکە و دانایە، ئەگەر وەڵامی نەداوە ئەوا لە موڵکەکەی خۆیدا چی ویستووە ئەوەی کردووە، ئەگەریش وەڵامدانەوەی دوعاکە دواکەوت ئەوا خودا بەپێی پێویستیی حیکمەتی خۆی کردوویەتی، ئەو کەسەی لە ناخەوە ڕەخنە لە خودا دەگرێ بەندەی تەواو نییە.

پاشان با بزانێت هەڵبژاردنی خودا بۆی لە هەڵبژاردنی خۆی بۆ خۆی باشترە. ڕەنگە داوای لافاوێك بکات و بیبات!

ئەگەر بەندە داوەری دایە دەست حیکمەت و حوکمی خودا و دڵنیا بوو لەوەی کە هەموو شتێك موڵکی ئەوە ئەوا دڵی خۆش و ئارام دەبێ جا پێویستییەکەی جێبەجێ بکرێ یان نا.

لە فەرموودەدا هاتووە: ((هەر موسڵمانێك لە خودا بپاڕێتەوە ئیللا خودا وەڵامی دەداتەوە: یان زوو وەڵامی دەداتەوە یان درەنگ یان بۆ ئاخیرەت بۆی هەڵدەگرێ.)) صەحیح، ئیمامی ئەحمەد و ئەبوو نەعیم و ئەلحاکم گێڕاویانەتەوە.

ئەگـەر ڕۆژی دوایـی بینـی ئـەوەی گـیرا بـووە ڕۆیشـتووە و ئـەوەی گـیرا نـەبووە پاداشتەکەی ماوەتەوە ئەوا دەڵێ: خۆزگە هەرگیز هیچ دوعایەکم گیرا نەبووایە!

لەم شتانە تێ بگە و دڵت ساغ و پارێزراو بکە لەوەی گومان یان پەلەپەلێکی بەناودا بێت.

## ١٠٧- گەورەییی زانست

هەر کەسێك ویستی ئاستی زانایان بەسەر زاهیدانەوە بزانێت با سەیری ئاستی جیبریل و میکائیل و ئەو فریشتانە بکات کە تایبەت کراون بە دەسەڵاتێکی پەیوەست بە خەڵق و، سەرجەم فریشتەکانی تر کە خەریکی خواپەرستین و لە ئاستی ڕاهیبەکانی نێو پەرستگاکان دان.

ئەم فریشتانە بە ئەندازەی زانست و زانیارییان لەبارەی خوداوە نزیکایەتییان پێ بەخشراوە.

ئەگەر یەکێکیان سروش(وحی) ببات ئەهلی ئاسمان نیگەران دەبن تا هەواڵەکەیان پێ دەدات ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا فُزِّعَ عَن قُلُوبِهِمۡ قَالُواْ مَاذَا قَالَ رَبُّكُمۡۖ قَالُواْ ٱلۡحَقَّۖ﴾ (سبأ: ٢٣) واتە: جا ئەو دەمەی ترسی دڵیان دادەمرکێ پێیان ئێژن: پەروەرێنی ئێوە چی وت؟ ئێژن: هەر هەق و ڕاستی وت..

هەروەك زاهید لە فەرموودەیەك نیگەران دەبێ و لەبارەی ڕاست و دروستیی و واتاکەیەوە لە زانایان دەپرسێ.. پاك و بێگەردی بۆ ئەو زاتەی کۆمەڵێکی تایبەت کردووە بە چەند تایبەتمەندییەك کە بە هۆیانەوە بەڕێز بوون بەسەر هاوچەشنەکانیان!

هیچ تایبەتمەندییەك بەڕێزتر نییە لە زانست، بە زیادبوونی، ئادەم بووە كڕنووش بۆبردراو و، بە كەمبوونیشی، فریشتەكان بوونە كڕنووشبەر، ئیتر نزیكترین خەڵق لە خودا زانایانن.

زانست تەنێ بە ڕواڵەت و شێوەكەیەوە سوودبەخش نییە بەڵكوو واتاكەی گرینگ و سوودبەخشە: واتاكەشی بەوە بەدەست دێت كە بۆ كارپێكردن فێری بیت، هەر كاتێ زانست چاكە و فەزڵێكی پێ نیشاندا هەوڵی بەدەسهێنانی بدات، هەر كاتێكیش لە كەموكورتییەك نەهی لێ كرد لێی دووركەوێتەوە، ئەو دەم زانست نهێنیی خۆی بۆ ئاشكرا دەكات و ڕێگای گەیشتن پێی ئاسان دەبێ.

ئەوەشی كار بە زانست ناكات زانست ناخ و ناوەڕۆكی خۆی پێ نابەخشێ و نهێنیی خۆی بۆ ئاشكرا ناكات..ئیتر لەم نموونەیە تێ بگە و نیازت باشكە وەگەرنا سەرت سووڕنەمێنێ!

## ١٠٨- میانەڕەوی لە هەموو شتێکدا

بزانە باشترین و گونجاوترین کار و شتەکان میانەڕەوییە (اعتدال) لە هەموو شتێکدا:

ئەگەر دیتمان ئەهلی دونیا هیوا و ئاواتەکان بەسەریاندا زاڵ بووە و کارەکانیان لە خێردا خراپ بووە ئەوا فەرمانیان پێ دەکەین یادی مردن و گۆڕ و ئاخیرەت بکەن. بەڵام ئەگەر کەسی زانا یادی مردنی لەبیر نەدەچوو و فەرموودەکانی باسی ئاخیرەت بەسەریدا دەخوێنرایەوە و خۆشی دەیخوێندنەوە، زێدەباری ئەوەش یادەوەریی مردن سوودی نییە ئیللا بە پچڕاندنی یەکجاری نەبێ. بەڵکوو بۆ ئەم زانایە زۆر ترساوە لە خودایە کە زۆر یادی ئاخیرەت دەکات پێویستە خۆی لە یادی مردن مژوول بکات تا تۆزێك هیوای بۆ بگەڕێتەوە، کتێب بنووسێ و کاری خێر بکات و بتوانێ منداڵ بێنێتە دونیاوە، بەڵام ئەگەر یادی مردنی بە زاردا هات ئەوا خراپییەکەی زیاترە لە چاکییەکەی.

ئەی نەتبیستووە کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێشبڕکەی لەگەڵ عائیشەی هاوسەری کردووە و هەر جارەی یەکێکیان بردوویەتیەوە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) گەمە و گاڵتەی دەکرد و نەفسی سەرگەرم دەکرد.

زانین و ئاگاداربوونی تەواو لە ڕاستییەکان جەستە خراپ و نەفس نیگەران دەکات. لە زاری ئەحمەدی کوڕی حەنبەل گێڕدراوەتەوە کە داوای لە خودا کردووە دەرگای

ترسی لێ بکاتەوە، ئەویش لێی کردۆتەوە، ئیتر لە عەقڵی خۆی ترساوە و داوای لە خودا کردووە ئەوەی لێ دوورخاتەوە و دەرگاکە قەپات بکاتەوە.

لەم بنچینەیە ڕابمێنە و لێی وردبەوە، پێویستە پشوو بە نەفس بدەین و بە کاروباری دونیاوە سەرقاڵی بکەین، لەوەشدا باشی و چاکبوونی وی تێدایە..

## ١٠٩- فەزڵی بڵندخوازی

هــەر کەســێ بــیری ســاف و ســازگاری خــۆی بــەکارهێنا ئــەوا بــیری بــەرەو داواکردنــی بــەرێزترین پلەوپایــە رێنــوێنی دەکــات و نــەهی لێ دەکـات رازی بێــت بە کەموکورتی لە هەموو بارێکدا.

(أبو الطيب المتنبي) وتوویە:

ولَـم أرَ فِي عيـوبِ النـاسِ عيبًـا كـنقصِ القـادرينَ عـلى التمامِ

لــە نەنگییــەکانی خــەڵك هــیچ نەنگییــەکم نــەدیتووە ناشــیرینتر بێــت لــەوەی کەسـێك توانـای تـەواوکردنی کـار و شـتێکی هـەبێ و نـەیکات و بـە کـەموکورتی بیهێڵێتەوە !

پێویسـتە کەسـی عاقـڵ بـۆ هـەر کارێـك تـا ئەوپـەڕی توانـا هـەوڵ بـدات: ئەگـەر ئـــادەمیزاد بیتوانیبایـــە بـــەرەو ئاسمانـــەکان هەڵکشـــێ گـــەورەترین و ناشـــیرینترین کـــەموکورتی ئـــەوە بـــوو بـــە زەوی رازی بێـــت، ئەگـــەر پێغەمبەرایـەتی بـە هەوڵـدان وەدەسـت هاتبایـە پـێم وایـە لـە وەدەسـهێنانیدا کەمتەرخـــەم بووایـــە لەوپـــەڕی نزمیـــدا دەبـــوو، بـــەڵام ئەگـــەر ئـــەوە نـــەکرا پێویسـتە ئـەوەی مومکینـە و دەکـرێ داوا بکـرێ، ژیـانی جـوان لـە کـن دانایـان

بریتییە لەوەی نەفس لە زانست و کردەوەدا بگاتە ئەوەپەڕی کەماڵی مومکین..

ئەوەی لێرەدا باسی دەکەم ئاماژەیە بۆ ئەوەشیان کە باسی ناکەم(مشتێك نموونەی خەروارێکە):

سەبارەت بە جەستە ئەوا شێوەکەی بە دەست مرۆڤەوە نییە بەڵام ئەوەی بە دەست مرۆڤەوەیە جوانکردن و ڕازاندنەوەیەتی، بۆ کەسی عاقڵ زۆر ناشیرینە خۆی پشتگوێ بخات.

شەرع کە باسی هەندێکی کردووە ئاماژەیە بۆ هەموو، فەرمانی کردووە بە نینۆك کردن و تاشینی بنباڵ و بەر و، نەهی کردووە لە خواردنی سیر و پیازی خاو لەبەر بۆنی ناخۆشیان.

پێویستە لەسەر ئەوە قیاس بکرێ و مرۆڤ بایەخ بەوپەڕی خاوێنی و جوانکاری و ڕازانەوە بدات. بە هۆی بۆنی خۆشەوە بە هاتنی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەزانرا، ئەوپەڕی پاك و خاوێن بوو.

ناڵێم وەکوو کەسی وەسوەسەدار ئاو زۆر خەرج بکەن بەڵکوو مامناوەندبوون پەسندکراوە. پاشان پێویستە مرۆ ئاگای لە جەستەی بێت و ئازاری نەدات و خۆراکی کەم پێ نەدات نەوەك هێز و توانای کەم ببێتەوە.

ناشـــڵێم ئەوەنـــدە زۆر بخـــۆن ببێتـــە هـــۆی قرپێنە(قرقێنـــە) بـــەڵكوو لەوەشـــدا مامناوەنـد بـن، هێـز و تواناكـانی مـرۆڤ وەكـوو كانیاوێكـە كـە لەبـەری بـڕوات، سوودی بۆ خۆی و غەیر هەیە.

نـابێ بـە قسـەی وەسوەسـەدارە زاهیدانـەكان بكرێـت كـە هـەوڵی كەمكردنـەوەی خـــواردن دەدەن و لـــە ئەنجامـــدانی فـــەرزەكان سســـت دەبـــن، ئـــەوەش لـــە شـەرعدا نییـە و نـە لـە پێغەمبـەر (صـلی الله علیـە وسـلم) و نـە لـە هـاوەڵانی شـتی وا نـەقلّ نـەكراوە، پێغەمبـەر (صـلی الله علیـە وسـلم) و هـاوەڵانی ئەگـەر هیچـیان دەســت نەكەوتبایــە برســی دەبــوون و ئارامیــان لەســەر برســێتی دەگرت.

هـــەروەها دەبـــێ ســـەیری خـــۆراكی جەســـتە بكـــەیت، ڕەنگـــە پارووییـــەك ببێتـــە هـــۆی ڕێگریكـــردن لـــە چـــەندان پـــاروو، ئـــەوەی مـــەدەرێ كـــە ئـــازاری پـــێ دەگەیـــەنێ بـــەڵكوو دەبـــێ كامـــە باشـــتر و گونجـــاوترە پێـــی بـــدرێ، گـــوێ بـــەو زاهیـــدە مـــەدە كـــە دەڵـــێ: ئارەزووەكـــانی جەســـتە بـــەجێ نـــاهێنم!! ئـــەوەی پێویســـتە ڕەچـــاو بكرێـــت حـــەڵاڵی خۆراكەكـــە و پێـــدانی ئـــەو ئەندازەیـــە كـــە شیاوێتی و پێویستی پێیەتی( نە زیاد و نە كەم).

هـیچ شـتێك لـە پێغەمبـەر (صـلی الله علیـە وسـلم) و هـاوەڵانی نـەقلّ نـەكراوە لـەبارەی ئـەو ڕەفتارانـەی وەسوەسـەدارەكان دایانهێنـاوە لـەبارەی وازهێنـانی تـەواو لـە شـتە خـۆش و حـەزلێكردووەكان، ئـەوەی لـەوان نـەقلّ كـراوە بـە

هۆکارێك وازیان لێ هێناوە: یان لەبەر گومانیان لە حەڵاڵبوون یان لە ترسی ئەوەی نەوەك نەفس هەموو کات داوای بکات...ئەوەش دروستە.

پێویستە مرۆڤ لە بازرگانی و ئیش و کاردا هەوڵ بدات تا بەسەر غەیرەوە باڵا بێت و ئەوانیتر بەسەر ویدا زاڵ نەبن، لەوەشدا بگاتە ئاستێك کە ڕێگری لە زانست لێ نەکات.

پاشان پێویستە ئەوپەڕی زانست داوا بکات، لە ناشیرینترین کەموکورتییەکان چاولێکردن و تەقلیدە، ئەگەر هیممەتی بەهێز بوو ئەوا بەرزی دەکاتەوە تا ئەوەی بۆ خۆی مەزهەبێك هەڵبژێرێ نەك بچێتە سەر مەزهەبی هیچ کەسێك، چاولێکەر کوێرە و گەورەکەی جڵەوی ڕادەکێشێ!

پاشان پێویستە لە ناسین و مامەڵەی خوادا داوای ئەوپەڕی بکات..

بەگشتی، هەر چاکە و فەزیلەتێك کە دەتوانێ وەدەستی بێنێ با وەدەستی بێنێ، لەم بارەوە قەناعەت حاڵی نزم و خەسیسەکانە.

فَكُن رَجُلاً رِجلُهُ فِي الثَّرَى وهامةُ هِمّتِهِ فِي الثُّرَيا

پیاوێك بە کە قاچی لە زەوی و سەری هیممەتی لە ئەستێرەی سورەییا بێت.

ئەگەر توانیت هەموو زانا و زاهیدێك تێپەڕێنی ئەوا بیکە، ئەوان پیاو بوون و تۆش پیاویت، ئەوەی دانیشتووە و پاڵی داوەتەوە تەنها بە هۆی نزمیی هیممەت و تەنبەڵی بووە.

بزانە تۆ لە گۆڕەپانی پێشبڕكێدایت و كاتەكان تێدەپەڕن و دەبردرێن. تەنبەڵی مەكە و پاڵ مەدەوە، ئەوەی لە دەست چووە هەر بە هۆی تەنبەڵییەوە لە دەست چووە، ئەوەی بە دەست هاتووە تەنها بە هەوڵ و كۆشش وەدەست هاتووە، هیممەت وەكوو ئەوەی لەناو مەنجەڵ دەكوڵێت دڵ دەكوڵێنێت.

## ١١٠- ماڵ و سامان یارمەتیدەرێكی باشە

لە دونیادا هیچ شتێك هێندەی كۆكردنەوەی ماڵ و سامان بۆ زانایان سوودبەخشتر نییە تاوەكوو بە هۆیەوە لە خەڵك بێ نیاز بن، ئەگەر سامانیش چووە پاڵ زانستەوە ئەوا كەماڵ بەدەست هاتووە.

زۆربەی زانایان زانست لە كار و كەسابەت سەرقاڵی كردن ئیتر پێویستیان بە شتگەلێك بوو كە پێویست بوو و، سەریان بە هەندێ شوێندا كرد كە عەیبداری كردن ئەگەرچی تەئویلیشیان بۆ كرد بەڵام غەیری ئەم كارە بۆ ئەوان باشتر بوو!

(ئەلزوهری) لەگەڵ خەلیفە (عەبدولمەلیكی كوڕی مەڕوان) بوو!

(ئەبوو عوبەیدە) لەگەڵ (تاهیر كوڕی حوسەین) بوو!

(ئیبن ئەبی ئەلدونیا) مامۆستا و پەروەرشیاری خەلیفە (موعتەزید) بوو!

(ئیبن قوتەیبە) كتێبێكی لەبارەی ستایش و پیاهەڵدانی وەزیر( ئەبوولحەسەن عوبەیدوڵڵا كوڕی یەحیا كوڕی خاقان) داناوە.

هێشتا چەندان زانا و زاهید لە سێبەری كۆمەڵێك دەژین كە بە ستەم ناسراون.. ئەمانە ئەگەرچی بۆ ئەم كردەوەیان تەئویلێكیان دۆزیوەتەوە بەڵام ئەوەی لە دڵ و دینیان لە دەست داوە زۆر زیاترە لەوەی لە دونیا وەدەستیان هێناوە.

کۆمەڵێك لە سۆفی و زانامان بینی کە لەپێناو دەسکەوتی دونیایی دەچنە لای دەسەڵاتداران، هەیانە ماستاوچێتی و مامەحەمەیی دەکات، هەیانە بە جۆرێکی نادروست ستایش دەکات، هەیانە لە بەرانبەر خراپە و بەدرەفتاری بێدەنگ دەبێت....ماستاوچێتیی تریش، هەموو ئەمانە هۆکارەکەیان هەژارییە، زانیمان کە شکۆداریی تەواو و دووریی لە ڕووپامایی بە دووربوون لە دەسەڵاتدارە ستەمکارەکان دەبێت. ئەمەشمان بەتەواوی و دروستی تەنها لە دوو جۆرە پیاودا دیوە:

ئەوەی ماڵ و دارایی هەبووە: وەکوو (سەعیدی کوڕی موسەییەب) کە بازرگانی ڕۆن و شتی تری دەکرد، (سوفیانی سەوری) دوکانی کەلوپەلی هەبوو، ئیبن موبارەکیش.

ئەوەی زۆر ئارامگر و بەقەناعەت بوو: وەکوو (بیشری ئەلحافی) و (ئەحمەدی کوڕی حەنبەل).

هەر کاتێ مرۆڤ وەکوو ئەم دووانە ئارامی نەبوو و کەماڵی ئەوانەی پێشووشی نەبوو ئەوا بە ڕووالەت لەنێو مەینەت و بەڵا و ئافات دەتلێتەوە و ڕەنگە دینەکەشی لەناوبچێت.

کەواتە ئەی زانستخواز پێویستە لەسەرت بۆ کۆکردنەوەی ماڵ و سامان هەوڵ بدەیت تاوەکوو لە خەڵك بێ نیاز بیت، سامان دینەکەشت دەپارێزێت!

بەزۆری ئەوانەی لە دینداری و زوهد و سەرکزی تووشی دووڕوویی بوون یان زانایەك گرفتاری ئافەتێك بووە ئیللا بە هۆی خۆشویستنی دونیا بووە و زۆربەی کاتیش هەژاری هۆکار بووە.

ئەگەر ئەو کەسە ئەوەندە ماڵ و دارایییەی هەیە کە بەشی دەکات و پاشان بە تێکەڵبوونی لەگەڵ دەسەڵاتدارانی ستەمکار خوازیاری زیادەیە ئەوا ئەو جۆرە کەسانە بە چڵێس و چاوبرسی دەژمێردرێن و لە دەرەوەی بازنەی زانایانن.. لەم حاڵوبارانە پەنا دەگرین بە خودا.

## ١١١- فیقه باشترین زانسته

گەورەترین بەڵگە لەسەر باشی و گرینگیی شتێك ئەوەیە سەیری بەرهەم و بەروبوومەکەی بکەیت. هەر کەسێك سەرنج بداتە بەرهەمی فیقه دەزانیٚ کە ئەو باشترین زانستە.

خاوەن مەزهەبەکان بە هۆی فیقهەوە لە خەڵك بەرزتر و گەورەتر بوون، ئەگەرچی لە سەردەمی ئەواندا کەسانێك هەبوون لەوان زاناتر بوون بە قورئان یان فەرموودە یان زمان. هەر ئەمەش بۆ سەردەمی خۆمان ڕەچاو بکە، تۆ لاوێك دەبینی ئەو مەسەلانەی ناکۆکی و جیاوازییان لەبارەوە هەیە بەباشی دەزانیٚ ئیتر بیٚ نیاز دەبیٚ و لە شتە نوێیەکان حوکمی خودا وەها دەزانیٚ کە زانا زیرەکەکانی تر نایزانن!

چەندان کەسی دیار و هەڵکەوتوومان دیت لە زانستی قورئان یان فەرموودە یان تەفسیر یان زمان کەچی لە پیریشدا زۆربەی ئەحکامی شەرعی نازانیٚ، ڕەنگە نەزانیٚ لە نوێژیشدا چۆن نییەت بێنیٚ!

لەسەر فەقیهـ پێویستە لە زانستەکانی تریش بێئاگا و نامۆ نەبێ وەگەرنا نابێتە فەقیهـ، بەڵکوو دەبێ لە هەموو زانستێك شتێك بزانێ پاشان خۆی بۆ فیقهـ یەکلا بکاتەوە، چونکە فیقهـ شکۆداریی دونیا و ئاخیرەتە.

## ١١٢- دووفاقیی هەندێ کەس

زۆرێك لـه خـەڵكم بینـی خـۆی لـه پڕوشـكه پیسـییەك دەپاراسـت بـەڵام خـۆی لـه غەیبـــەت نەدەپاراســـت! خێـــر و ســـەدەقەی زۆریـــان دەکـــرد و لـــه مامەڵـــەی ســـووخۆری باکیـــان نـــەبوو! شـــەونوێژیان دەکـــرد و نوێـــژی فـــەڕزیان لـــه کـــاتی خۆیـدا نـەدەکرد... شـتگەلێكی زۆر کـه ژماردنیـان درێـژ دەبێتـەوە لـه پاراسـتن و گرینگیدان به لقەکان و پشتگوێخستنی بنچینەکان.

لـه هـۆی ئـەوەم کۆڵییـەوە؟ دیـتم لـه دوو شـتەوەیە: یەکـەم: عـادەت و نـەریت (خـوو پێـوەگرتن). دووەم: زاڵبـوونی ئـارەزوو لـه وەدەسـهێنانی داواکـراو، کـه ئارەزوو زاڵ دەبێ نه گوێ دەبیستێ و نه چاو دەبینێ.

لـەم ڕووەوە: براکـانی یوسـف کـاتێ گوێیـان لێ بـوو یـەکێك بانگیـان دەکـات و دەڵـێ ئێـوه دزن: ﴿إِنَّكُمْ لَسَٰرِقُونَ﴾ (یوسـف: ٧٠) ئـەوان دەڵـێن: ﴿تَٱللَّهِ لَقَدْ عَلِمْتُم مَّا جِئْنَا لِنُفْسِدَ فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا كُنَّا سَٰرِقِينَ﴾ (یوسف: ٧٣) واتـه: سـوێند بـه خـوا ئێـوه زانیوتانـه کـه ئێمـه بـۆ ئـەوه نـەهاتووین بەدفـەڕی لـه زەویدا بکەین و دزیش نەبووین.

لـه تەفسـیردا هـاتووه: ئـەوان کـاتێ چـوونه نـاو میسـڕەوه دەمـی وشـترەکانیان بەسـتا نـەوەك شـتێك بخـوات کـه هـی ئـەوان نییـه، وەك ئـەوەی بڵـێن: دیتتـان

چـيمان بـه وشـترەكانمان كـرد ئـيتر چـۆن دزى دەكـەين؟! كەچـى خۆيـان لـەبيريان كـرد چ جياوازييـەكى گـەورە هەيـە لـە نێـوان ڕفانـدنى پاروويـەك كـە هـى خۆيـان نييـە لەگـەڵ فرێـدانى يوسـفى برايـان بـۆ نـاو بـير و فرۆشـتنى بـە نرخێكى كەم!!

خـەڵك هەيـە لـە شـتە بچـووكەكان گوێڕايـەڵى دەكـات و گـەورەكان نـا، ئـەو شتەى خـەرجيى كەمـە يـان ئاسـاييە، ئـەو شـتەى لـە خـواردن و جلوبـەرگى كـەم ناكاتەوە.

خـــەڵكێك هەيـــە ســـوو وەردەگـــرن و تێياندايـــە دەڵـــێ: دوژمنەكـــەم چـــۆنم لێ دەڕوانـــێ دواى ئـــەوەى خانووەكـــەم فرۆشـــت يـــان جلوبـــەرگ و سوارەكەم(ئەوەى سوارى دەبم) گۆڕا؟!

خـــەڵكێك دەبيـــنين لـــە پاكوخاوێنيـــدا تووشـــى وەسوەســـە دەبـــن و ئـــاوى زۆر بەكاردێنن كەچى خۆ لە غەيبەت ناپارێزن!!

خـــەڵكێكيش هەيـــە بـــۆ وەدەســـهێنانى مەبەســـتەكانيان تـــەئويلاتى خـــراپ بەكاردێنن دەشزانن كە دروست نييە!

تەنانـەت پيـاوێكم ديـت كـە لـە ئـەهلى خێـر و خواپەرسـتى بـوو، پيـاوێكى تـر هەنـدێ پـارەى پێـدا تـا مزگـەوتێك دروسـت بكـات، ئـەويش پارەكـەى بـۆ خـۆى بـرد و لـەجياتى خـەرجكردنى پارەكـە و دروسـتكردنى مزگەوتەكـە بـە شـتى

باش کەچی بە شتێکی کەم بنیاتینا! کاتێ کەوتە گیانەلاوە بە پیاوەکەی گوت: گەردنم ئازادکە، ئەوە و ئەوەم کردووە!

خەڵکێك دەبینین واز لەو گوناهانە دێنن لەبەرئەوەی لێیان دوورە و دەقیان بە وازلێهێنانی گرتووە بەڵام ئەگەر لێی نزیك بوونەوە ئەوا خۆیان پێ ناگیرێ!

ئیتر لەم جۆرە فرتوفێڵانە لەناو خەڵکیدا زۆرە و باسکردنیان درێژ دەبێتەوە.

زانیومانە کە هەندێك لە زانایانی جوولەکە قورساییی خواپەرستیی لە دینەکەیان هەڵدەگرت بەڵام کاتێ ئیسلام هات و بە ڕاستی و دروستییان زانی نەیانتوانی بەرەنگاریی ئارەزووەکانیان لە سڕینەوەی سەرۆکایەتییان بینەوە (ئەگەر موسڵمان ببووایەن سەرۆکایەتیی گەلەکەیان لەدەست دەدا).

هەروەها قەیسەری ڕۆم، بە بەڵگەوە پێغەمبەری (صلی الله علیە وسلم) ناسی، پاشان نەیتوانی بەرەنگاریی ئارەزووی (سەرۆکایەتی) ببێتەوە و واز لە موڵك و دەسەڵاتەکەی بێنێ.

بۆ خاتری خوا پێتان دەڵێم وریا بن بنچینە و ئوسوڵ فەرامۆش نەکەن و جڵەوی ئارەزوو شل نەکەن، چونکە ئەگەر مەڕومالات فەرامۆش بکرێ ئەوا

دەچێتە ناو ڕەز و باخ و شینایی خەڵك و وێرانی دەكات (ئەگەر ئاژەڵی ئارەزوو بەرهەڵدا بكەیت دەچێتە نێو باخی تەقوا و وێرانی دەكات).

ئارەزوو وەكوو درندەیەك وایە كە زنجیرێك خراوەتە ملیەوە، ئەگەر باش توند كرابێت ئەوا بەرزەفتی دەكات، ڕەنگە شتێكی بۆ دەركەوێت و ئارەزووە زاڵ و بەهێزەكانی دەركەون و زنجیرەكەش نەتوانێ بەرزەفتی بكات و لە دەست دەربچێت و بەڕەڵلا ببێت!

خەڵك هەیە ئارەزووەكانی بە زنجیر دەبەستێتەوە و هەیشە بە داوێك! پێویستە كەسی عاقڵ وریای شەیتانەكانی ئارەزوو بێت و ببینێ دوژمنەكانی بە چی بەسەریدا زاڵ دەبن و ئەو بە چی بەسەریاندا زاڵ دەبێت.

## ١١٣- ورياى هاورێيان به

گــەورەترين هەڵــە متمانەكردنــە بــە خــەڵك و زۆر هــاوڕێگرتن و متمانەكردنــە پێيــان، سەرســەختترين دوژمــن و زيانبەخشــترينيان ئــەو هاوڕێيەيــە كــە بۆتــە دوژمن، چونكە ئەو ئاگای لە نهێنييە شاراوەكانتە. شاعير وتوويە:

| | |
|---|---|
| احذر عدوّك مرّة | واحذر صديقك ألف مرة |
| فلربما انقلب الصديق | فكان أعلم بالمضرّة |

واتــە: يــەك جــار ئاگــات لــە دوژمنەكــەت بێــت بــەڵام هاوڕێكــەت هــەزار جــار، ڕەنگــە هــاوڕێ ببێتــە دوژمــن و ئــيتر ئــەو باشــتر و زانــاتر دەتــوانێ زيانــت پــێ بگەيەنێ.

بزانــە ئێرەيــی و حەســوودی بــە نيعمــەت يــان حــەزكردن لــەو نيعمەتانــەی كەســی تــر هەيــەتی و حــەزكردن بــە بــەرزی، شــتێكە لــەناو نــەفس دايــە! كــاتێ يــەكێك دەتبينــێ تــۆ هاوشــانی ئــەويت و ئێســتا تــۆ بەســەر ويــدا بــەرز بوويتــەوە ئــيللا بــەم شــتە كــارتێكراو دەبــێ و ڕەنگــە ئێرەيــی ببــات.. براكــانی يوســف لــەم چەشنە بوون ئيتر ئەوەيان بەسەر هات كە پێی لەكەدار بوون.

ئەگەر وتت: مرۆڤ چۆن بێ هاوڕێ دەمێنێتەوە؟ پێت دەڵێم: ئەی نازانیت کەسی هاوشێوە ئێرەیی دەبات و، زۆربەی ڕەشۆکییان پێیان وایە مەلا (زانا) پێ ناکەنێ و هیچ شتێك لە خۆشییەکانی دونیا ناخوات! ئەگەر بینیان لە هەندێ شتی ڕێپێدراو ئاسایی ڕەفتار دەکات لەبەرچاویان دەکەوێ؟! ئەگەر ئەمە حاڵی ڕەشۆکییان بێت و ئەوەش حاڵی تایبەتان (خواص) بێت، ئەوا لەگەڵ کێ هاوڕێیەتی بکرێ؟

نەخێر، بەڵکوو سوێند بە خوا هاوڕێیەتیکردن لەگەڵ نەفسدا دروست نییە چونکە حولحولییە و هەر جارەی ڕەنگێکە. تەنها دەبێ موداراتی خەڵك بکرێ و خۆیان لێ بپارێزیت و ناسیاوت هەبێ بێ هیچ تەمایەك لە هاوڕێیەکی ڕاستگۆ.

ئەگەر دەگمەن بوو با ناهاوشێوە بێت چونکە حەسوودی بۆ هاوشێوە زیاترە، با لە ئاستی ڕەشۆکییان بەرزتر بێت و تەماعی لە دەسکەوتنی پایەی تۆ نەبێت.

ئەگەرچی هاوڕێیەتیی ئەمە دڵ ئەرخەیان ناکات چونکە هاوڕێیەتی پێویستە لە نێوان زانایانی هاوشێوە بێت، تێکەڵاوی دەبێ ببێتە مایەی خۆشیی کۆڕ و مەجلیس بەڵام هیچ ڕێگایەك بۆ بەیەکگەیشتن نییە.

نموونەی ئەم حاڵە ئەوەیە کە ئەگەر تۆ زیرەکەکانت بەکارهێنا ئەوا ناخت دەزانن و، ئەگەریش گەمژەکانت بەکارهێنا ئەوا مەبەستەکانت پێچەوانە دەبنەوە.

زیرەکەکان بۆ پێداویستییە دەرەکییەکان دابنێ و گەمژەکانیش بۆ پێداویستییەکانی ماڵەوەت نەوەك بە نهێنییەکانت بزانن، بەو هاوڕێیانە قایل بە کە بۆم وەسف کردیت، پاشان کە پێی گەیشتی با قەڵغانی وریاییت لەبەربێت و نهێنییەکی پێ مەڵێ کە دەکرێ لێی بشاردرێتەوە، وەکوو ئەوە بە کە لەبارەی گورگەوە وتراوە:

ينام بإحدى مُقلتَيه ويتقي بأخرى الاعادي فهو يقظان هاجع

بە چاوێکی دەخەوێ و بەویتریش خۆ لە دوژمنان دەپارێزێت، بەئاگای خەوتووە.

## ١١٤- لە بەرزاییەوە بۆ نزمایی

کەسێکم بینی لەوانەی سەرەتای تەمەن و هەرەتی لاوێتییان لە زانستخوازییدا خەرج کرد، ئارامی لەسەر جۆرەها ئازار و وازهێنان لە خۆشییەکان گرت، دوور بوو لە خراپیی نەفامی و هەر خەریکی وەدەسهێنانی زانست و زانیاری بوو، کاتێ بەشێك لە زانستی وەدەسهێنا کە لە ئاستی ئەهلی دونیا و ئەوانەی تەنها زانستی ئێستایان هەبوو بەرزی کردەوە، ئیتر ژیان و گوزەران تەنگی پێ هەڵچنی یان ئەوەی بۆ خۆی دەیویست و بەهیوا بوو لە کەمی دا، لە وڵات دەستی بە گەڕان کرد داوای هاوکاری لە کەسانی هیچوپووچ دەکرد و خۆی بۆ کەسانی هەرچی و پەرچی و نزم بچووك دەکردەوە!

بە یەکێك لەم جۆرە کەسانەم وت: هاوار بۆ تۆ! کوا ئەو سەربەرزییەی لە پێناویدا شەونخوونیت کرد و تێنوێتی و برسێتیت چەشت؟! کاتێ بەرز بوویتەوە و سوودت وەرگرت گەڕایتەوە بۆ نزمترینی نزمەکان! ئایا گەردیلەیەك سەربەرزییت تێدا نەماوە کە بە هۆیەوە لە ئاستی هیچوپووچان خۆت بەرزکەیتەوە؟! کەمێك زانستت پێ نییە کە لە هەوێزی ئارەزوو دوورت بخاتەوە؟! بە زانست هێزێکت بەدەست نەهێناوە بە هۆیەوە جڵەوی نەفس ڕاکێشی و لە لەوەڕگای خراپ و بۆگەن دەری بێنی؟!

وام بۆ دەردەکەوێ کە شەونخوونی و ماندووبوونت بۆ وەدەسهێنانی دونیا بووە! پاشان من دەتبینم کە تۆ پێت وایە شتێکت لە دونیا گەرەکە تا ببێتە یارمەتیدەرت بۆ وەدەسهێنانی زانست!

بزانە: ئاوڕدانەوەت بۆ لای جۆرێك لە کار و کەسابەت کە بە هۆیەوە لە هیچوپووچان بێنیاز بیت باشترە لە زیادکردنی زانستت، ئەگەر بزانی زانست چ شتێك لە دینت کەم دەکات ئەوا ئەوەی بڕیارت لەبارەی داوە بە زیادە دانانێیت، بەڵکوو ڕەنگە هەموو سەرکێشی و ئابڕووبردنی خۆت بێت – کە هەمیشە پارێزراو بووە– بۆ کەسێکی وەکوو تۆ کە نابێ ئاوڕ لە شتی وەها بداتەوە.

دوای دەستکردنت بەم کارە، دوورە هەر بەوەندە ڕازی بیت کە تەنها بەشی ژیانت بکات، دەشزانی ئەگەر بە ئەندازەی پێویست شتت هەبوو سواڵکردن چ گوناهێکە! لەوە دوورتر ئەوەیە لەوەی وەرتگرتووە توانای خۆپارێزیت هەبێ! کێ گرەنتی ئەوەت دەداتێ بە سەلامەتی دەگەڕێیتەوە نیشتمان؟! چەندان کەس لە چۆڵ و بیابان لەناوچوون!

پاشان ئەوەی بەدەستی دێنی لەناودەچێ و ئەوە دەمێنێتەوە کە بەخشراوە، هەروەها لەخواترسان عەیبت لێ دەگرن و نەفامان شوێنپێیت هەڵدەگرن، ئەوەندەت بەسە کە خۆت تووشی ئەو عەیبانەی دونیا کرد کە دەتزانی کاتێ پێچەوانەی زانست و زانیارییەکانی خۆت جووڵایتەوە بەتایبەتی کە بەشی زۆری تەمەن ڕۆییوە، هەر کەسێك لە ڕابردوو باش بووبێت لە داهاتووش باش دەبێ.

## ١١٥- زانستی بەسوود

لە دەسخستنی شتەکاندا هەڵپەیەکم دیت کە ئەم هەڵپەیە مەبەستی وەدەسهێنانی شتەکە لەناودەبات. بینیمان ئەو کەسەی لە کۆکردنەوەی ماڵ و ساماندا هەڵپەی بوو و زۆری بەدەست هێنا و لەگەڵ ئەوەشدا سوور بوو لەسەر زیادکردن، ئەگەر فامی هەبووایە دەیزانی کە مەبەست لە ماڵ و سامان، بەخشین و خەرجکردنیەتی لە ژیاندا، ئەگەر هەموو تەمەن و ژیانی لە کۆکردنەوەیدا خەرج کرد ئەوا هەردوو مەبەست لەدەست چوو! (مەبەستی کۆکردنەوە و خەرجکردن). چەندان کەسمان دیت ماڵ و دارایی بەسەریەکەوەنا و چێژی لێ وەرنەگرت و خۆی فەوتاند و بۆ غەیری بەجێهێشت! هەروەك شاعیر دەڵێ:

كَدُودَةِ القَزِّ ما تَبنيهِ يَهدِمُها ... وغيرُها بالذي تَبنيهِ يَنتَفِعُ

وەکوو کرمی ئاوریشم ئەوەی بنیاتی دەنێ دەیڕووخێنێ، غەیری خۆی سوود وەردەگرێ لەوەی ئەو بنیاتی دەنێ.

هەروەها خەڵکێکی زۆرمان بینی کە سوورن لەسەر کۆکردنەوەی کتێب و تەمەنیان لە نووسینەوەیان دەبەنەسەر(جاران کتێب بە دەست دەنووسرایەوە).

وەکوو نەریتی ئەهلی فەرمووده تەمەنیان تا کۆتایی ژیان لە لەبەرگرتنەوە و گوێگرتن بەسەردەبەن پاشان دابەش دەبن بۆ:

هەیانە بە زانستی فەرمودە و ڕاستاندنی سەرقاڵ دەبێ و، ڕەنگە وەڵامی ڕووداو و باسێکی نوێ نەزانێ! ڕەنگە سەت ڕێگای فەرموودەی ((أسلَمُ سالَمها اللهُ))ی لە کن بێت، لەبارەی یەکێك لەم جۆرە کەسانە بۆیان گێڕامەوە کە فەرموودەی ((جُزءَ ابن عرفة)) لە سەت شێخ گوێ لێ بووە و حەفتا نوسخەشی لە لا بووە!

هەیانە کتێب وەسەریەك دەنێ و لە لای شێخێکیش دەیخوێنێ و ناشزانێ چی تێدایە: نە لە ڕووی ڕاست و دروستییەوە، نە لە ڕووی تێگەیشتنی واتایەوە، دەبینی دەڵێت: فلان کتێب سەماعییە و نوسخەیەکیم هەیە، هەروەها فلان کتێب و فلان کتێب! !ئەو زانستەی لایەتی نازانێ کامەیان ساغ و کامەیان ناساغە! سەرقاڵبوونی بەوە ڕێگری لێ کردووە لەو شتەی لە زانستدا گرینگە.

پاشان دەبینی هەیانە تەنها لە گێڕانەوەدا دەبێتە شارەزا و چاوساغ بەڵام دێت دەست لە شتگەلێك وەردەدات کە کاری وی نییە، ئەگەر فەتوای دا هەڵە دەکات و ئەگەریش لەبارەی بنچینەکانەوە قسەی کرد تێکەڵ و پێکەڵ دەکات!

لەبەرئەوەی من حەز ناکەم باسی خەڵك بکەم دەنا باسی دەنگوباسی گەورە زاناکانیانم و ئەو تێکەڵ و پێکەڵیانەی کردوویانەم دەکرد تا پەندی لێ وەربگیرێ، بەڵام بۆ کەسی لێکۆڵەر حاڵ و باریان دیار و بەرچاوە.

ئەگەر یەکێك وتی: ئەی لە فەرموودەدا نەهاتووە: ((دوو برسی تێر نابن: زانستخواز و دونیاویست)) صحيح رواة الحاكم..

وتم: سەبارەت بە زانا پێی ناڵێم: لە زانست تێربە و تەنها بایەخ بە هەندێکی مەدە و بە کەم ڕازی مەبە، بەڵکوو پێی دەڵێم: گرینگ پێش بخە، مرۆڤی ژیر ئەو کەسەیە تەقدیری تەمەنی بکات و بەپێی وی کاربکات، ئەگەرچی بە ئەندازەی تەمەن هیچ ڕێگایەك نییە بۆ زانست، بەڵام ئەو لەسەر زۆرینە بنیات دەنێ، ئەگەر گەیشت ئەوا بۆ هەر قۆناغێك توێشوویەکی ئامادە کردووە و ئەگەریش پێش گەیشتن مرد ئەوا نیازەکەی حیسابە.

ئەگەر کەسی ژیر زانی کە تەمەن کورتە و زانستیش زۆر، ئەوا بۆ کەسی ژیر کە خوازیاری کەمالی چاکەکانە ناشیرینە بۆ نموونە بە بیستنی فەرموودە و لەبەرگرتنەوەی سەرقاڵ بێت بۆ ئەوەی هەموو ڕێگە (طریق) و هەموو ڕیوایەت و هەموو نامۆیەك (غریب) بەدەست بێنێ، بە پەنجاساڵیش لەمانە نابێتەوە بەتایبەتی ئەگەر بە لەبەرگرتنەوە مژوول بێت. پاشان قورئان لەبەر نەکات، یان بە زانستەکانی قورئان سەرقاڵ بێت و فەرموودە نەزانێ، یان بە ناکۆکی (خلاف) مژوول بێت و ئەو نەقڵە نەزانێ کە تەوەری مەسەلەکەی لەسەرە.

ئەگەر یەکێك وتی: ئەوەی بۆ خۆت پێت باشە بۆم دیاری بکە ئەوا دەڵێم: کەسی خاوەن هیممەت لە کاتی منداڵییەوە ون نابێ هەروەکوو سوفیان کوڕی عویەینە وتوویە: لە تەمەنی پازدە ساڵیدا بابم پێی وتم: ئەوا سەردەمی منداڵیت بەجێهێشت، شوێن خێر بکەوە دەبیتە ئەهلی خێر.. ئیتر ئامۆژگاریی بابم کردە ڕووگە و ڕووم تێدەکرد و هەرگیز پشتم تێ نەدەکرد.

پاشــان بــەر لــە وەلامدانــەوە دەڵــێم: پێویســتە بــۆ ئــەو کەســەی نەفســبەرزە دوورکەوێتەوە لە کەمتەرخەمی، بۆ نموونە ئەگەر پێغەمبەرایەتی بە هەوڵدان بووایـە نەدەبوو بە لەو کەمتر وەکوو (ویلایـەت – دۆسـتایەتی) ڕازی بێـت، یـان بـۆ نموونـە خەلیفە بووایە نەدەبوو بە (ئیمارەت) قایل بێت، ئەگەر دروست بووایـە ببێتـە پاشـا نەدەبوو بە مرۆڤێکی ئاسایی ڕازی بێت.

مەبەست ئەوەیە تـا ئەوەنـدەی لـە توانایدایـە نـەفس لـە زانسـت و کـردەوە بـەرەو کەماڵ ببات..تەمەن کورتە و زانستیش زۆر:

١– سەرەتا بە خوێنـدن و لەبـەرکردنی قورئـان دەسـت پـێ بکـات و تەفسـیرەکەی بخوێنێتەوە. ئەگەر توانی با (القرأ ات السبعة)ش بخوێنێ.

٢– هەروەها شتگەلێك لە (النحو) و کتێبەکانی زمان.

٣– لە ڕووی نەقڵـەوە بـە ئوصـولی فـەرموودە دەسـت پـێ بکـات وەکـوو (صـحاح و مسانید و سنن)، لە ڕووی زانستی فەرموودەشەوە وەکوو زانینی (ضعیف و ناوەکـان) با سەیری ئوصولی ئەوە بکات.

٤– با سەیری مێـژووش بکـات تـا ئـەو شـتانە بزانـێ کـە پێویسـتی پێیـەتی وەکـوو ڕەچەڵەکی پێغەمبەر و خزم و هاوسەر و ئەو ڕووداوانەی بەسەری هاتوون.

٥– پاشان با ڕوو بکاتە فیقه و سەیری مەزهـەب و ناکۆکییـەکان بکـات، بـا سـەرنج بداتــە مەســەلە نــاکۆکی لەســەرەکان، ســەیری مەســەلەکە بــەوردی بکــات و لــە

سەرچاوەکانیەوە بەدوایدا بگەڕێ وەکوو تەفسیری ئایەت و فەرموودە و وشەی زمانەوانی.

٦- بە ئوصولی فیقه و میراتیش سەرقاڵ بێت، بزانێت فیقه تەوەری هەموو زانستەکانە و هەموو زانستەکان لە خولگەی ئەودا دەخولێنەوە.

٧- لە ئوصول (زانستە بنچینەییەکان)دا ئەوەندە بەسە لێی بکۆڵێتەوە کە بتوانێ بەڵگە بێنێتەوە لەسەر بوونی خودای کارسان، ئەگەر بە بەڵگەوە سەلماندی و زانی چی دروستە و چی دروست نییە و ناردنی پێغەمبەرانی سەلماند و زانی پێویستە پەیامەکانیان قەبووڵ بکەین ئەوا مەبەست لە زانستی ئوصولی فام کردووە و وەرگرتووە.

ئەگەر کات هەبوو بۆ زیاتر وەرگرتنی زانست ئەوا با لە فیقه بێت چونکە ئەو سوودبەخشترینە. ئەگەر کات و مۆڵەتی هەبوو توانی لەبارەی زانستێکەوە شتێك بنووسێ ئەوا شتێکی باش دوای خۆی بەجێ دەهێڵێ.

دەبێ هەوڵ بدات ژن بێنێ و منداڵ بخاتەوە. پاشان بزانێت دونیا ڕاگوزەرە و ئاوڕ لە تێگەیشتنی مامەڵەی خودا بداتەوە، کۆی ئەو زانستەی وەدەستی هێناوە بەرەو لای خودا ڕێنوێنی دەکەن.

ئەگەر ویستی بەتەواوی بیناسێت و لە دەرگای مامەڵەی وی وەستا ئەوا ئەگەر ڕاستگۆ بێت ئەوا بەرەو لای پایەی (ویلایەت) ڕادەکێشرێ، هەر کەسێك بویسترێ هاوکاری دەکرێ و دەستی دەگیرێ.

خودا هەندێ کەسی هەیە خۆی پەروەردەیان دەکات و هەر لە سەدەمی منداڵییەوە پەروەردیارێکیان بۆ دەنێرێ کە پێی دەوترێ عەقڵ و تێگەیشتن، خودا پەروەردە و ڕۆشنبیرکردنیان دەگرێتە ئەستۆی خۆی و هۆکارەکانی نزیکبوونەوە لە خۆی بۆیان ئامادە دەکات، ئەگەر ڕێگرییەك هاتە پێشیان لایدەبات و دەیانپارێزێ، ئەگەر فیتنەیەك تووشیان ببێت لەسەریان لادەبات.

لە خودا دەپاڕێینەوە لەم کەسانەمان بگێڕێت و پەنای پێ دەگرین لە پشتبەردانێك کە هیچ هەوڵێك لەگەڵیدا سوودی نییە.

## ١١٦- کاریگەریی خەڵوەت

تـەنیایی و خـەڵوەت (الخلـوة) کۆمـەڵێك کاریگـەری هەیـە کـە لـە کـاتی ئاشـکرایی (الجلوة)دا دەردەکەوێ.

چـەندان کەسـی ئیمانـدار هەیـە کـە لـە کـاتی تـەنیایی و خەڵوەتـدا سـنووری خـودا دەپارێزێت، ئەوەی ئارەزووی لێیەتی وازی لێ دەهێنێ لە ترسی سزا یان بە ئومێدی پاداشت یان وەکوو ڕێزێك لە پایە و شکۆی خودای مەزن، بەو کارەشی وەکوو ئەوە وایـە بخـورێکی هینـدی پـێ کردبێـت و بـۆنی خۆشـی بـڵاو بووبێتـەوە و خـەڵکیش هەڵیمژن و نەشزانن ئەم بۆنە خۆشە لەکوێوە دێت؟

بە ئەندازەی هەوڵدانی بـۆ وازهێنـان لـەوەی حـەزی لێ دەکـات خۆشەویسـتییەکەی بـەهێز دەبێـت، یـان بـە ئەنـدازەی زیـاتر دوورخسـتنەوەی ئـەو شـتە خۆشەویسـتە وازلێهێنراوە بۆنی خۆش زیاتر دەبێت و وەکوو جیاوازیی بخورەکە بۆنەکەش جیاواز دەبێت.

دەبینیت ئەم کەسە لەبەر چاوی خەڵك گەورە دەبێت و ستایشـی دەکـەن، ناشـزانن بۆ؟ ناتوانن وەسفی بکەن لەبەر دووریان لە حەقیقەتی ناسینی.

تەنانەت ئەم بۆنە خۆشانە بەپێی ئەندازەیان تا دوای مردنیش دەمێننەوە، هەیە ماوەیەکی درێژ هەر بە باشە باسی دەکرێ پاشان لەبیردەچێتەوە، هەیە سەت ساڵ باسی دەکرێ پاشان ناو و گۆڕی لەبیردەچێتەوە، هەیە کەڵەپیاون و یاد و ناویان هەتاهەتایە دەمێنێتەوە.

پێچەوانەی ئەمە، هەر کەسێك لە خەڵك ترسا و بە هەق ڕێزی لە تەنیاییەکەی نەگرت ئەوا بە ئەندازەی ئەنجامدانی تاوان و بڕەکەیەوە ئەوا بۆنی ڕقلێبوونەوەی لێ دێت و دڵەکان ڕقیان لێی دەبێت: ئەگەر بڕی گوناهی کەم بوو ئەوا ئەو زمانانەی بە باشە باسی دەکەن کەم دەبێت و تەنها گەورەکردنی دەمێنێتەوە. ئەگەریش گوناهی زۆر بوو ئەوا ئەوپەڕەکەی ئەوەیە خەڵك لێی بێدەنگ بێت، نە ستایشی بکەن و نە زەم.

ڕەنگە کەسێك لە تەنیاییدا تاوانێکی کردبێت ببێتە هۆی خەرەندی بەدبەختبوونی لە ژیانی دونیا و ئاخیرەت، وەکوو ئەوەی پێی بوترێت: لەگەڵ ئەوەی هەڵتبژاردووە بمێنەوە! ئیتر هەتاهەتایە هەر لەناو هەڵە و پەڵەدا دەمێنێتەوە..

براکانم، سەیری گوناه و تاوانەکان بکەن شوێنەوار بەجێ دێڵی و کۆسپ و تەگەرە چێ دەکات. ئەبوو دەرداعوتوویە: مرۆڤ کە لە تەنیاییدا سەرپێچی خودا دەکات، خودا ڕقلێبوونەوەی دەخاتە دڵی خەڵکەوە بێ ئەوەی هەست پێ بکات.

لەوەی نووسیم وردبنەوە و بیزانن، تەنیایی و نهێنییەکانتان پشتگوێ مەخەن، کردەوەکان بەپێی نیازی نێو دڵن، پاداشتیش بە ئەندازەی دڵسۆزییە.

## ١١٧- سەرەنجامی ئارامگرتن

هەر کەسێ جەرەیانی قەدەر بزانێ ئەوا ئارامی لەسەر دەگرێ. دوای ئەمە نەفامترینی خەڵك ئەو کەسەیە بەرەنگاری قەدەر ببێتەوە و بیەوێت بەسەریدا زاڵ بێت چونکە مەبەستی خودا کە قەدەرسازە ئەوەیە بۆی زەلیل و ملکەچ بین، ئەگەر بەرەنگاری قەدەر بوویتەوە و مەبەستەکەت لەوەدا بەدەست هێنا ئەوا زەلیلی و ملکەچیت بۆ نامێنێتەوە!

بۆ نموونە: هەژارێك برسی دەبێت و بەپێی توانا ئارام دەگرێ، ئەگەر دەستەوسان بوو ئەوا دەست دەکات بە سواڵی خەڵك و شەرم لە خودا دەکات چۆن سواڵ بکات، ئەگەرچی عوزرێکی هەیە لەوەی پێویستی وای لێ کردووە پەنا بۆ سواڵ ببات بەڵام پێی وایە ئیتر ئارامی نەماوە بۆیە شەرم دەکات و داوای لێبووردن دەکات، ئەوەش مەبەستە لێی. (لێرەدا دانەر پێدەچێ هەندێ تێکەڵ و پێکەڵی کردبێت وەگەرنا هەموو شتێك بە قەدەری خودایە: نەخۆشکەوتن قەدەرە و چارەسەر و بەکارهێنانی دەرمانیش قەدەرە، هیچ کات ڕازیبوون بە نەخۆشی و هەژاری واتای ڕازیبوون بە قەدەر نییە بەڵکوو ئەسڵ ئەوەیە هەژار کار بکات بۆ ئەوەی لە هەژاری ڕزگاری ببێت و نەخۆشیش بچێتە لای پزیشك تا لە ئێش و ئازاری نەخۆشی ڕزگاری ببێت).

دەرچوونی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە مەککە کە نەیتوانی بگەڕێتەوە تا ئەوەی لە پەنا و پارێزگاری (موتعەمی کوڕی عەدی)دا هاتەوە کە بێباوەڕیش بوو شیاوی پەند و وانە نییە لەوەدا؟!

پاکوبێگەردی بۆ ئەو خودایەی کاروبار و شتەکانی بە هۆکارەکان بەستۆتەوە تا زەلیلیی خواناس بە پێویستبوونی بە هۆکار بێتەدی.

## ١١٨- بەڵاکان پەیژەیەکن بۆ بەرزبوونەوە

پاکوبێگەردی بۆ ئەو زاتەی کە هەندێ لە خەڵق تووشی ئاوارەبوون و زەلیلبوون دەکات تا ئارامگرییان تاقی بکاتەوە و کاکڵە و ناوەڕۆکیان لە تاقیکردنەوەدا دەربخات!

ئەمە ئادەم (سەلامی خوای لێ بێت) کە فریشتە کڕنووشی بۆ دەبەن پاشان دوای کەمێك لەبەهەشت دەردەکرێت.

ئەمە نوح (سەلامی خوای لێ بێت) ئەوەندە لێی دەدرێ تا بێهۆش دەبێ، پاشان دوای کەمێك بە کەشتییەکەیەوە ڕزگاری دەبێ و دوژمنەکانی لەناودەبرێن.

ئەمە ئیبراهیم (سەلامی خوای لێ بێت) فڕێ دەدرێتە نێو ئاگر، پاشان دوای کەمێك بە سەلامەتی ڕزگار دەبێ.

ئەمە ئیسماعیل (سەلامی خوای لێ بێت) خۆی تەسلیمی سەربڕین دەکات و پاشان سەلامەت دەردەچێ و ستایش و شانازییەکەشی بۆ هەتاهەتایە دەمێنێتەوە.

ئەمە یەعقووب (سەلامی خوای لێ بێت) بە هۆی دابڕانی یوسفەوە چاوەکانی لەدەست دەدات پاشان بە هۆی شادبوونەوەی بە یوسف چاوەکانی بۆ دەگەڕێتەوە.

ئەمە موسا (سەلامی خوای لێ بێت) شوانی دەکات پاشان دەگاتە ئاستی قسەکردن لەگەڵ خودا.

ئەمە پێغەمبەری خۆمان (صلی الله علیه وسلم) دوێنێ پێی دەوترا بێباوك و تووشی کێشە و گرفتی دوژمنان و هەژاری دەبێ و لە چیا خۆڕاگرتر دەبێ، پاشان کە سەرکەوتن بەدەست دێنێ و بەسەر دوژمنانیدا زاڵ دەبێ مەرگ دەبێتە میوانی و بەرەو لای خودای باڵا باڵ دەگرێ!

هەر کەسێ سەرنج بداتە دەریای دونیا و زانی چۆن ڕووبەڕووی شەپۆلەکان دەبێتەوە و چۆن لە بەرانبەر چەرمەسەرییەکانی ڕۆژگار ئارام دەگرێ ئەوا هاتنی بەڵا و ناخۆشی بەلاوە سەخت و گەورە نابێ و بە هاتنی خۆشیش دڵخۆش نابێ.

## ١١٩- بە پێی توانا کاربکەن

لەسەر کەسی ژیر پێویستە تا لە خۆی ڕانەبینێ کارە سەختەکان (العزائم) ئەنجام نەدات: ئایا دەتوانێ بیانکات؟ پێش هەنگاونان وا باشترە هەندێ لەم کارانە بەنهێنی تاقی بکاتەوە چونکە دواتر باش نابێت لەسەر حاڵ و بارێك ببینرێ کە ئارامی لەسەر ناگرێت و پاشان بگەڕێتەوە سەر کاری پێشووی و حەیای بچێت!

نموونەی ئەمە وەکوو ئەو پیاوەیە گوێی لە باسی زاهیدەکان بوو ئیتر جلە جوانەکانی فڕێدا و هی خراپی لەبەرکرد و بە تەنیا خۆی لە گۆشەیەك تەریك کرد و یادی مردن و ئاخیرەت بەسەر دڵیدا زاڵ بوو، زۆری پێ نەچوو خواستی سروشتی مرۆیی ورکی لێ گرت و داوای ئەو شتانەی دەکرد کە هۆگری بووە و ناتوانێ دەسبەرداری ببێ، جا مرۆڤ هەیە زۆر لەوەی زیاتر پێشوو لەسەری بوو دەگەڕێتەوە سەری و دەست دەکاتەوە بە کردەوەکانی جارانی، چۆن کەسێك تازە لە نەخۆشییەك چاك بووبێتەوە لە جاران زیاتر تامەزرۆی خواردنە، هەشە لە دۆخێکی ناوەنددا بە ڕاڕایی دەمێنێتەوە.

مرۆڤی ژیر ئەو کەسەیە کە بە جلێکی مامناوەند خۆی دادەپۆشێ، نە لە ئەهلی خێر دەری دەکات و نە دەشیباتە نێو جلکی هەژاران، ئەگەر عەزیمەتیشی بەهێز بوو لە ماڵ چی لە تواناد‌ا بوو ئەوە دەکات و واز لە بەرگی خۆجوانکردن دێنێ بۆ

داپۆشینی حاڵی و هیچ شتێك بۆ خەڵق دەرناخات، ئەوە لە ڕووپامایی دوورترە و لە حەیاچوون سەلامەترە.

خەڵك هەیە هیواکورتی و یادی ئاخیرەت بەسەریدا زاڵ بووە تا ئەوەی کتێبەکانی زانستی لەژێر خاك ناوە! ئەم کردەوەیە بە لای منەوە گەورەترین هەڵەیە ئەگەرچی لە کۆمەڵێك گەورەپیاویشەوە گێڕدرابێتەوە!

ئەمەم بۆ هەندێ لە مامۆستاکانمان باس کرد، وتی: هەموویان هەڵەیان کردووە.

بۆ هەندێ لەوانە کارەکەیانم تەئویل کردووە بەوەی ئەم کتێبانە فەرموودەی لاوازی وای تێدا بووە کە نەیانتوانیوە لێکیان جیا بکەنەوە، هەروەك لە سوفیان گێڕدراوەتەوە کە کتێبەکانی ژێرخاك ناوە، یان ئەو کتێبانە شتێك لە ڕاوبۆچوونیان تێدا بووە حەزیان نەکردووە لەوان وەربگیرێت، هاوشێوەی ئەوەی ئیمامی عوسمان کوڕی عەففان لە سووتاندنی پەڕاوەکانی قورئان کردی نەوەك شتێکیان لێ وەربگیرێ کە لەسەری غەیری وی کۆدەنگی کراوە. ئەم تەئویلە دەرهەق زاناکانیان دروستە.

سەبارەت بە شووشتنی کتێبەکان لەلایەن (ئەحمەد کوڕی ئەبی ئەلحەواری) و (ئیبن ئەسباط) ئەوە کەمتەرخەمییەکی پەتییە.

زۆر زۆر وریابن لە کارێك کە شەرعی ڕێگری لێ کردووە، یان لە ئەنجامدانی کارێك کە پێت وایە عەزیمەیە و کەچی هەڵەیشە، یان لە دەرخستنی شتێك کە توانات بەسەردا نییە و دواتر لێی پاشەکشێ دەکەیت.

پێغەمبەریش فەرموویەتی: ((وعلیكم من العمل بما تطیقون)) واتە: ئەوەندەی لە تواناتان دایە کار بکەن.

## ١٣٠- وریای سەرەنجام بن

نەزانترینی نەفامەکان ئەو کەسەیە شتێکی دنیایی کە لە سەرەنجامی بەدیشی دڵنیا نییە هەڵبژێرێ بەسەر شتێکی ئایندەیی.

چەندان شتمان بیست لەبارەی سوڵتان و میر و کەسە دەوڵەمەندەوە کە نەفسی خۆی لە ئارەزوودا بەرەڵڵا کردووە و سەیری حەڵاڵ و حەرامی نەکردووە، ئیتر لە کاتی مردندا چەندان هێندەی ئەوەی چێژی لێ وەرگرتووە پەشیمان بۆتەوە و ئەوەندە خەم و خەفەتی تاڵی چەشتووە کە گەردیلەیەك چێژ بەرگەی ناگرێ.

ئەگەر هەر ئەمە بووایە ئەوا خەم بەس بوو، بەڵام ئەدی ئەو سزا هەمیشەییەی چاوەڕێیەتی؟!

گومان لەوەدا نییە کە دونیا بۆ سروشتی مرۆڤ خۆشەویستە، نکوڵی لەو کەسە ناکەم کە بەدوای دونیاوەیە و ئارەزووەکانی هەڵدەبژێرێ بەڵام پێویستە سەیری وەدەسهێنانی و لەکوێی وەدەست دێنێ بکات تا سەرەنجامی چێژ وەرگرتنەکەی سەلامەت بێت وەگەرنا خێر لە چێژێك نییە کە دواییەکەی ئاگر بێت. ئایا ئەو کەسە بە ژیر دادەنرێ کە پێی وترا: ساڵێك لە وڵات دانیشە پاشان دەتکوژین؟! بەڵکوو مەسەلەکە پێچەوانەیە ئەویش ئەوەیە: ژیر ئەو کەسەیە کە ساڵێك بەڵکوو ساڵانێك بە هەوڵ و کۆششی زۆرەوە ئارام دەگرێ تا لە سەرەنجامدا بحەسێتەوە. بە گشتی: ئاخ و ئۆف بۆ چێژێك کە سزای بەدوادا بێت.

## ١٢١- جۆرەکانی چێژ

هەموو چێژەکان لەنێوان بەرهەست و عەقڵییدان، ئەوپـەڕی چـێژە بەرهەسـتەکان و بەرزترینیان پەڕین (سەرجێی)ە، ئەوپەڕی چێژە عەقڵییەکانیش زانست و زانیارییە، هەر کەسێ ئەم دووانەی دەست کەوت ئەوا ئەوپەڕەکەی دەست کـەوتووە و منـیش داوا لە خوازیار (الطالب) دەکەم بەرزترینی ئەم دوو داواکراوە (المطلوبَین) بەدەست بێنێ، بەڵام ئەو خوازیارەی ئەمەی پێ دەدرێ نیشانەیەك هەیە ئەویش ئەوەیـە کـە هەر لە سەرەتاوە و لەگـەڵ لەدایکبوونیـدا هیممەتبـەرزی پـێ دەدرێ، دەبینیـت لـە سەردەمی منداڵییەوە بەدوای کار و شتە بەرزەکان دەکەوێ و دەگەڕێ هـەروەك لـە فـەرموودەدا هـاتووە: عەبدولموتـەلیبی بـاپیری پێغەمبـەر (صـلى الله عليـه وسـلم) (صلى الله عليه وسلم) لە کەعبەدا ڕایەخێکی تایبەتی هەبوو کە لەسەری دادەنیشـت و کەس بۆی نەبوو لـەوێ دانیشـێت، کەچـی پێغەمبـەر (صـلى الله عليـه وسـلم) کـە منداڵ بوو دەهـات و لـەوێ دادەنیشـت، عەبدولموتـەلیب دەیـوت: ئـەم کـوڕەی مـن پلەوپایەیەکی دەبێ.

ئەگەر یەکێك وتی: ئەگەر من هیممەتم هەبوو بەڵام ئەوەی دەمویست و داوام دەکرد پێم نەدرا چی بکەم؟

وەڵام: ئەگـەر لـە جۆرێـك بەخشـین بێبـەش کرایـت ئـەوا لـە جـۆرێکی تـر بێبـەش ناکرێیت. پاشان ئەمـە ڕوودانـی دوورە کـە خـودا هیممـەتت پـێ بـدات و هاوکاریـت نـەکات! پاشـان سـەیری حـاڵی خـۆت بکـە، ڕەنگـە شـتێکی پێـدابیت سوپاسـت

نەکردبێت یان بە شتێك لە ئارەزوو گرفتاری کردبیت ئارامت لێی نەگرتبێت. بزانە ڕەنگە خودا زۆرێك لە چێژەکانی دونیای لیّ قەدەغە کردبیت تا چێژەکانی زانستت پیّ ببەخشیّ، تۆ لاوازیت، ڕەنگە نەتوانیت هەردووکیان کۆبکەیتەوە، خودا باشتر دەزانیّ چی بۆ تۆ باش و گونجاوە.

ئەوەی گەرەکمە بۆتی باس بکەم ئەمەیە: ئەو گەنجەی بە زانستخوازیدا تازە و سەرەتایە پێویستە لە هەر زانستێك شتێك بزانێت و زانستی فیقه بکاتە گرینگترین و، تەنها خەریکی زانینی نەقلّ نەبیّ. ئەگەریش زمانی پاراو بوو ئەوا خۆشی شارەزا کرد لە زانستی زمان و نەحو ئەوا زمانی وەکوو شمشێرێکی تیژی لیّ دێت.

هەر کاتیّ زانست بووە هۆی ناسینی خودا و خزمەتکردنی ئەوا دەرگاگەلێکی وای بۆ دەکرێتەوە کە بۆ هیچ کەسی تر ناکرێتەوە.

پێویستە لاوی زانستخوازی بەشێك لە کاتی تەرخان بکات بۆ کارکردن و بازرگانی، با لە بازرگانییەکەدا کەسێك لە شوێنی خۆی دابنێت و خۆی ڕاستەوخۆ نەچێتە ناو کارەکەوە، گوزەرانێکی ئاسایی وای هەبێت کە دەسبلاّوی تێدا نەبێت. گێڕانەوەی زانست و کارپێکردنی تا ئاستی ناسینی خودا دلّ و هەستگرە، ڕەنگە چێژی ئەوەی پێی گەیشتووە لە هەموو شتێك مەشغوولی بکات، ئەمەش حالّەتێکی دوور لە هەموو نەخۆشی و ئافەتێکە!

## ١٢٢- هەندێ ڕێنوێنی بۆ بەهێزبوونی لەبەرکردن

بزانە کە فێرخواز پێویستی بە خوێندنی بەردەوام هەیە، کارێکی هەڵەیە شەو و ڕۆژ لە دووبارەکردنەوە ڕۆبچیت، ئەوەی ئەم کارە دەکات تەنها چەند ڕۆژێ دەتوانێ بەردەوام بێت، پاشان سارد دەبێتەوە یان نەخۆش دەکەوێ.

گێڕدراوەتەوە کە لە نەخۆشیی مردنیدا پزیشکێك چووەتە کن ئەبووبەکر کوڕی ئەلئەنباری و پشکنینی بۆ کرد و وتی: تۆ شتێك دەکەیت کە هیچ کەسێك نایکات! پاشان ڕۆیشت. بە ئەبووبەکر وترا: تۆ چیت دەکرد؟ وتی: هەموو هەفتەیەك ١٠ هەزار پەڕەم دووبارە دەکردەوە!

شتێکی هەڵەیە بە لەبەرکردنی زانستێکی زۆری جۆراوجۆر باری دڵ گران بکەیت چونکە دڵیش ئەندامێکە لە ئەندامەکانی لەش، هەروەك چۆن خەڵك هەیە دەتوانێ سەت ڕەتڵ (هەر ڕەتڵێك نزیکەی نیو کیلۆیە) هەڵگرێ و هەشە ناتوانێ بیست ڕەتڵ هەڵگرێ، دڵیش ئەوهایە.

مرۆڤ با بەپێی توانای خۆی و کەمتریش زانست وەرگرێت، چونکە ئەگەر تواناکەی لە کاتێکدا خەرج کرد ئەوا چەندان کاتی تری لەکیس دەچێت، هەروەك چۆن چڵێس چەند پارووپەکی زیاد دەخوات کە دەبێتە هۆی بێبەشبوونی لە چەندان خواردن!

ڕاست ئەوەیە بەپێی توانا وەربگرێت و لە کاتێکی شەو و ڕۆژدا دووبارەی بکاتەوە و لە کاتەکانی تریش پشوو بدات.

بەردەوامبوون بنچینەیەکی مەزنە، چەندان کەس دوای لەبەرکردن وازی لە وەبیرهێنانەوە هێنا و لە گەڕاندنەوەی لەبەرکراوەکان کاتێکی زۆر بەسەرچوو!

بۆ لەبەرکردنیش چەند کاتێکی تەمەن گونجاوە: باشترینیان سەردەمی منداڵی و لاوییە، بۆ دووبارەکردنەوەش باشترین کات بەرەبەیان و نیوەڕۆیە، بەیانییانیش باشترە لە ئێواران، کاتی برسێتیش باشترە لە کاتی تێری.

لەبەرکردن لەناو سەوزایی و لە کەناری ڕووبار باش نییە چونکە ئەمە دەبێتە هۆی مەشغوولبوونی مێشك، شوێنە بەرزەکانیش بۆ لەبەرکردن لە شوێنە نزمەکان باشترن.

تەنیایی و خەڵوەت ئەسڵە و جەمکردنی بیر و هزر بنچینەی بنچینەکانە. لە هەفتەی ڕۆژێك پشوو بە نەفس بدەیت لەوەی هیچ دووبارەکردنەوەیەك نەکەیت تا ئەوەی لەبەرت کردووە لە مێشك و بیرت بچەسپێت و نەفسیش هێزێکی وەبەر بێتەوە شتێکی باشە وەکوو ئەوە وایە بادلۆ(بناغە)یەك دروست بکەیت و چەند ڕۆژێك لێی گەڕێیت تا دەچێتەباریەك و خۆی دەگرێ پاشان دیواری لەسەر دروست بکەیت.

کەم لەبەرکردن لەگەڵ بەردەوامبوون بنچینەیەکی مەزنە. لەبەرکردنی زانستی نوێ دەست پێ مەکە تا ئەوەی پێشتر باش مەحکەم دەکەیت. هەر کەسێکیش تاقەتی

لەبەرکردنی نەبوو با وازی لێ بێنێ چونکە ملەکردن لەگەڵ نەفس باش و گونجاو نییە.

باش و چاکردنی میزاجیش یەکێکە لە بنچینە مەزنەکان، خۆراکەکانیش کاریگەرییان بەسەر لەبەرکردنەوە هەیە:

(ئەلزوهری) وتوویە: لەوەتەی خەریکی لەبەرکردنم سرکەم نەخواردووە.

بە ئەبوو حەنیفە وترا: چ شتێك هاوکارە بۆ لەبەرکردنی فیقه؟ وتی: بە جەمکردنی بیر و مێشك.

(حەماد کوڕی سەلەمە) وتوویە: بە کەمیی خەم و پەژارە.

(مەکحوول) وتوویەتی: هەر کەسێك شمەکی خاوێن بوو خەمی کەم دەبێ، هەر کەسێك بۆنی خۆش بوو ئەوا عەقڵی زیاد دەبێ، هەر یەکێکیش هەردووکیان کۆبکاتەوە ئەوا پیاوەتی زیاد دەبێ.

پێم باشە زانستخوازی سەرەتایی تا بکرێ و بتوانێ هاوسەرگیری نەکات، ئەحمەدی کوڕی حەنبەل تا چل ساڵی ژنی نەهێنا، ئەمەش بۆ ئەوەی بیر و مێشکی جەم بێت، ئەگەریش خۆی پێ ڕانەگیرا با ژن بێنی و وریای خۆی بێت و زۆر نەپەڕێ تاوەکوو توانا و هێزی دووبارەکردنەوەی زانستی هەبێ.

پاشان با بڕوانێت و بزانێت چ جۆرە زانستێك لەبەر دەکات چونکە تەمەن کەم و کورت و بەنرخە و زانستیش فرەیە، خەڵکێك هەن تەمەنی خۆیان لە لەبەرکردنی

زانستێك دەبەنەسەر كە لەو باشتر و لەپێشتر هەیە، ئەگەرچی هەموو زانستێك باشە بەڵام وا باشترە گرینگتر و باشتر پێش بخرێت.

باشترین شت خۆتی پێوە سەرقاڵ بكەیت لەبەركردنی قورئان پاشان فیقهە، دوای ئەمە ئەوەی دێت وەكوو پاشكۆ وایە.

هەر كەسێك هۆشیاری و وریایی پێدرا هۆشیارییەكەی ڕێنوێنی دەكات و پێویستی بە ڕێبەر نییە.

هەر كەسێك بە زانست مەبەستی خودا بێت ئەوا ئامانج و مەبەستەكەی باشترینی پیشان دەدات ﴿وَاتَّقُوا اللَّهَ وَيُعَلِّمُكُمُ اللَّهُ﴾ (البقرة: ٢٨٢) واتە: تەقوای خودا بكەن و خوداش فێرتان دەكات.

## ١٢٣- سەرەنجامی گوناه

هەرکەسێك بەردەوامیی ساغ و سەلامەتی دەوێت با لە خودای گەورە بترسێت، هەر بەندەیەك لە شتێکدا نەفسی خۆی بەرەڵا بکات کە پێچەوانەی تەقوا بێت ئەگەر کەمیش بێت ئیللا سزاکەی وەردەگرێت جا زوو بێت یان درەنگ، لە دونیا بێت یان ئاخیرەت.

ئەوە بێئاگایی و لەخۆباییبوونە کە خراپە بکەیت و بە چاکە بیبینی و وا گومان ببەیت چاوپۆشیت لێ کراوە و لەبیرت بچێت کە خودا فەرموویەتی: ﴿مَن يَعۡمَلۡ سُوٓءٗا يُجۡزَ بِهِۦ﴾ (النساء: ١٢٣) واتە: هەر کەسێك کارێکی خراپ بکات سزاکەی وەردەگرێت.

ڕەنگە نەفس بڵێت: خودا دەبورێت و دەبەخشێت، ئیتر بەمە شلگرتوویی بکات! بێگومان خودا دەبەخشێت بەڵام بۆ کەسێك خۆی بیەوێت. ئێستا ئەز حاڵێکت بۆ ڕوون دەکەمەوە و ئەتووش بە بیری خۆت سەرنجی بدە ئەو کات واتای لێخۆشبوون دەزانی، ئەویش ئەمەیە: کەسێك هەڵەیەك دەکات کە بە مەبەستەوە نەبووە و بەر لە کردنیشی بڕیاری بۆ نەداوە، دوای کردنیشی بڕیاری نەداوە بۆی بگەڕێتەوە، پاشان لەوەی کردی بەئاگا هاتەوە و داوای لێخۆشبوونی لە خودا کرد، ئەو کارەی — ئەگەرچی بە ئەنقەست چووە ناویەوە — بە هەڵە دادەنرێت. وەکوو ئەوەی ژنێکی جوانی بێتە بەرچاو سروشتی مرۆییانە بەسەریدا زاڵ بێت و سەیری بکات و لە کاتی سەیرکردنیدا بە هۆی چێژبینینی سروشتی مرۆییانەیەوە بێئاگا بێت لە

سەرنجدانی واتای نەهیکردن لەم کارە، ئیتر وەکوو کەسێکی ون یان سەرخۆشی لێ بێت، کاتێ بەئاگا هاتەوە لەم کارەی پەشیمان ببێتەوە و پەشیمانییەکە ببێتە هۆی شووشتنی ئەو چەپەڵییانەی کە وەکوو هەڵەیەك بووە هیچ نیاز و مەبەستی کردنی نەبووە، ئەمەیە واتای وتەی خوای گەورە: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ إِذَا مَسَّهُمۡ طَٰٓئِفٞ مِّنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ تَذَكَّرُواْ فَإِذَا هُم مُّبۡصِرُونَ ﴾ (الأعراف: ٢٠١) واتە: ئەو کەسانەی تەقوای خودا دەکەن هەر کاتێ خەیاڵی خراپیان لە شەیتانەوە تووش دەبێ دەسبەجێ یادی خودا دەکەن و بەرچاویان ڕوون دەبێتەوە.

کەسێك بەردەوام بێت لەسەر ئەو تەماشاکردنە و دووبارەی بکاتەوە و سوور بێت لەسەری وەکوو ئەوە وایە بەئەنقەست لەو نەهییە مکوڕ بێت و پێچەوانە بجووڵێتەوە ئەوا بە ئەندازەی سووربوونی، لێخۆشبوون لێی دوور دەکەوێتەوە، یەکێك لە نیشانەی دووریش ئەوەیە کە پێی وابێت لەسەر ئەوە سزا نییە، هەروەك (ئیبن ئەلجەللاء) وتوویە: مامۆستاکەم بینیمی وا سەرنجی مێرمنداڵێکی مەسیحی دەدەم! وتی: ئەمە چییە؟! ئەگەر تا ماوەیەکی تریش بێت سەرەنجامی ئەم کارەت دەبینی!..دوای چلساڵ قورئانم بیرچوویەوە!

بزانە لە گەورەترین مەینەتی و تاقیکردنەوە بێئاگایی و لەخۆبایی و دەسخەڕۆبوونە بە سەلامەتبوون دوای ئەنجامدانی گوناه، چونکە سزا دوادەکەوێ.. گەورەترین سزاش ئەوەیە مرۆڤ هەستی پێ نەکات و بریتی بێت لە لێسەندنەوەی دین و کوژاندنەوەی دڵ و خراپ هەڵبژاردن بۆ نەفس، شوێنەوارەکانیشی بریتی بێت لە سەلامەتیی جەستە و گەیشتن بە مەبەستەکان.

هەندێ لەوانەی لە ژیاندا پەندیان وەرگرتووە وتوویانە: تەماشای شتێکم کرد کە بۆم حەڵاڵ نەبوو پاشان چاوەڕێی سزاکەیم کرد، ناچاری سەفەرێکی دوورودرێژ کرام کە نیازیم نەبوو، تووشی چەرمەسەری و ناخۆشی زۆر بووم، پاشان مردنی خۆشەویسترین کەسمی بەدوودا هات و هەندێ شتم لەدەستدا کە زۆر بەنرخ و سەنگین بوون لە لام، پاشان بە تەوبەکردن کاروباری خۆم ڕێکخستەوە و بارودۆخم باش بوو، پاشان ئارەزوو هاتەوە و جارێکی تر هەڵێنام بۆ چاو لەوەڕاندن، ئیتر دڵم کوژایەوە و نەرمی نەما و لە لەدەستدانی یەکەم زیاترم لێ سەندرا، ئەوەی لەدەستم دابوو بە شتێك بۆم قەرەبوو کرایەوە کە لەدەستدانی باشتر بوو! کاتێ ڕامام لەوەی قەرەبوو کراومەتەوە و ئەوەی لێم سەندراوە ئیتر لە ئێش و ئازاری ئەو قامچییە بەئاگا هاتمەوە، ئا ئەوە منم وا لەسەر کەناری دەریاوە هاوار دەکەم:

براکانم! وریای شەپۆلی ئەم دەریایە بن و بە مەنگی و ئارامییەکەی هەڵمەخەڵەتێن و خۆتان لە کەنار توند بکەن و بڕۆنە نێو قەڵای تەقواوە چونکە سزا تاڵە.

بزانن لە پابەندبوون بە تەقواوە تاڵیگەلێك هەیە لە لەدەستدانی مەبەست و شتە خۆش و حەزبزوێنەکان، بەڵام وەکوو پارێزییەك وایە کە لەشساغی بەدوودا بێت، چونکە ڕەنگە تێکەڵ و پێکەڵکردن ببێتە هۆی مردنی لەناکاو.

سوێند بە خوا، ئەگەر لەسەر گووفەکەکان لەگەڵ سەگان بخەون و داوای ڕەزامەندیی خودا بکەن ئەوا ئەمە لە ئاست وەدەسهێنانی ڕازیبوونی ئەودا کەمە، ئەگەر لە بەدەسهێنانی ئامانج و مەبەستەکانی دونیادا بگەنە ئەوپەڕی هیوا و ئاواتەکان بەڵام خودا پشتتان تێ بکات ئەوا سەلامەتیتان لەناوچوونە و ساغڵەمیتان

نەخۆشییە و لەشساغیتان دەرد و بەڵایە. هەموو شتێك بە کۆتاییەکەیەتی و کەسی ژیریش ئەوەیە سەرنجی سەرەنجامەکان بدات.

بەرگەی گەرمای بەڵا بگرن چونکە زوو تەواو دەبێ خودا ڕەحمتان پێ بکات! هەر خودایە یارمەتیدەر و هەموو هێز و توانایەك لەوەوەیە و هیچ هێزێك نییە ئیللا بە فەزڵی وی نەبێ.

## ١٢٤- یەکتاییی ناو و سیفەتەکانی خودا

کۆمەڵێك لە بیدعەچیی عەجەم هاتنە بەغدایێ، چوونە سەر مینبەری ئامۆژگاریی ڕەشۆکییان و لە زۆربەی مەجلیسەکانیان دەیانوت: لەسەر زەویدا قسە و کەلامی خودا نییە! ئایا موصحەف (قورئانی نووسراو) تەنێ هەر پەڕ و مەرەکەب نییە؟! خوداش لە ئاسمانێ نییە! ئەو کەنیزەکەشی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لێی پرسی: ((خودا لەکوێیە؟)) لاڵ بوو ئامازەی بۆ ئاسمان کرد، واتە: خودا لەو بتانە نییە کە لە زەوی دەپەرستریێ! پاشان دەڵێن: کوا ئەو (حروفییانە)ی پێیان وایە قورئان پیت و دەنگە؟! ئەمە دەستەواژەی جیبریلە!!

(الحروفیة – حەرفییەکان): گروپێکی شیعیی فارسییە (فضل الله النعیمي الاستربادي) لە کۆتاییی سەدەی هەشتەمی کۆچی دایمەزراندووە، پێی وابوو کە خواپەرستی واتە واژە و وشە، مرۆڤ لە ڕێی وتەوە دەتوانێ پەیوەندی بە خوداوە بکات و ناوبراو خۆی بە پێغەمبەر دادەنا و باوەڕیشی وابوو کە دەکرێ خودا لە مرۆڤدا بەرجەستە ببێت و ڕووناکی بداتەوە....)

ئەم گرووپە هەروا مانەوە تا ئەوەی گەورەییی قورئان لە دڵی زۆربەی ڕەشۆکییان کەم و سووك بوو، هەیان بوو گوێی لێ دەبوو و دەیوت: ئەمە ڕاستە، وەگەرنا قورئان شتێکە جیبریل لە کیسێکدا دەیهێنێ!

کۆمەڵێك لە ئەهلی سوننەت سکاڵایان بۆ من هێنا و منیش پێم وتن: ئارام بگرن، هەر دەبێ هەندێ کات گومانەکان سەریان بەرز بکەنەوە ئەگەرچی پووچ و لەناوچوویشە، ڕەنگە ناڕەوا لە گەڕێکی شەڕدا سەرکەوێت بەڵام سەرکەوتن و زاڵبوونی یەکجاری هەر بۆ هەق و ڕەوایە، درۆزن و فێڵباز زۆرن، وڵاتیش خاڵی نییە لە خەڵکی ساختەچی و هەرچی و پەرچی.

یەکێك وتی: وەڵاممان بۆ قسەکانیان چی بێت؟

وتم: بزانە خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیە وسلم)، بەوە لە خەڵك قایل بوون کە ئیمان بە کورتی و پوختی بێنن و تەکلیفیان لێ نەکراوە وردەکاری بزانن: یان لەبەرئەوەی زانینی وردەکارییەکان بیروباوەڕ دەشێوێنێ، یان لەبەرئەوەی تواناکانی مرۆڤ دەستەوسانە لە خوێندنەوە و زانینی ئەوە.

یەکەم شتێ پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) هێنای سەلماندنی بەدیهێنەر(الخالق) بوو، بەڵگەی قورئانیش لەسەر بوونی بەدیهێنەر سەرنجدانی دروستکراوەکان بوو، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿أَمَّن جَعَلَ ٱلۡأَرۡضَ قَرَارٗا وَجَعَلَ خِلَٰلَهَآ أَنۡهَٰرٗا﴾ (النمل: ٦١) واتە: ئەوە کێیە زەوی کردۆتە شوێنی ئارامگرتن و حەسانەوە و نیشتەجێبوون و، کۆمەڵێك ڕووباری بەنێودا ڕاکێشاوە؟!

هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَفِيٓ أَنفُسِكُمۡۚ أَفَلَا تُبۡصِرُونَ ٢١﴾ (الذاريات: ٢١) واتە: لە نیشانەکانی نەفسی خۆتان وردنابنەوە و نابینن؟!

ئیتر لە کۆمەڵێ ئایەتدا خوای گەورە بە دروستکراوەکانی، بەڵگە لەسەر بوون و دەسەڵاتی دەهێنێتەوە.

(له ڕاستیدا عەرەبەکانی سەردەمی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) باوەڕیان بە خودا هەبوو بەلاّم گرفتەکەیان ئەوەبوو هاوبەشیان بۆ بڕیار دەدا و بتیان دەپەرست.)

پاشان بە موعجیزەکانی، پێغەمبەرێتیی پێغەمبەری سەلماند، گەورەترین موعجیزەشی، قورئان بوو کە هیچ کەسێك نەیتوانی هاوشێوەی بێنێ.

کۆمەڵێك لە هاوەڵاّن بەم بەڵگانە قایل بوون و نەوەی یەکەم لەسەر ئەوە ڕۆیشتوون و ئیتر کانیاوەکە بە سازگاری ماوەتەوە و لێڵ نەبووە.

خوای گەورە زانیویەتی کە لە ئایندەدا بیدعە و زیادە پەیدا دەبن بۆیە لە چەسپاندنی بەڵگەکان درێغی نەکردووە و قورئانی لێ پڕ کردووە. لەبەرئەوەی قورئان سەرچاوە و کانیاوی زانستەکانە و گەورەترین موعجیزەی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم) بۆیە لەوێ جەختی لێیان کردەوە، فەرموویەتی: ﴿وَهَٰذَا كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ مُبَارَكٌ﴾ (الأنعام: ٩٢) واتە: ئەم کتێبەی دامانبەزاندووە پیرۆز و موبارەکە و خێر و بەرەکەتی زۆری تێدایە.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلۡقُرۡءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٌ﴾ (الإسراء: ٨٢) واتە: لە قورئان ئایەتگەلێکت بۆ دادەبەزێنین کە شیفای نەخۆشی بیر و دڵ و دەروونەکانە.

هەروەها خوای گەورە ڕایگەیاندووە کە قورئان قسە و کەلامی خۆیەتی، فەرموویەتی:

﴿ يُرِيدُونَ أَن يُبَدِّلُواْ كَلَٰمَ ٱللَّهِۚ ﴾ (الفتح: ١٥) واتە: دەیانەوێ قسەی خودا بگۆڕن..هەواڵیشی داوە کە قسەی خودا بیستراوە، فەرموویەتی: ﴿ حَتَّىٰ يَسۡمَعَ

﴿كَلَـٰمَ ٱللَّهِ﴾ (التوبة: ٦) واته: تا قسەی خودا دەبیستیٚ. هەروەها هەواڵی داوە کە قورئان پارێزراوە و فەرموویەتی: ﴿فِى لَوْحٍ مَّحْفُوظٍۭ ۝٢٢﴾ (البروج: ٢٢) واتە: لە لەوحێکی پارێزراودایە.

فەرموویەتی: ﴿بَلْ هُوَ ءَايَـٰتٌۢ بَيِّنَـٰتٌ فِى صُدُورِ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ ۚ وَمَا يَجْحَدُ بِـَٔايَـٰتِنَآ إِلَّا ٱلظَّـٰلِمُونَ ۝٤٩﴾ (العنكبوت: ٤٩) واتە: ئەم قورئانە ئایەتگەلێکە لە دڵی ئەوانەی زانستیان پیٚ دراوە.

هەروەها خوای گەورە ڕایگەیاندووە کە قورئان نووسراو و خوێنراوە، فەرموویەتی: ﴿وَمَا كُنتَ تَتْلُوا۟ مِن قَبْلِهِۦ مِن كِتَـٰبٍ وَلَا تَخُطُّهُۥ بِيَمِينِكَ ۖ إِذًا لَّٱرْتَابَ ٱلْمُبْطِلُونَ﴾ (العنكبوت: ٤٨) واتە: تۆ ئەی پێغەمبەر پێشتر نە هیچ کتێبێکت دەخوێندەوە و نە هیچیشت دەنووسی.

ئیتر لەم جۆرە ئایەتانە زۆرن و باسکردنیان درێژە دەکێشیٚ کە هەموویان چەسپاندنی قورئان دەسەلمێنن.

پاشان خوای گەورە پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) بەدوور گرت لەوەی لە لایەن خۆیەوە قورئانی دانابێت، فەرمووی: ﴿أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ ۚ بَلْ هُوَ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ﴾ (السجدة: ٣) واتە: موشریکەکان دەڵێن: موحەممەد خۆی ئەم قورئانەی بە دەم خوداوە هەڵبەستووە! نەخێر ئەم قورئانە ڕاست و ڕەوایە و لە کن خوداوە هاتووە.

خوای گەورە هەڕەشەی لە پێغەمبەر کردووە ئەگەر کارێکی وەها بکات، فەرموویەتی: ﴿وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ ٱلْأَقَاوِيلِ ۝٤٤ لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِٱلْيَمِينِ ۝٤٥ ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ ٱلْوَتِينَ﴾

(الحاقة: ٤٤ - ٤٦) واتە: ئەگەر هێندێ لە قسەکانی بە دەم ئێمەوە کردبا، گومان نییە بە هەموو تواناوە دەمانگرت، ئەوسا ڕەگی لاملیشمان دەبڕی.

دەرهەق ئەوەی وا گومانی بردووە کە قورئان قسەی مرۆڤە فەرموویەتی: ﴿إِنْ هَٰذَآ إِلَّا قَوْلُ ٱلْبَشَرِ ۝٢٥ سَأُصْلِيهِ سَقَرَ﴾ (المدثر: ٢٥ - ٢٦) واتە: ئەم بێباوەڕە وتی ئەم قورئانە هەر قسەی مرۆڤە! نەخێر وانییە، لە بەرانبەر بێباوەڕییەکەی و ئەم قسە ناقۆڵایەوە لە ئاخیرەتدا دەیخەمە ناو دۆزەخەوە.

لە کاتێکدا خوای گەورە هەر گەلێکی بە جۆرە سزایەك سزا داوە کە هەندێك لە فریشتەکان لەئەستۆیان گرتووە وەکوو: هاواری جیبریل بۆ لەناوبردنی هۆزی (سەموود) و، ناردنی با بۆ سەر (عاد) و نغرۆکردنی قاروون و سەراوژێرکردنی دەڤەری گەلی (لووت) لە لایەن جیبریلەوە و، ناردنی تەیرە ئەبابیلە بۆ سەر ئەو سوپایەی ویستی کەعبە وێران بکات بەڵام بۆ کەسانێك قورئان بەدرۆ بخەنەوە خودا خۆی سزایان دەدات و فەرموویەتی: ﴿فَذَرْنِي وَمَن يُكَذِّبُ بِهَٰذَا ٱلْحَدِيثِ ۖ سَنَسْتَدْرِجُهُم مِّنْ حَيْثُ لَا يَعْلَمُونَ﴾ (القلم: ٤٤) واتە: ئەو کەسەی ئەم قورئانە بەدرۆ دەخاتەوە بۆ منی لێگەڕێ.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿ذَرْنِي وَمَنْ خَلَقْتُ وَحِيدًا ۝١١﴾ (المدثر: ١١) ئەو کەسەی تاك و تەنهام دروست کردووە بۆ منی لێگەڕێ.

ئەمە لەبەرئەوەیە چونکە ئەم قورئانە ئەسڵ و بنچینەی ئەم شەریعەتانەیە و هەر شەریعەتێکی پێشوو لە لایەن قورئان چەسپاوە چونکە هەموو ئاینەکان هیچ شتێکیان نەماوە کە بەڵگە و نیشانە بێت بۆ ڕاست و دروستیی ئەوەی تێیاندایە تەنها قورئانەکەی ئێمە نەبێ، لەبەرئەوەی کتێبەکانیان دەسکاری کراون و گۆڕدراون.

هەموو خاوەن هۆشێك دەزانێ کە ئەوەی وتوویەتی: ﴿إِنْ هَٰذَآ إِلَّا قَوْلُ ٱلْبَشَرِ﴾ (المدثر: ٢٥) واتە: ئەمە هەر قسەی مرۆڤە.. ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کە بیستوویەتی..
خاوەن هۆش و ئەهلی تێگەیشتن لە گوتار هاوڕان لەوەی کە وتەی ﴿وإنه﴾ کینایەیە لە قورئان و وتەی ﴿نَزَلَ بهِ﴾ش هەر کینایە لە قورئان و وتەی ﴿هَذا كِتَابٌ﴾ ئاماژەیە بۆ ئێستا.

ئەمە شتێکی چەسپاو و جێگیرە هیچ کەسێك لە پێشینان لە سەردەمی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و هاوەڵان لەبارەیەوە ناکۆك نەبوون. پاشان شەیتان فرتوفێڵەکانی بیدعەی خستە ناوەوە، ئیتر خەڵکێك وتیان: ئەم ئاماژە بۆ کراوە(قورئان) خوڵقێنراوە (مخلوق)!

لە بەرانبەر ڕەتکردنەوەی ئەوەدا ئیمامی ئەحمەد وەها چەسپاو و خۆڕاگر بوو هیچ کەس وەکوو وی دامەزراو نەبوو، ئەوەش لەبەرئەوەی نەوەك شتێك بۆ قورئان چێ ببێت کە هەندێ لە گەورەییەکەی لەنێو دڵدا بسڕدرێتەوە و لە دانەپاڵ خودا دەری بکات، ئیمام وای بینی کە داهێنانی شتێك کە لەبارەی قورئانەوە نەوتراوە بەکارهێنانی دروست نییە و وتی: چۆن شتێك بڵێم کە نەوتراوە؟!

پاشان خەڵك لە غەیری ئەوە ناکۆك نەبوون تا ئەوەی (عەلی کوڕی ئیسماعیلی ئەشعەری) پەیدا بوو، جارێك قسەی موعتەزیلەی وتەوە، پاشان بۆی دەرکەوت و بانگەشەی ئەوەی کرد کە قسە و کەلام سیفەتێکی سەربەخۆیە!

ئەم بانگەشەیەی وای پێویست کرد کە ئـەو قورئانـەی لـە لامانـە مەخلووقـە و ئـيتر زیاتری وت و بیروباوەڕ و عەقیدەی شێواند! تا ئەمڕۆش و هێشتا بیدعەچییەکان لە ڕێڕەوی ئەودا دەسووڕێنەوە و مەلە دەکەن.

قسەکردن لەم مەسەلەیەدا لە کتێبەکانی ئوسوولدا بە باسکردنی بەڵگە و گومانەکان ڕێك خراوە من لێرەدا بەدرێژی باسی ناکەم، بەڵکوو پوختەیەکت بۆ باس دەکەم کە بۆ کەسێك خـودا بیـەوێ هیدایـەتی بـدات بـەس بێـت ئـەویش ئەوەیـە: شـەرع بـە ئیمانێکی پوخت و بەگەورەزانینی دیاردەکان لێمان قایل و ڕازییە و، نـەهی کـردووە لە ڕۆچوون لەو شتانەی تـۆزی گومـان دەورووژێـنن و تێگەیشـتنی سنووورداری مـرۆڤ ناتوانێ ڕێگەی لێ بگرێ.

ئەگەر خودا نەهی کردبێت لـە ڕۆچـوون لـە باسـی قـەدەر ئـیتر چـۆن ڕێ دەدات بـە ڕۆچوون لە باسی تەقدیرکار (خودا)؟! ئەوەش تەنها لەبەر یەکێك لەم شـتانەیە کـە باسم کرد: یان لەبەر ترسی وروژاندنی گومانێکە کـە بیروباوەڕەکـانی پـێ دەهـەژێ، یان لەبەرئەوەیە هێز و تواناکانی مرۆڤ لە پەیبردن بە ڕاستییەکان دەستەوسانە.

ئەگەر دیاردەکانی قورئان بـوونی قورئـان دەچەسـپێنن، یـەکێك وتـی: لێـرەدا هـیچ قورئانێك نییە، ئەوا ئەو دیاردانەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لـە سـەلماندن و چەسپاندنیاندا ماندوو بوو و لە دڵەکاندا جێگیری کردن بەرپەرچی دەدەنەوە.

بە چ شتێك حەرام و حەڵاڵ دەکرێ و یەکلا دەکرێتەوە و دەبڕێنرێتەوە و پێشـتریش هیچ شتێکمان لە لایەن خوداوە لە کن نییـە؟! ئایـا کەسـی نـەیار هـیچ بەڵگەیـەکی

هەیە ئیللا بلێت: خودا فەرمووی، ئیتر بەمەش ئەوەی نەفی کردووە دەیسەلمێنێتەوە؟!

کەواتە ڕاست و دروست تەنها ئەوەیە لەگەڵ ڕووکەشی شەرعدا بووەستین. ئەگەر گوماندارێك پەلپی گرت و وتی: ئەمە دەنگ و ئەمە دەسخەتی تۆیە، ئەی کوا قورئان؟! با پێی بوترێ: من و تۆ کۆدەنگین لەسەر بوونی شتێك کە هەموومان وەکوو بەلگە پشتی پێ دەبەستین، چۆن تۆ گلەییم لێ دەکەیت لە چەسپاندنی شتێك کە ناتوانم بە هەست بیسەلمێنم، منیش ئەوها گلەییت لێ دەکەم چۆن نەفیی شتێك دەکەیت کە بە شەرع چەسپاوە و سەلماوە؟!

سەبارەت بەو قسەیەشیان کە دەڵێن: ئایا موصحەف (قورئانی نووسراو) تەنێ هەر پەڕ و مەرەکەب نییە؟!

ئەم قسەیە وەکوو قسەی ئەو کەسەیە کە دەڵێ: ئایا بنیادەم تەنێ هەر گۆشت و خوێن نییە؟! هەیهوو ئەم دوو قسەیە چەند لێك دوورن!! واتای ئادەمیزاد واتە گیان و ڕووح، هەر کەسێ سەیری گۆشت و خوێن بکات ئەوا تەنها حیسابی بەرهەستی کردووە.

ئەگەر وتی: هەروەها دەڵێم نووسراو غەیری نووسینە. پێی دەڵێین: ئا هەر ئەمەشە ڕەخنەت پێ لێ دەگرین، چونکە ناکرێ ئەمە بۆ تۆ بێتەدی و بۆ نەیارەکەت نەبێ: ئەگەر مەبەستت لە نووسین مەرەکەب و خەتخەت بێت ئەوا ئەمە قورئان نییە، ئەگەریش مەبەستت واتاکەی بێت ئەوا ئەمە نووسین نییە.

ئەم شتانە شیاو نین تێیدا ڕۆبچین، ناتوانین بەوردی لێی بکۆڵینەوە بۆ نموونە وەکوو ڕووح، ئێمە بە گشتی دەزانین بوونی هەیە بەڵام حەقیقەتەکەی نا، ئەگەریش حەقیقەتەکانی ڕووحمان نەزانی ئەوا سیفەتەکانی خودای حەق زیاتر نازانین.

پێویستە پابەند بین بەو شتانەی لە ڕێی وەحییەوە پێمان گەیشتووە لەگەڵ دوورخستنەوەی ئەوەی شیاوی خودای حەق نییە، چونکە ڕۆچوون زیاتر دەبێتە مایەی سەرلێشێوان و تێکەڵ و پێکەڵی کەسی ڕۆچوو و هیچ شتێکیشی دەست ناکەوێ، بەڵکوو وای لێ دەکات ئەوەی بە بیستن چەسپاوە نەفی بکات بێ ئەوەی بە کارێکی هۆشەکییانە لێکۆڵینەوەی لێ بکات، کەواتە لەم بابەتەدا ڕێگای سەلامەت تەنها ڕێی پێشینانە..

## ١٢٥- هیممەتبەرزان لە نێوان خەونی گەورە و واقیعی تاڵدا

گەورەترین بەڵا ئەوەیە:

- خودا هیممەتێکی بەرزت بداتێ و لێ نەگەڕێ بە خواستی ئەو هیممەتە کار بکەیت، ئەم هیممەتەشت وات لێ دەکات بەزەیی و سك پێ سووتانی خەڵك قەبووڵ نەکەیت لەبەرئەوەی هەڵگرتنی منەتی ئەوانت پێ سەختە، پاشان خودا تووشی هەژاریت دەکات و لێیان وەردەگریت!

- میزاج و مگێزت خۆش و نەرم دەکات بە جۆرێك ئەو خواردنانە قەبووڵ ناکات کە ئامادەکردنیان ئاسانە، ئیتر پێویستت بە زێدەخەرجی دەبێت، پاشان ڕۆزیت کەم دەکاتەوە!

- زانستەکانت لە پایەی مەعشووقدا پیشان دەدات و جەستەت لە دووبارە کردنەوە سست و لاواز دەکات و دەستت لەو پارەیە خاڵی دەکات کە کتێبانی پێ دەست دەخەیت!

- حەز و پەرۆشیت بۆ پلە و ئاستی خواناس و زاهیدان بەهێز دەکات و ئاتاجی تێکەڵبوونی دونیاویستانت دەکات! ئەمەش بەڵایەکی ئاشکرایە..

بەڵام ئەو هیممەتنزمەی دەسبەرداری سواڵی خەڵك نابێ و بە شتێکی کەم لە زانست ڕازییە و پەرۆشی حاڵوباری خواناسان نییە، ئەم کەسە لەدەستدانی هیچ شتێك ئازاری نادات و پێی وایە ئەوەی دەستی کەوتووە ئامانج و مەبەستەکەیە، وەکوو منداڵان بە شتی جوان و ڕازاوە دڵخۆش دەبێ، ئیتر ئەم حاڵەی زۆر بەلاوە ئاساییە!

بەڵکوو بەڵا بۆ خواناسی هیممەتبەرزە کە هیممەتەکەی هەڵیدەنێ بۆ سەرجەم دژەکان تاوەکوو پلەوپایەی کەماڵ زیاد بکات و هەنگاوەکانی تەنێ تەرخان بکات بۆ گەیشتن بە ئامانج و مەبەستەکانی... ئای ئەمەش حاڵێکی ئەوتۆیە کە لە ڕێگایدا توێشووی ئارامگران تەواو دەبێت!

ئەگەر ئەو حاڵەتە بێئاگاییانەی نەبێ کە تووشی ئەم گرفتارە دەبێ کە پێیەوە دەژی ئەوا سەرنجدانی بەردەوامی بۆ پلەوپایەکان چاوی کوێر دەکرد و هەوڵدانیشی بۆ گرتنەبەری ڕێگای گەیشتن بەم پلەوپایانە تووشی پێخواسی دەکرد. بەڵام سەرنجدانەکانی یارمەتیدانی — جارێك بە گەیشتنی بە هەندێ مەبەستی و جارێکیش بە بێئاگابوونی لەوەی چی مەبەستە — ژیانی لەلا ئاسان دەکات!

ئەمە قسەیەکی قورس و وردە تەنها کەسەکانی خۆی تێی دەگەن و تەنها خاوەنەکانیشی ناوەڕۆکەکەی دەزانن!

(ئەم بابەتەی دانەر تەواو بابەتێکی عیرفانی و ڕۆحانییە و هەروەکوو خۆشی وتوویەتی کەسی ئاسایی لەم قسانە تێ ناگات!).

## ١٢٦- ئارامگرتن له هەندێ شت

بـه تـەئویلێکی گەنـدەوە نەفسـم لـه داواکردنـی مەبەسـتێکیدا گەمژەییـەکی لـێم خواست، پێم وت: بۆ خاتری خودا ئارام بگرە، له پردەکەدا لەبەر زۆریـی شـەپۆل و له ترسی نقوومبوون ناتوانیت سەرنج بدەیتە سەیروسەمەرەکانی دەریا!

ئەگەر ویستت کارێك بکەیت هاتنەدی تەقدیر بکە، پاشان سەرنجی دەرەنجامـەکانی و ئەو بەرهەمانەی لێی دەستت دەکەوێ بـدە، کـەمترین شـت پەشـیمان بوونەوەیـە لەوەی کردووتە، دووریش نییە توورەیی و پشتتێکردنی خودای لێ بکەوێتەوە، ئـیتر ئۆف له شتێك که له خودات دابڕێت تەنانەت ئەگەر بەهەشتیش بێت!

پاشـان ئـەی نـەفس بزانـه کـه هـیچ شـتێك بـه هەرەمـەکی نـاڕوات و تـەرازووی داد تەنانەت گەردیلەیەکیش دەخوێنێتەوە.

له مردووان و زیندووان بڕوانه و سەیری ئەو کەسانه بکه که نـاوی بـه بـاش و خـراپ ڕۆیشتووه و هەروەها زۆر و کەمی ئەوە.

ئیبلیس وتی: ئایا لەبەر خاتری خەڵك واز له مەبەستەکەت دێنی؟

وتم: نا، بەڵکوو ئەمە هەندێ بەرهـەمی وەدەسـتهاتووە نـەك لـه مەبەسـتەوە، ئێمـه پێمـان وایـه کەسـێك (٣٠) سـی فەرسـەخ (هـەر فەرسـەخێك سـێ میلـه) دەڕوات

بۆئەوەی پێی بوترێ: ئازا و کۆششکەر، تەقوادار شەڕەفی ناوهێنانی پێ بڕاوە — ئەگەر مەبەستی وەدەسهێنانی ئەوەشی نەبێت — و لە تەرازووشدا لای چاکەی قورس دەبێ ﴿سَيَجۡعَلُ لَهُمُ ٱلرَّحۡمَٰنُ وُدّٗا ٩٦﴾ (مريم: ٩٦) واتە: خودای میهرەبان خۆشەویستیی خۆی پێیان دەبەخشێ.

نەفس وتی: فەرمانت پێ کردم ئارام لەسەر ئێش و ئازار بگرم چونکە وازهێنان لە مەبەستەکان ئازار و ئەشکەنجەیە.

وتم: بۆ مەبەستەکەت قەرەبوو هەیە و بۆ هەموو شتێك کە وازی لێ دێنیت جێگرەوە و بریتییەك هەیە و تۆ لە پایەی بەندایەتی دایت و بۆ هیچ کرێکارێك نییە لە کاتی کرێکاریدا بەرگی ئیسراحەت و پشوودان لەبەربکات، هەموو کاتی تەقوادار وەکوو ڕۆژی بەڕۆژووبوونە(زوو تەواو دەبێ و پاداشتی خۆی وەردەگرێ) هەر کەسێك لە سزا و ئازار ترسا واز لە ئارەزووەکان دێنێ، هەر کەسێك بیەوێ لە خودا نزیك بێتەوە دوورکەوتنەوە لە گوناه (الورع) بەکاردێنێ، لە ئارامگرتنیشدا شیرناییەك هەیە کە لە سەرەنجامدا دەردەکەوێت.

## ١٢٧- شوێنكەوتنی ئارەزوو

هەر كەسێك نەفسی ڕایكێشا بەرەو چێژێكی قەدەغەكراو و سەیركردنی ئەو چێژە مەشغوولی كرد لە سەرنجدانی سەرەنجام و سزاكەی و بانگەوازی عەقڵی بیست كە بانگی دەكرد: ماڵوێران! وامەكە! تۆ لە بەرزبوونەوە دەوەستیت و بەرەو نزمبوونەوە شۆڕدەبیتەوە و پێت دەوترێ: بمێنەوە لەگەڵ ئەوەی هەڵتبژاردووە!

ئەگەر ئارەزووەكەی سەرقاڵی كرد و ئاوڕی بۆ ئەو قسەیە نەدایەوە كە پێی وترا ئەوا لە نزمبوونەوە بەردەوام دەبێ و لە خراپ هەڵبژاردنیدا وەكوو ئەو نموونەیە: سەگێك بە شێری وت: ئەی ئاغای دڕندان! ناوەكەم بگۆڕە چونكە ناشیرینە. شێرەكە پێی وت: ئەتوو ناپاكیت و جگە لەم ناوە هیچی ترت شایان نییە. سەگەكە: تاقیمكەوە. شێرەكە پارچە گۆشتێكی پێدا و وتی: ئەمەم تا بەیانی بۆ بپارێزە منیش ناوەكەت دەگۆڕم. سەگەكە برسی بوو و سەیری گۆشتەكەی دەكرد و ئارامی دەگرت، كاتێ نەفسی بەسەریدا زاڵ بوو وتی: ناوەكەم چ خەوشێكی هەیە؟! سەگ ناوێكی خۆشە. گۆشتەكەی خوارد!

هیممەتنزمیش ئەوهایە، بە نزمترین پلە و ئاست قایلە و هەوا و ئارەزووی دونیا هەڵدەبژێرێ بەسەر چاکە و جوانییەکانی داهاتوو.

بۆ خاتری خودا ئاگادار بن لە ئاگری ئارەزوو کە هەڵایسا و بڕوانە چۆن دەیکوژێنیتەوە؟! ڕەنگە ساتمەیەك بتخاتە نێو بیری لەناوچوونەوە و ئەوەی بڕوات ناگەڕێتەوە.

لە هۆکارەکانی فیتنە دوورکەوە، چونکە نزیکبوونەوە تاقیکردنەوە و بەڵایە زەحمەتە خاوەنەکەی ساغ و سەلامەت دەربچێت.

## ١٢٨- ژيان جەنگە

ديتم خەڵك هەموويان لە ريزى شەڕدان و شەيتانەكانيش تيرى ئارەزووەكانيان تێ دەگرن و بە شمشێرى چێژ لێيان دەدەن.

ئەوانەى تێكەڵ و پێكەڵيان كردووە لە يەكەم ڕووبەڕووبوونەوەدا دەپێكرێن و دەكەون. بەڵام تەقوادارەكان لە هەوڵێكى گەورەى ڕووبەڕووبوونەوەدان!

بێگومان لە بەردەوامیی شەڕدا برين و پێكان هەر دەبێت، ئەوان بريندار دەبن و تيمار دەكرێن وەلێ لە كوژران پارێزراون.. بەڵێ برينى ڕووخسار پەڵەيەكى هەميشەييە، با موجاهيدەكان لەمە ئاگادار بن..(مەبەستى دانەر لە برينى ڕووخسار گوناهى گەورەيە)..

## ١٢٩- وریای تەڵەی دونیابە

دونیا تەڵەیە و نەزان بە یەکەم ڕوانین دەکەوێ، بەڵام ژیری لەخواترس ئارام لەسەر برسێتی دەگرێ و دەوروخولی دانەوێڵەکە دەدات و سەلامەتیش دوورە، چەندان ئارامگر ساڵانێك کۆشا پاشان دواجار کەوت!

تکایە زۆر وریابن، کەسمان بینی لەسەر ڕێی ڕاست بوو پاشان لەسەر لێواری گۆڕ خلیسکا.

## ١٣٠- سەرەنجامی گوناه بەدە

براكانم و ئەوەی ئامۆژگاریی من وەردەگرێ، بزانن كە گوناه كاریگەریی ناشیرینی هەیە، تاڵییەكەی چەندان هێندەی شیرینییەكەی زیاترە، سزادەریش لە بۆسەدایە و هیچ شتێك لە چنگی دەرناچێ.

مخابن بۆ كەسێك كە بە قامچی لێی دەدرێ و هەست بە ئازار ناكات! ئەفسووس بۆ زامدارێك و لەبارەی چاكبوونەوەی خۆی هیچ هەواڵێكی نییە! داخ و ئۆف بۆ كەسێك كە لەنێو سزادا دەگەوزێ و پێی نازانێ! سوێند بە خوا گەورەترین سزا ئەوەیە نەزانیت ئەوە سزایە!

سەیرم بەو كەسە دێت كە خۆی دەسخەڕۆ دەكات! نەفسی بە شەهوەتێك ڕازی دەكات و پاشان خوداشی بە تاعەتێك ڕازی دەكات و دەبێژێت: چاكەیەك و خراپەیەك!

ماڵوێران! لە گیرفانت دەبەخشی و لە كاڵات دەرپەڕێنی و ڕووخساری پلەوپایەشت لەكەدار دەكەیت! ڕەنگە برینداربوونێك ببێتە هۆی كوشتن، لەوانەیە ساتمەیەك مایەی لەناوچوون بێت، ڕەنگە گوناهێكی ڕابردوو قەرەبوو نەكرێتەوە.

هەشبەسەر! وریای خۆتبە، چاوەڕێی چی لە تەوبە و گەڕانەوەت دەکەیت؟ پیربوون؟ ئا ئەوەتا ئێسکەکانت لاواز بوون! دوای کۆچکردنی کەسوکار و منداڵ و خزم و خوێش هەر نابێ تۆش بەدوایاندا بچیت؟!

وادانێ ئەوەی لە دونیا بە تەمای بوویت هاتەدی، ئیتر چی؟ یا ئەوەتە شتێکی کاتییە و بۆ ماوەیەك سەرقاڵت دەکات، پاشان دوا قومی چێژ وەکوو شتێك وایە لە گەرووت بچەقێت! یان ئەوەیە لە خۆشەویستەکەت دابڕێیت یان ئەو لە تۆ دابڕێت.

ئای ئەوە چ قومێکی تاڵە حەزت دەکرد نەتدیتبایە!

ئاخ بۆ عەقڵێ کە لە ڕامان بێبەش و دابڕاوە، بۆ کەسێك کە کانیاوی لێ دیارە و ڕێی چوونی لێ بەستراوە! ئایا لەم گۆڕانە ترسێنەرێك نییە؟! ئایا لە هاتوچۆی زەمان جڵەوگیرییەك نییە؟! کوا ئەو کەسەی هەیبوو و بە ئاوات و هیواکانی گەیشت؟! لە کۆڕ و یانەکانیان بانگیان بکە! هەیهوو، ئیتر هیچ نابیستن و بوونەتە کەڕەی شەریعەت. ئەگەر هەر مردن بووایە ئاسان بوو بەڵام قورپەسەری بۆ دوای مردنە!

ئەی هەژاری دوێنێ و پارچەپارچەبووی سبەی، کارکردن بەدەستبێنە!

بە چ ڕوویەکەوە دەچیتەوە لای خوداکەت؟! ئەو ئارەزووەی بەدەستی دێنیت واژەی سەرزەنشت دەهێنێ؟!

بۆ خاتری خودا، بەزەیی دوای سەرزەنشت ڕەنگە ڕقی ناخی دڵ بەتەواوی هەڵنەکەنێ، ئەی ئەگەر دوای سەرزەنشت سزا بێت چۆن؟!

لە خوای گەورە دەپاڕێینەوە لە خەوی بێئاگایان بێدارمان بکاتەوە و شتەکان وەکوو خۆیان پیشانمان بدات تاوەکوو عەیبەکانی گوناه بزانین.

## ١٣١- تەقوا دەرووی خۆشییە

کێشـەیەك تـەنگی پـێ هەڵچـنیم و دونیـای لێ هێنامـەوە یـەك و تووشـی خـەمێکی بەردەوامی کردم، وام لێ هات زێدەڕۆیی بکـەم لـە بیرکردنـەوە لـە قوتـاربوون لـەم خەمە بە هەموو شێوەیەك، هیچ ڕێگایـەکم نەدیتـەوە! ئـەم ئایەتـە هاتـە بەرچـاوم ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مَخۡرَجٗا﴾ (الطـلاق: ٢) واتـە: هـەر کەسـێك تـەقوای خـودا بکـات خودا دەروویەکی بۆ دەکاتەوە.

ئیتر زانیم تەقوا هۆکارێکە بۆ دەرچوون لە هەموو خەمێك، دەستم کرد بە هێنانەدی تەقوا دەرووم دۆزیەوە.

پێویست ناکات مرۆڤ پشت ببەستێ یان دەست بگرێ یان بیر بکاتەوە لە هیچ شتێك جگە لـە گوێڕایـەڵی و تاعـەتی خـودا نـەبێ، چـونکە بەدڵنیاییـەوە ئـەوە هۆکـاری کردنەوەی هەموو داخراوێکە. پاشان سەیرتر ئەوەیە ئەم فریاکەوتنە بە جۆرێك بێت کە مرۆڤ بیری لێ نەکردبێتەوە هەروەك خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَيَرۡزُقۡهُ مِنۡ حَيۡثُ لَا يَحۡتَسِبُۚ﴾ (الطلاق: ٣) واتە: بە جۆرێك و لە شوێنێکەوە ڕۆزی دەدات کە حیسـابی بۆی نەکردبێت.

پاشـان پێویسـتە کەسـی تـەقوادار بزانێـت کـە خـودای گـەورەی بەسـە و دڵـی بـە هۆکارەکانـەوە نەبەسـتێتەوە، خـودای بـاڵا فەرموویـەتی: ﴿وَمَن يَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسۡبُهُۥٓۚ﴾ (الطلاق: ٣) واتە: هەر کەسێك پشت بە خودا ببەستێ ئەوی بەسە.

## ١٣٢- حیكمەتی دواكەوتنی گیرابوونی نزا

سەیر، پێداگریتە لەسەر داوای مەبەست و ئامانجەكانت! هەرچەند تەگەرەی تێ بكەوێ و ڕێگری لێ بكرێ تۆ پێداگریت زیاتر بێت و لەبیرت بچێت كە لەبەر دوو شت نایەتەدی: یان لەبەر بەرژەوەندی تۆ، ڕەنگە هاتنەدی ئازارێكی تێدا بێت، یان لەبەر گوناهەكانتە، چونكە خاوەن گوناه لە گیرابوونی نزا دوورە.

ڕێگاكانی گیرابوون لە پیس و پۆخڵییەكانی گوناه و سەرپێچییەكان خاوێن بكەوە و سەیر بكە داوای چی دەكەیت: ئایا بۆ چاكبوونی دینەكەتە یان تەنها بۆ ئارەزووتە؟

ئەگەر تەنها بۆ ئارەزوو بوو ئەوا بزانە نەهاتنەدی بۆ تۆ بەزەیی و لوتفە، تۆش لە پێداگریكردنت لە داوایدا وەكوو منداڵێك وایت كە داوای شتێك دەكات مایەی ئازارە بۆی و لەبەر بەزەیی پێداهاتنەوە پێی نادرێ.

ئەگەر بۆ چاكەی دینەكەشت بوو ئەوا ڕەنگە بەرژەوەند لە دواخستنیدا بێت یان چاكەی دین بە نەبوونی بێت.

بە گشتی، نەخشە و بەرنامەی خودا لە نەخشەی خۆت باشترە، ڕەنگە پێنەدانی ئەوەی ئارەزوو دەكەیت تاقیكردنەوە بێت تا ئارامگریت تاقی بكاتەوە، تۆش

ئارامگرتنی جوانی پیشانده، ئیتر لە نزیکەوە و بەم زووانە ئەوە دەبینیت کە دڵخۆشت دەکات.

هەر کاتێ ڕێی گیرابوونت لە چڵکی گوناه پاك کردەوە و ئارامت لەسەر پێشهاتەکانی خودا گرت ئەوا هەرچی ڕوودەدات بۆت باشترە، جا بەخشین بێت گرتنەوە.

## ١٣٣- هەمیشە ئامادەی مردن بە

پێویستە لەسەر ئەو کەسەی کە نازانێ کەینێ مردن یەخەگیری دەبێ ساز و ئامادە بێت و بە لاوێتی و لەشساغی دەسخەڕۆ نەبێ، چونکە کەمترینی ئەوانەی دەمرن پیرەکانن و زۆرترینیش لاوەکانن، بۆیە ئەوانەی بەتەمەندا دەچن دەگمەنن، وتوویانە:

یُعَمَّرُ واحِدٌ فَیَغُرُّ قوماً ویُنسی مَن یموتُ مِنَ الشبابِ

واتە: کەسێك تەمەنی درێژ دەبێ گەلێك دەسخەڕۆ دەبێ و ئەو لاوانەی لەبیردەچێتەوە کە دەمرن..

یەکێك لە دەسخەڕۆ و فریوخواردنەکان ئاوات درێژییە کە هیچ ئافەتێك لەم گەورەتر نییە، ئەگەر ئاوات درێژی نەبووایە ئەوا پشتگوێخستنیش نەدەبوو، هەر لەبەر هیوادرێژییە سەرپێچییەکان پێش دەخرێن و تەوبەش دوادەخرێت، دەسپێشخەری لە ئارەزووەکان دەکرێت و گەڕانەوە فەرامۆش دەکرێت.

ئەگەر نەتتوانی هیوات کورتکەیتەوە ئەوا وەکوو کەسێك کە هیواکورتە کار بکە: شەو مەکەوە تا سەیری کارەکانی ئەم ڕۆژەت نەکەیت، ئەگەر هەڵەیەکت دیت بە تەوبەیەك بیسڕەوە، یان پێشێلکارییەکت کردبوو بە داوای لێخۆشبوون لە خودا

پینەی بکە. کە بەیانیشت کردەوە سەرنج بدە لە شەودا چیت کردووە. ئامان وریای دواخستن بە چونکە ئەو گەورەترین سەربازی شەیتانە..

پاشان بۆ خۆت کورتیی تەمەن و زۆریی کار و پەشیمانبوونەوەی زۆرت لەسەر کەمتەرخەمییەکانت لە کاتی مردن و خەم و خەفەتی زۆرت لەو کارانەی لە دەستت چوون بێنە بەرچاو. پاداشتی ئەوانە بێنە بەرچاوت کە کامل و تەواون و تۆش ناتەواو و کەموکورتیت، ئەوانەش کە کۆششکار بوون و تۆش تەنبەڵ.

نەفست لە ئامۆژگاری و بیری باش خاڵی مەکە چونکە نەفس وەکوو ئەسپی سەرکەش وایە ئەگەر جڵەویت شل کرد ئەوا دوور نییە تێت هەڵدات. سوێند بە خوا ئارەزووەکانت چەپەڵیان کردوویت و تەمەنت بەفیڕۆ داوە.

ئیتر کاتی ئەوەیە دەسپێشخەری بکەیت لە چاککردنەوە و پاراستنی ئەوەی ماوە بەر لەوەی حەز و ئارەزووەکان لەناوت ببەن، چەندان کەس قاچیان لە تەڵەی ئارەزوو گیربوو! چەندان کەسیش بە سەرخۆشییەوە کەوتنە نێو بیری لەناوچوونەوە! هەموو هێز و توانایەکیش هەر لە خوداوەیە..

## ١٣٤- وریای تاوان و سەرپێچییەکان بن

تکایە زۆر زۆر وریای تاوان و سەرپێچییەکان بن چونکە سەرەنجامیان زۆر خراپە. چەندان گوناه و تاوان هەیە هێشتا خاوەنەکەی هەمیشە لە نزمبوونەوەدایە، لەگەڵ هەڵخلیسکانی قاچەکانی و زۆر هەژاری و خەم و خەفەتەکانی لەو شتانەی لە دونیا لە دەستی چووە و داخ و پەژارە بۆ ئەو کەسەی وەدەستی هێناوە.

مخابن بۆ سزادراوێك کە هەست بە سزاکەی ناکات!

ئاخ و ئۆف بۆ سزایەك کە دوا دەکەوێت تا هۆکارەکەی لەبیردەچێتەوە.

ئەوە نییە ئیبن سیرین دەڵێ: تانەی هەژاریم لە پیاوێك دا، دوای چل ساڵ خۆم هەژار کەوتم!

(ئیبن ئەلجەللاء) دەڵێ: تەماشای لاوێکی جوانکیلەم کرد، دوای چل ساڵ قورئانم بیرچوویەوە !

داخ و پەژارە بۆ سزادراوێك کە نازانێت گەورەترین سزا هەست پێ نەکردنیەتی!

بۆ خاتری خودا تەوبە باش بکەن بەڵکوو دەبێتە مایەی پاراستن لە سزا.

زۆر زۆر وریای گوناه بن بەتایبەتی گوناهی تەنهایی چونکە شەرکردن لەگەڵ خودا مرۆڤ لەبەر چاوی دەخات.

لە پەنهانیدا نێوانی خۆت و خودا چاك بکە، خودا حاڵوبارت لە ئاشکراییدا چاك دەکات.

ئەی تاوانکار، بە داپۆشینی خودا مەخەڵەتێ، ڕەنگە ڕۆژێك ئاشکرات بکات و ئابڕووتکاوت بکات، بە لەسەرخۆییشی فریو مەخۆ، لەوانەیە سزای بۆ ئامادە کردبێت.

پێویستە نیگەران بیت و پەنا بۆ خودا ببەیت و لێی بکرۆزێیتەوە، ئەگەر شتێك سوودی هەبێ هەر ئەوەیە. بە خەمباری، خۆت بەهێزکە و جامی فرمێسك فڕکە و بە پاچی پەژارە چاڵی دڵی ئارەزوو هەڵکەنە، بەڵکوو بە ئاوی کانی جەستەی تاوانت بشۆیت.

## ١٣٥- پاراستنی سنووری خودا

براکانم: ئامۆژگاری لەو کەسە ببیستن کە ئاگاداری هەواڵی ژیانە و ئەزموونديدەيە. بە ئەندازەی بەگەورەزانینی خودا ئەویش گەورەتان دەکات، بە ئەندازەی مەزنکردنی ڕێز و ڕێزگرتنیەوە ئەویش ڕێز و حورمەتتان مەزن دەکات. سوێند بە خوا کەسم بینیوە تا بەساڵداچوون تەمەنی خۆی لە زانستدا خەرج کردووە پاشان سنووری بەزاندووە ئیتر لە کن خەڵك سووك بووە و ئاوڕیان لێ نەداوەتەوە ئەگەرچی زانستی زۆر بووە و موجاهەدەکردنی بەهێز بووە !

کەسم بینیوە لە کاتی گەرموگوڕیی لاوێتیدا ئاگای لە سنوورەکانی خودا بووە — لەگەڵ کەموکورتی بەراورد بەو زانایە — ئیتر خودا لە دڵی خەڵکدا گەورەی کردووە تا ئەوەی دڵەکان خۆشیان ویستووە و هۆگری بوون و زیاتر لەو چاکەیەی هەیبووە باسیان کردووە.

کەسیشم بینیوە کە ئەگەر لەگەڵ خودا ڕاست بووایە و ڕاستەڕێ بووایە ئەوا کاروباری ڕێکوپێك و ڕاست دەبوو، ئەگەر لایدابووایە لوتف و میهرەبانیی خودا ڕووی لێ وەردەگێڕا.

ئەگەر داپۆشین و بەزەییی بەرفراوانی خودا نەبووایە ئەمانەی باسم کردن ئابڕوویان دەچوو. بەڵام زۆربەی جار لە سزادا تەنها تەنبێکردن یان بەزەیی پێدا هاتنەوە هەیە هەروەك لەبارەی خوداوە وتراوە:

وَمَنْ كَانَ فِي سَخَطِهِ مُحسِناً　　　فَكَيفَ يَكُونُ إِذَا مَا رَضِي

ئەگەر یەکێك لە تووڕەییدا چاکەکار بێت ئەی دەبێ لە کاتی خۆشنوودیدا چۆن بێت؟!

بەڵام خودای دادپەروەر خزم خزمێنەی لە کن نییە و ستەم ناکات و هیچ شتێکی لە لا ون نابێ.

## ١٣٦- خۆهەڵواسین بە دەرگای تەوبە

ئەی گوناهبار! ئەگەر هەستت بە هەوای سزا کرد هاتوهاواری زۆر مەکە و مەڵێ: تەوبەم کرد و پەشیمان بوومەوە، دەبا ئەو سزایەی پێم ناخۆشە لەسەرم لاچێ!.. ڕەنگە تەوبەکەت نەهاتبێتەدی و وەرنەگیرا بێت.

سزادان کاتێکی هەیە کە وەکوو نەخۆشی درێژ ئەویش درێژ دەبێتەوە، تا کاتی تەواو نەبێ هیچ شتێك کەڵکی نییە.

لە نێوان کاتی ﴿وَعَصَى﴾ تا کاتی ﴿فَتَلَقَّى﴾ ماوەیەکی درێژ هەیە.

ئەی هەڵەکار ئارام بگرە تاوەکوو ئاوی چاوت دەچێتە نێو کراسی پیسی دڵتەوە، ئەگەر دەستی خەم کراسەکەی باش گوشی و پاشان چەند جارێکی تر بە فرمێسکی دڵت شووشتت ئینجا بڕیاری پاکبوونەوەی دەدرێ.(واتە دەبێ بە فرمێسکی پەشیمانی تاوانەکانت بشۆیتەوە).

ئادەم لەسەر گوناهەکەی سێ سەت ساڵ گریا! پێغەمبەر ئەیووب هەژدە ساڵ لە نەخۆشییەکەیدا مایەوە! پێغەمبەر یەعقووب هەشتا ساڵ بۆ یوسف گریا! (ئەم ماوە و ساڵانە هیچیان لە سەرچاوەی باوەڕپێکراوەوە نەهاتوون).

بەلاّ و ناخۆشییەکان کاتێکیان هەیە پاشان تێدەپەڕن. ڕەنگە سزایش هەبێ تا کاتی مردن بەردەوام بێت. پێویستە تۆ دەست بە میحرابی گەڕانەوە بگریت و وەکوو سواڵکەرێك دانیشیت و خواردنت نیگەرانی بێت و خواردنەوەت گریان، ڕەنگە مژدەهێنی قەبووڵکردن بێت، ئیتر چەشنی یەعقووب خەم و پەژارەت لابچێت و چاوی دڵت ڕۆشن ببێتەوە، ئەگەریش لە زیندانی خەمت مردیت ئەوا ڕەنگە خەمی دونیا بووبێتە بریتی خەمی ئاخیرەت، لەوەشدا قازانجێکی گەورە هەیە.

## ١٣٧- وریای سەرەنجامی سەرپێچییەکان بە

لەسەر کەسی ژیر پێویستە وریای سەرەنجامی گوناه و سەرپێچییەکان بێت چونکە ئاگرەکەی لە ژێر خۆڵەمێشدایە. ڕەنگە سزا دوابکەوێت پاشان لەناکاو بەسەرتدا بدات، ڕەنگە بەخێرایی بێت.

دەسپێشخەری بکە لە کوژاندنەوەی ئاگری گوناهەکان، هیچ شتێکیش وەکوو ئاوی چاو ئەو ئاگرە ناکوژێنێتەوە، ڕەنگە بەرانبەرەکەت بەر لەوەی دادوەر بڕیار بدات ڕەزامەند بێت و لێت خۆش بێت.

## ١٣٨- ئومێدی بێ كردەوە تراویلكەیە

سەیرم لە كەسێك دێ كە خودا دەناسێ كەچی سەرپێچی دەكات تەنانەت ئەگەر لەناوچوونی خۆشی تێدا بێت! ئایا ژیان هەر لەگەڵ وی نییە؟! دونیا و ئاخیرەت هەر بۆ ئەو نییە؟!

ئۆف لە شلرەوێك كە كردەوەیەكی نەشیاو دەكات بۆ وەدەسهێنانی شتێك كە پێی خۆشە! سوێند بە خوا چەندان هێندەی ئەوەی وەدەستی هێناوە لە دەستی چووە. ئەی خاوەن زەوق ڕووبكە ئەوەی دەیڵێم!

ئایا لە حاڵ و ژیانتدا تووشی كۆسپ و شپرزەیی بوویت تەنها ئەو كاتە نەبێ كە سەرپێچیی خودات كردووە؟!

ولا انثنیٰ عزمی عن بابكم إلا تعثرت بأذیالی

هەر كاتێ لە دەرگای تۆ دووركەوتبمەوە ئیللا تووشی تەنگوچەڵەمە بووم.

ئەم بەسەرهاتەت لە پێشینانەوە نەبیستووە كە دەڵێ: لەسەر شورای شاری بەیرووت لاوێكم دیت یادی خودای دەكرد، پێم: پێویستییەكت هەیە؟ وتی: ئەگەر پێویستییەكم هەبێ ئەوا بەدڵەوە داوا لە خودا دەكەم و بۆم جێبەجێ دەكات.

ئەی سەوداكاران! بۆ خاتری خودا، كانیاوەكە شێلوو مەكەن! لەسەر دەرگای چاودێری وەكوو پاسەوان بوەستن! لێ مەگەڕێن ئەوەی بێكەڵكە بچێتە ژوور و تێكی بدات! دەسبەرداری مەبەستەكانی خۆتان بن بۆ وەدەسهێنانی خۆشویستراوی خۆشەویست، بەدڵنیاییەوە مەبەستەكانتان دێتەدی.

من دەڵێم: ئۆف بۆ كەسێك بە نیازی سزا و پاداشت واز دێنێ! ئایا ئەمە مەرجی بەندایەتییە؟! نەخێر، بەڵكوو پێویستە لەسەر من كە ئەگەر كۆیلە بم كار بكەم بۆ ئەوەی ئاغاكەم ڕازی بێت نەك پێم ببەخشرێ، ئەگەر من ئەویندار بم ئەوا دەسهەڵگرتن لە مەبەستەكانم لەپێناو ڕەزامەندیی خودا بە گەیشتن بەو دەزانم.

ئەی ئەو كەسەی فریوخواردووی مەبەستەكەتی ئامۆژگاریی من وەربگرە!

ئەگەر لە بەرگەگرتنی بەڵا لاواز بوویت ئەوا داوای فریاكەوتن لەو بكە، ئەگەر خەمی بژاردەی ئەو ئازاریدایت ئەوا تۆ لەبەر دەستی ویدایت و لە بەزەیی ئەو بێهیوا مەبە تەنانەت ئەگەر بەڵاكە گەرووشی توند كردی.

سوێند بە خوا مردنی خزمەتكار لە خزمەتدا لە لای ژیران شتێكی باشە.

براكانم! بۆ خۆم دەڵێم، هەر كەسێك كانیاوێكی لەگەڵمدا هەیە با بێت. ئەی نەفس! ئەوەی بە تەمای نەبوویت پێت دراوە، گەیەندراویت بەوەی داوات نەكردووە، ئەو كردەوە ناشیرینانەت داپۆشراوە كە ئەگەر ئاشكرا بووایە لەبەر بۆنی ناخۆشیان لووتەكان هاواریان لێ هەڵدەستا! ئیتر ئەو هاتوهاوارە چییە لە لەدەسچوونی

تێروتەواویی مەبەستەکان؟! ئـەتوو کۆیلـەیت یـان ئـازاد؟! ئـەی نـەتزانیوە تـۆ لـە خانەی تەکلیفدایت؟!

ئەم گوتارە پێویستە بۆ نەفامان بێت، کوا بانگەشـەی زانسـت و زانیاریـت؟! ئایـا ئەگەر بایەك هـەڵیکرد و چـاوی بردیـت چـۆن چـێژ و خۆشـیت لـە دونیـا دەدیـت؟! بەداخەوە بۆت! ئەو بینایی و چاوی دڵە کوێر بوو کە بەرێزترە و نـەتزانیوە چـەندم گوت: بەڵکوو و بەڵکوو؟ تۆش لە هەڵەدا بەرەو پێشەوە دەچیت.

کەشتیی تـەمەن لە کەناری گۆڕ نزیـك بۆتـەوە و تـۆش لەنێویـدا کاڵایـەکی وات نییـە قازانج بکات... بای لاوازی لە دەریای تەمەنـدا یـاری کـرد و چـنینی تواناکـانی لێـك هەڵوەشاندەوە وەك ئـەوەی کەشـتییەکەی لێکوپێـك کردەوە...گەیشـتیتە کۆتـایی ماوەکە و چاوی ئارەزووت ئاوڕ لە منداڵی دەداتەوە! بۆ خاتری خودا، دوژمنانت بە خۆت خۆشحاڵ مەکە!

بایەخ بە خەڵوەت و تەنیانشـینی بـدە و هـاوڕێی عـەقڵ ئامـادە بکـە و لـە پشـێویی هزردا بگەڕێ و ڕابگە بەوەندە تەمەنەی ماوتە بـەر لـەوەی هـەوا و ئارەزووەکـان لـە ڕێی ڕاستت لابدەن. سەیروسـەمەرە ئەوەیـە هەرچـەند تەمـەن هەڵکشـێ تـۆ بـەرەو خوار دەبیتەوە و هەرچەند مردن توند بـوو تـۆ لاواز دەبیـت! پێـت وایـە تـۆ لەوانـە دەبیت کـە ژیانیـان بـە فیتنـە کۆتـایی دێـت و لـە ئـاخروئۆخری تەمەنیـدا گرفتـاری تاقیکردنەوە و مەینەت دەبێ؟!

سەرەتای تەمەنت باشتر بوو لە دواییەکەی...لە سەردەمی لاویدا باشتر بوو وەك لە ڕۆژگاری پیری..

﴿وَتِلْكَ ٱلْأَمْثَٰلُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ ۖ وَمَا يَعْقِلُهَآ إِلَّا ٱلْعَٰلِمُونَ ﴿٤٣﴾﴾ (العنکبوت: ٤٣) واتە: ئەم نموونانە بۆ خەڵك دێنینەوە و تەنها زاناکان تێیان دەگەن..

داوای ئەو شتە لە خودا دەکەین کە هیچ شتێك بە بێ ئەو بەدەست نایەت ئەویش هاوکاری و یارمەتیی ئەوە، خودا بیسەری وەڵامدەرەوەیە.

## ١٣٩- شتێك له پێناو خودا واز لێ بێنی به باشتر قەرەبوو دەکرێتەوە

ڕۆژانێك توانای ئارەزوویەکی نەفسم هەبوو کە لە لای نەفس لە ئاوی زوڵاڵ لە دەمی تینوو خۆشتر بوو و تەئویلیش وتی: لێرەدا هیچ ڕێگر و کۆسپێك نییە تەنها جۆرێك خۆپارێزی (الورع) نەبێ! ڕوواڵەتی بابەتەکە ئەوەبوو کە دروست و ڕێپێدراو نییە، لەنێوان هەردووکیان دوودڵ و ڕاڕا بووم، ڕێگریم لە نەفس کرد و پێم وت: ئەی نەفس! سوێند بە خوا، هیچ ڕێگایەك نییە بۆ ئەو شتەی حەزی لێ دەکەیت! پەشۆکا، هاوارم لێی کرد: لە چەندان شت هاوئاوازت بووم چێژ و خۆشییەکەی ڕۆیشت و خەمی کردنەکەی مایەوە! مەبەست لە گەیشتن بەم شتە بخەملێنە، ئایا پەشیمانی چەندان هێندەی چێژەکەی نییە؟! وتی: چۆن و چی بکەم؟ وتم:

صبرتُ ولا والله ما بي جلادة ... على الحب لكني صبرتُ على الرَّغم

ئەگەرچی لەسەر خۆشەویستی، ئازایەتیم نییە بەڵام بەناچاری ئارامم گرت.

ئەوەتا منیش لەسەر ئەم کارەم چاوەڕێی پاداشتی باشی خودا دەکەم. بەشێکی ئەم لاپەڕەیەشم بە سپێتی بەجێ هێشتووە هیوادارم پاداشتی باش لەسەر ئارامگرتن ببینم تاوەکوو بە ئیزنی خوای گەورە بینووسم، چونکە ڕەنگە پاداشتی ئارامگرتن زوو بێت یان درەنگ: ئەگەر زوو هات ئەوا دەینووسم ئەگەریش دواکەوت

ئەوا گومانم لە پاداشتی جوانی خودا نییە بۆ کەسێك لێی بترسێ، هەر کەسێك لەپێناو خودا واز لە شتێك بێنێ ئەوا خودا بە باشتر بۆی قەرەبوو دەکاتەوە.

سوێند بە خوا من تەنها لەبەر خودا وازم لێ هێناوە، ئەوەندەم بەسە کە وازلێهێنانەکەی ببێتە توێشوو تەنانەت گەر پێم وترا: ئەو ڕۆژەت لەبیرە کە خودات هەڵبژارد بەسەر ئارەزووەکەت؟ وتم: فلان و فیسار ڕۆژ.

ئەی نەفس، شانازی بکە بە سەرکەوتنت و سوپاسی ئەو زاتە بکە کە یارمەتی دایت، پشتی چەندان کەسی غەیری تۆی بەردا! وریابە تۆش وەکوو وان پشتت بەرنەدرێ! هێز و تواناش هەر لە خوداوەیە.

ئەمە لە ساڵی ٥٦١ی کۆچیدا بوو..کاتێ ساڵی ٥٦٥ هات بەوە باشتر قەرەبوو کرامەوە، وتم: ئەمە پاداشتی ئەو وازلێهێنانەیە لەپێناو خودای گەورە، بەدڵنیاییەوە پاداشتی ئاخیرەت باشتریشە و سوپاس بۆ خوا.

## ١٤٠- باودانى شەهوەت، دينت لىٚ دەسێنێتەوە

گلەیی ناکەم لە کەسێك لە ڕێگای ڕێپێدراوەوە بەدوای چێژی دونیاوە بێت چونکە هەموو کەسێك توانای وازهێنانی نییە. بەڵکوو بەڵا و ناسۆری بۆ کەسێکە بەدوایدا گەڕاوە و دەستی نەکەوتووە یان زۆربەی ئەوەی دەستی کەوتووە لە ڕێی حەرامەوەیە، هەوڵی وەدەسهێنانی داوە و بەلایەوە گرینگ نەبووە چۆنی دەست کەوتووە.

ئەم بەڵا و مەینەتە کە تێیدا مافی عەقڵ خوراوە و خاوەنەکەی سوودی لە بوونی وەرنەگرتووە چونکە ئەگەر ئەوەی هەڵیبژاردووە و سزاکەی بکێشرێن ئەوا تای تەرازووی چێژەکە دێتە خوارێ لەگەڵ یەکەم گەردیلە لە سزادانی! چەندان کەسمان بینی شەهوەت و ئارەزووی هەڵبژارد دینەکەی لێ سەندرایەوە و لەدەستی چوو!

با کەسی ژیر کاتێ لاپەڕەکانی حاڵوباری هەڵدەداتەوە سەیری بێت لەوەی چۆن شتێکیان هەڵبژارد کە لەگەڵیدا نەمانەوە و بە هۆیەوە تووشی سزایەکی وەها بوون کە لێیان جیا نابێتەوە؟!

بۆ خاتری خودا مافی عەقڵ مەخۆن! با ئەو کەسەی بە ڕێگایەکدا دەڕوات سەیری پێش خۆی بکات و بزانێ قاچی لەکوێ دادەنێ، ڕەنگە کەسێك پەلە بکات و پێش خۆی بەباشی نەبینێ و بکەوێتە نێو چاڵێکەوە و لەنێوبچێت.

با چاوی وریایی کراوە بێت، ئێوە لە ڕیزی شەڕدان نازانرێ تیر لەکوێوە دێت، یارمەتی خۆتان بدەن و مەبنە دوژمنی نەفسی خۆتان.

## ١٤١- گوێڕایەڵیی ڕاست و دروست

خوای گەورە لە شادەماری لامل لە بەندەکەی نزیکترە بەڵام وەکوو نادیارێکی دوور مامەڵەی بەندەکەی کردووە: فەرمانی پێ کردووە سەردانی ماڵەکەی(کەعبە) بکات و دەستەکانی بۆ بەرزکاتەوە و داوای لێ بکات.

دڵی نەزانەکان هەست بە دووری دەکەن بۆیە تاوان و سەرپێچییان لێ ڕوودەدات، ئەگەر ئاگایان لە دیاری بەرچاو بووایە ئەوا وازیان لە گوناهەکان دێنا. بێدارەکان بە نزیکیی خودایان زانیوە بۆیە ئاگاداری خۆیان بوون و هەستیان بە چاودێریی خودا کردووە و پێیان لە بەرە زیاتر ڕانەکێشاوە، ئەگەر جۆرێك لە داپۆشینی چاوی ڕاستەقینەی چاودێری نەبووایە ئەوا هیچ دەستێك بۆ خواردن درێژ نەدەکرا و هیچ چاوێك توانای بینینی نەدەبوو!

فەرموودەی ((إنه ليغان على قلبي، وإني لأستغفرالله في اليوم مئة مرة)) رواه مسلم، لەم جۆرەیە...واتە: هەندێ جار دڵم بە هۆی کاروباری دونیاوە تووشی بێئاگاییەك لە یاد و زیکری خودا دەبێ بۆیە من ڕۆژانە سەت جار داوای لێخۆشبوون لە خودا دەکەم..

گوێڕایەڵی و تاعەت تەنها نوێژ و ڕۆژوو نییە هەروەك زۆربەی نەزانەکان وا گومان دەبەن، بەڵکوو بریتییە لە گوێڕایەڵیی هاوشان لەگەڵ جێبەجێکردنی فەرمانەکانی

خـودا و دوورکەوتنـەوە لـەو شـتانەی قەدەخـەی کـردوون، ئەمـە بنچـینە و بنـەمای گشتییە.

چـەندان خواپەرسـت هەیـە دوورە لـە خـودا چـونکە بنچـینەکەی ون کـردووە و بنـــەماکانی شـــکاندووە بـــە سەرپێچـــیکردنی فەرمانـــەکان و ئەنجامـــدانی قەدەخەکراوەکان.

ڕاسـت و دڵنیـا کەسـێکە سـەری تـەرازووی خودپرسـی بەدەسـتەوە بگـرێ، ئـەوەی لەسـەر شـانیەتی ئـەنجامی بـدات و لـەوەش دوورکەوێتـەوە کـە نـەهی لێ کـراوە، ئەگەریش سوننەتەکانیشی کرد ئەوا باشە وەگەرنا زیانێك ناکات.

## ١٤٢- چێژەكانی دونیا پڕن لە خەوش، لێیان مەكۆڵەوە

بە گشتی دونیا پرد و ڕاڕەوە، پێویستە مرۆڤ بە چێژەكانییەوە پێشبڕكێ نەكات و، بە هۆیانەوە تەنها ڕۆژگار بقەتێنێ. چونكە ئەگەر مرۆڤ بیر لە چۆنییەتیی سەربڕاوەكان و پیس و پۆخڵیی قەسابەكان و كاری دروستكردنی خۆراك و پێخۆر بكاتەوە ئەوا حەزی بە خواردن نەدەكرد و دڵی بۆی نەدەچوو! ئەگەر بیری لە جووڵەی پارووی ناو دەم بكردایەتەوە كە لەگەڵ لیك تێكەڵ بووە نەیدەتوانی قوتی بدات.

مرۆڤ لە دوو حاڵ بەدەر نییە: یان دەیەوێت خۆشی لە چێژ و خۆشییە ڕێپێدراوەكان وەربگرێت، یان تەنها بە شتە پێویست و زەروورەكان كات بەڕێ بكات.. هەر یەكێكیان هەڵبژێرێت نابێ لە ناوەڕۆك و وردەكارییان بكۆڵێتەوە، چونكە ئەگەر تەماشای عەورەتی ژنەكەی بكات بێزی لێ دەبێتەوە و لێی دوور دەكەوێتەوە.

خاتوو عائیشە (خودا لێی ڕازی بێت) وتوویەتی: ((نە من عەورەتی پێغەمبەرم دیوە و نە ئەویش هی من)) ئیمامی ئەحمەد و ئیبن ماجە و بەیهەقی گێڕاویانەتەوە و ئیمامی ئەلبانی بە لاوازی داناوە.

پێویستە كەسی ژیر كاتێكی دیاریكراوی هەبێت داوا لە هاوسەرەكەی بكات خۆی بۆ ئامادە بكات و خۆی بڕازێنێتەوە و پاشان چاوی لە كەموكورتی و خەوشەكان

بنووقێنیێ تا ژیانی خۆش بێت، پێویسته ژنەكەش دەستێك بە خۆیدا بهێنیێ و بە جوانترین حالێ نەبیێ نەچێتە لای پیاوەكەی. ئیتر بەم جۆرە ژیان بەردەوام دەبێت.

بەڵام ئەگەر شرۆشەپرێوی ڕوویدا ئەوا خەوش و كەموكورتییەكان وەدەردەكەون و نەفس بێزی دەبێتەوە و دوور دەكەوێتەوە و داوای گۆڕین دەكات.. پاشان ئەو خەوش و كەموكورتییانەی لە یەكەمدا هەبوو لە دووەمیشدا ڕوودەداتەوە. هەروەها پێویستە پیاوەكەش وەكوو خۆجوانكردنی ژنەكە ئەویش خۆی بۆ وی جوان و ڕێك و پێك بكات بۆ ئەوەی بە هاودڵییەوە خۆشەویستی بەردەوام بێت.

هەر كاتێ بابەتەكە بەم جۆرەی باسمان كرد نەڕۆیشت و كەسێ لووتبەرزی هەبوو و نەفسی قێزی لە شتێ بوویەوە ئەوا دوو ڕێگای لەبەردەمدایە: یان پشتی تێ بكات و ڕووی لێ وەرگێڕێت، یان بیگۆڕێت..لە كاتی پشت تێكردن دەبێ ئارام بگرێ لەو شتەی لەودا پێویستیەتی، لە حاڵەتی گۆڕینیش پێویستی بە خۆراك و پارەی زیادە هەیە..هەردووكیانیش ئازاربەخشە.

هەر كاتێ ئەوەی باسمان كرد بەكاری نەهێنا ئەوا چێژ لە ژیان وەرناگرێت و ناتوانێ وەكوو پێویست ژیان بەڕێ بكات.

## ١٤٣- نیعمەتەکانی خودا ناژمێردرێن

نەفسم بەرەو لای شتێکی ناپەسند لە شەرع کەمەندکێشی کردم و دەستی کرد بە تەئویلات و دوورخستنەوەی کەراهەت و ناپەسندییەکەی، تەئویلاتەکانی گەند و بێ بناغە بوون و بەڵگەی دیار هەبوو کە ناپەسند و بێزراوە.

بۆ دوورخستنەوەی ئەوە پەنام بۆ خودا برد و ڕووم کردە خوێندنەوەی قورئان و وانەکەم گەیشتبووە سەرەتای سوڕەتی (یوسف)، ئەو بیر و خوتخوتەیە دڵی مژوول کردبووم تا ئەوەی نەمدەزانی چی دەخوێنم!

کاتێ گەیشتمە ئایەتی﴿قَالَ مَعَاذَ ٱللَّهِۖ إِنَّهُۥ رَبِّيٓ أَحۡسَنَ مَثۡوَايَۖ﴾ (یوسف: ٢٣) واتە: وتی پەنا بە خوا، ئەو گەورەی منە و ڕێزی لێ گرتووم و جێ و ڕێی باش کردووم.. کاتێ ئەم ئایەتەم خوێندەوە وریا بوومەوە وەك ئەوەی ڕووی قسەی لەگەڵ من بێت و ئیتر لەم مەستییە بێدار بوومەوە. وتم: ئەی نەفس! تێ گەیشتی؟ ئەمە (یوسف) ئازاد بووبە ستەم فرۆشراوە ئەوجا ڕێزی لە مافی ئەو کەسە گرتووە کە چاکەی دەگەڵدا کردووە و ناوی لێ ناوە خاوەن و گەورە و وتی ﴿إِنَّهُۥ رَبِّيٓ﴾، پاشان زیاتر ڕوونی کردەوە کە لەبەرچی نابێ شتێك بکات ئازاری پێ بگەیەنێ و وتی ﴿أَحۡسَنَ مَثۡوَايَ﴾..

جا ئەتوو چی کە بەندەیەکی ڕاستەقینەی خودایەکی کە بەردەوام چاکەت لەگەڵدا دەکات و بە قەدەر وردەبەردی دونیا هەڵە و گوناهەکانی داپۆشیویت؟!

لەبیرت نییە کوو پەروەردەی کردیت و فێری کردیت و ڕۆزی دایت و بەرگری لێ کردیت و خێر و چاکەی بۆ هاوردوویت و ڕێنمایی ڕاستترین ڕێگای کردوویت و لە هەموو فێڵ و پیلانێك ڕزگاری کردوویت و لەپاڵ وێنە و شێوەی جوانت ناخی باش و پاك کردوویت و زانستەکانی ئەوەندە بۆ ئاسان کردوویت کەوا ئەوەی تۆ لە ماوەیەکی کورتدا بەدەستت هێناوە کەسانی تر بە ماوەیەکی درێژ وەدەستیان نەهێناوە و زمانی پاراو و ڕەوان کردوویت، ناشیرینییەکانتی لە خەڵك شاردۆتەوە و ڕۆزییەکی زۆری بێ کێشە و گرفتی پێداوی؟!

سوێند بە خوا نازانم کامە نیعمەتت بۆ ڕوونکەمەوە: شێوەی جوان و ساغی ئەندامەکان؟ یان سەلامەتیی میزاج و ڕێکوپێکی دروستکردن؟ یان تەبیاتی نەرم و خاوێن؟ یان ئیلهامی دۆزینەوەی ڕێی ڕاست هەر لە منداڵییەوە؟ یان پاراستن لە بەدخوویی و هەڵە و تاوان؟ یان خۆشەویستکردنی ڕێگای سوننەت و شوێنکەوتنی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بێ چەقبەستوویی و چاولێکەریی کەسانی وەها کە بە لای خەڵکەوە گەورەن بێ ئەوەی تووشی بیدعەکاری بم؟ ﴿وَإِن تَعُدُّواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ لَا تُحۡصُوهَآۗ﴾ (إبراهيم: ٣٤) واتە: ئەگەر نیعمەتەکانی خودا بژمێرن ناتوانن بیژمێرن.. چەندان فێڵباز تەڵەی بۆت نایەوە و خودا پاراستتی؟ چەندین دوژمن بە زەمکردن لە پایەی کەمکردیتەوە خودا بەرزی کردیتەوە؟ خودا چەندان کەسی تینووی شەڕابی هیوا و ئاوات کرد کەچی تۆی تێراو کرد؟ چەندین کەسی بەنامورادی مراند و تۆی هێشتەوە؟ تۆ شەو و ڕۆژ بە لەشساغی و دینپارێزراوی دەکەیتەوە و بەردەوام زانست و گەیشتن بە هیوا و ئامانجەکانت لە برەودایە.

ئەگەر لە مەبەستێك بێبەش كرایت و ئارامگرتنت پێدرا دوای ئەوەی حیكمەت لە بێبەشكرانت بۆ ڕوون بوویەوە ئەوا تەسلیمی ویستی خودابە تا یەقینت دێت بەوەی كە بێبەشبوونەكە باشترە.

ئەگەربێتوو بەردەوام بم لە باسكردن و ژماردنی ئەم نیعمەتانە ئەوا پەڕاوەكان پڕ دەبوونەوە و نووسینیش نەدەبڕایەوە، تۆش دەزانیت ئەوەی باسم نەكردووە زیاترە، ئەوەشی ئاماژەم بۆی كردووە ڕوون نەكراوەتەوە، ئیتر چۆن كار و ڕەفتارێك دەكەیت كە خودا پێی ناخۆشە؟! ﴿قَالَ مَعَاذَ ٱللَّهِۖ إِنَّهُۥ رَبِّيٓ أَحۡسَنَ مَثۡوَايَۖ إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ ٢٣﴾ (یوسف: ٢٣) واتە: پەنا بە خوا ئەو خاوەن و پەروەرێنی من، جێ و ڕێی باشی پێ داوم و ڕێزی لێ گرتووم، بەدڵنیاییەوە ستەمكار و دەسدرێژیكاران ڕزگار و سەرفراز نابن.

## ١٤٤- بڕینی هۆکارەکانی فیتنە

هیچ فیتنەیەکم نەدیووە لە نزیکبوونەوە لە فیتنە گەورەتر بێت و کەم کەس هەیە لێی نزیك ببێتەوە و تێی نەکەوێت، لە فەرموودەدا هاتووە ((هەر کەسێك بەدەوری پاوانێکدا بخولێتەوە نزیکە بکەوێتە ناویەوە)) بوخاری و موسلیم گێڕاویتیانەوە.

ئەزموونداریك وتوویە: جارێکیان توانای ئەنجامدانی کارێکی چێژبەخشم هەبوو کە ڕووکەشەکەی حەرام بوو و ئەگەری ڕێپێدانیشی هەبوو، پرسەکە لەوانە بوو کە ڕاڕایی تێدابوو، لەگەڵ نەفس جەنگام، وتی: ئەتوو ناتوانی ئەنجامی بدەیت بۆیە وازی لێ دێنیت، ئەگەر توانات بەسەریدا هەیە لێی نزیك بەوە، ئەگەر توانیت و زاڵ بوویت و وازت هێنا ئەوا تۆ بەڕاستی وازلێهێنەری تەواویت. منیش وامکرد و وازم لێ هێنا. پاشان نەفس بە تەئویلێکەوە گەڕایەوە و پێی نیشاندام کە ئەگەرچی کارەکە ئەگەری تێدایە بەڵام دروستە! کاتێ هاوڕێکی بووم تاریکاییەکی لە دڵمدا بەجێهێشت لە ترسی ئەوەی نەوەك کارەکە حەرام بێت. ئیتر بینیم جارێك بە هۆی شلڕەوی و تەئویل بەسەرمدا زاڵ دەبێ و جارێکی تریش ئەمن بە کۆشش و ملنەدان بەسەریدا زاڵ دەبم، کاتێ نەفس شلڕەوی دەکات دڵنیا نابم لەوەی کارەکە قەدەغەکراو نەبێ پاشان بەزوویی کاریگەریی ئەوە لە دڵدا دەبینم. بەڵام ئەگەر لە تەئویل لێی دڵنیا نەبم ئەوا بیر لە بڕینی تەمای لەو کارە کاریگەرە دەکەمەوە، ئیتر هەر ئەوە دەمێنێتەوە پێی بڵێم: وادانێ ئەم کارە بەتەواوی ڕێپێدراوە، سوێند بە

خوا هەرگیز بۆی ناگەڕێمەوە. ئیتر بە سوێند و کۆشش تەمای لێ دەبڕێ. ئەوە باشترین دەرمان بوو دۆزیمەوە بۆ دوورکەوتنەوە لێی، چونکە تەئویلکردنی هەر دەبێتە هۆی سوێندشکاندن.

باشترین شت بڕینی هۆکارەکانی فیتنە و وازهێنانە لە شلڕەوی لە شتێك کە دروستە ئەگەر ببێتە هۆی شتێکی نادروست.

## ١٤٥- پەردەی ئارەزوو و بێهۆشیی گوناهكار

ئەگەر بێهۆشیی و بێئاگاییی گوناهبار نەبێت لە كاتی تاوان و گوناهان ئەوا وەكوو ئەو كەسە وایە كە ملە لەگەڵ خودا دەكات بەڵام ئارەزوو دەبێتە ڕێگر لەوەی لە دۆخەكە تێ بگات، ئیتر جگە لە بەجێگەیاندنی ئارەزووەكەی چیتر نابینیّ، وەگەرنا ئەگەر بزانیّ كارەكە سەرپێچییە ئەوا بە ئەنجامدانی ئەو كارە پێچەوانەیە لە دین دەردەچیّ، بەڵام بەجێگەیاندنی ئارەزووەكەی مەبەستە، ئیتر بەمە پێچەوانەكاری بە زیمنی و لێكەوتەیی ڕوودەدات.

زۆربەی ئەمە لە نزیكبوونەوەی فیتنە ڕوودەدات و كەم كەس هەیە لە كاتی نزیكبوونەوە سەلامەت دەرچێت، چونكە وەكوو ئەوە وایە ئاگر لە پووش و پەڵاش نزیك بكەیتەوە.

پاشان ئەگەر كەسی ژیر جیاكاری بكات لەنێوان ساتی بەجێگەیاندنی ئارەزووەكەی و بە خەم و خەفەت بەسەرچوونی هەموو تەمەنی لەسەر بەجێگەیاندنی ئەو ئارەزووە ئەوا ئەگەر هەموو دونیاشی بدرابووایە لێی نزیك نەدەكەوتەوە بەڵام مەستیی ئارەزووی ڕێگرە لەوەی بیر لەوە بكاتەوە.

ئاخ، چەندان گوناه هەر ئەو كات ڕۆیشت وەك ئەوەی هەر نەبووبێت پاشان شوێنەوارەكەی مایەوە.. باشترین ڕێگا لە وریایی و ئاگاداری ئەوەیە خۆی تووشی هۆكاری فیتنە نەكات و لێی نزیك نەبێتەوە. هەر كەسیّ لەمە تێگەیشت و بەباشی خۆی پاراست ئەوا لە سەلامەتییەوە نزیكترە.

## ١٤٦- لەنێوان خواستی کەماڵ و ئارەزووەکانی نەفس

بەڵا و ناسۆرییەکان بە گوێرەی توانا و وزەی مرۆڤەکانە. زۆر کەس دەبینیت بێدەنگ و ڕازین بە بەشی دین و دنیایان، ئەو کەسانە خەڵکێکن نەویستراون بۆ پایە بەرزەکانی ئارامگری، یان زانراوە کە لە بەرەنگاربوونەوە و بەرگەگرتنی بەڵادا لاوازن بۆیە لوتفیان بەرانبەر کراوە.

بەڵام مەینەتی هەرە گەورە ئەوەیە هیممەتێکی بەرزت پێ بدرێ لێت ڕازی و قایل نەبێت تەنها بە هێنانەدی وەرەع و باشکردنی دین و کەماڵی زانست نەبێ، پاشان بە نەفسێك گرفتار بکرێیت کە مەیلی بە لای ڕێپێدراوەکان هەبێ و پاشان بانگەشەی ئەوە بکات کە بەوە خەمی جەم دەکات و نەخۆشییەکەی چاك دەکاتەوە تاوەکوو بە بێ کێشە و گرفت ڕوو بکاتە وەدەسهێنانی چاکە و فەزیلەتەکان. ئەم دوو حاڵەتە وەکوو دوو دژ وەهان چونکە دونیا و ئاخیرەت هەوێی یەکترن.

ئەوەی پێویستە لەم شوێنەدا ئاگاداربوونی واجباتەکانە و هەروەها لە ڕێپێدراودا ئەوەندە جڵەو بۆ نەفس شل نەکرێ کە خاترجەم نەبێ لەوەی سەربکێشێ بەرەو پشت هەڵکردن لە واجبێکی وەرەع.

گرفتـار هـاوار دەكـات، منـداڵێك بگرییـت باشـترە لـەوەی بـاوك بگرییـت. وە بزانـە كردنەوەی دەرگای ڕێپێدراوەكان ڕەنگە ئازارێكی زۆر بۆ دین ڕابكێشێ، بۆیە بەر لە كردنەوەی ئاو شێرەكە توندبكە و بەر لـە دیـداری جـەنگ قـەڵغان بپۆشـە و بـەر لـە جووڵاندنی دەست سەرنجی سەرەنجامی كردەوەكەت بدە و بە وریاییـەوە ئامادەبـە بە دووركەوتنەوە لەوەی لێی دەترسیت ئەگەر لێی دڵنیاش نەبیت.

## ١٤٧- ئامۆژگاری بۆ زانستخواز

پێویستە زۆربەی هەوڵ و هیممەتی زانستخواز بۆ لەبەرکردن و دووبارەکردنەوە تەرخان بێت، ئەگەر بکرێ هەموو کاتەکە بۆ ئەوە تەرخان بکرێ ئەوا باشترە بەڵام جەستە وەکوو باربەرێك وایە زۆر ماندوو بکرێت ئەگەری هەیە پەکی بکەوێت و لە ڕۆیشتن بکەوێت.

لەبەرئەوەی هێز و توانای مرۆڤ ماندوو دەبێ و پێویستی بە نوێکردنەوەیە و لەبەرگرتنەوە و خوێندنەوە و کتێب دانان شتێکی پێویستن، لەگەڵ ئەوەی لەبەرکردن گرینگە بۆیە وا پێویست دەکات کات بۆ دوو شت دابەش بکرێت: لەبەرکردن لە سەرەتا و کۆتاییەکانی ڕۆژ و شەودا بێت، کاتەکانی تریش تەرخان بێت بۆ لەبەرگرتنەوە و خوێندنەوە و بایەخدان بە جەستە و پێویستییەکانی. نابێ هیچ یەکێك لەم هاوبەشانە لە مافیان بخورێت، چونکە هەر کاتێ یەکێکیان لەویتر زیاتر مافی وەرگرت ئەوا کەموکورتی ڕوودەدات و شوێنەوارەکەی بەدەردەکەوێت.

نەفس لە دەست دووبارە و پاتەکردنەوە بەرەو لەبەرگرتنەوە و خوێندنەوە و نووسین ڕادەکات، چونکە ئەمیان خۆشتر و ئاسانترە.

با سوار وریا بێت لە پشتگوێخستنی وشترەکەی و دروست نییە بارێکی لێ باریکات کە توانای هەڵگرتنی نییە، لەگەڵ دادپەروەری و ئینسافدا هەموو مەبەستێك دێتەدی. هەر کەسێك لە ڕێگا لادات ئەوا ڕێگاکەی درێژ دەبێتەوە.

هەر کەسێکیش چەند ماڵێك لە ماڵێکدا کۆبکاتەوە ئەوا نزیکە ئەوەی هەوڵی بۆی داوە لە دەستی بچێت. مرۆڤ زیاتر پێویستی بە هاندانە چونکە ساردوسڕی لە جیددییەت زیاتر پێوەی نووساوە.

پاشان، ئەوەی لە زانستدا پێویستە خواستنی شتی گرینگە، ڕەنگە کەسێك لە بیست ڕێگاوە فەرموودەی ((مَن أتى الجُمُعةَ فَليَغتَسِل)) لەبەر بکات بەڵام فەرموودەکە لە یەك ڕێگاوە ساغ بۆتەوە، ئەوەش مەشغوولی دەکات لە زانینی ئادابی خۆشووشتن.

تەمەن زۆر لەوە کورتتر و بەنرختره لەوەی لە هەناسەیەکدا بەفیڕۆ بدرێت.

عەقڵ بەسە وەکوو ڕێنوێن بۆ ڕێی ڕاست..یارمەتی و سەرکەوتن لە خوداوەیە.

## ١٤٨- ناخى خاوێن مايەى پايەدارييە

ئەگەر مەبەست و نيازى زانا ڕێك و ڕاست بێت ئەوا لە دەست بارگرانيى زۆرلەخۆكردن دەحەسێتەوە. زۆرێك لە زانايان خۆ بەدوور دەگرن لە وتنى: نازانم! بە فەتوا پلەوپايەى خۆيان لە لاى خەڵك دەپارێزن نەوەك پێيان بوترێ: وەڵامەكەى نەزانى! ئەگەر لە وەڵامەكەشيان بەتەواوى يەقينيان نەبێ! ئەمەش ئەوپەڕى ڕيسواييە.

لە (ماليك كوڕى ئەنەس) گێڕدراوەتەوە كەوا پياوێك لەبارەى بابەتێكەوە پرسيارى لێ كردووە، ئەويش وتوويە: نازانم! كابرا پێى وتووە: چەندان وڵاتم بۆ ئەم پرسيارە لە تۆ بڕيوە! ماليك پێى وتووە: بگەڕێوە وڵاتەكەت و بڵێ: لە ماليكم پرسى و وتى: نازانم!

سەيرى دين و عەقڵى ئەم كەسە بكە چۆن لە بارگرانى حەسايەوە و لە كن خوداش سەلامەت بوو.

پاشان ئەگەر مەبەستى ئەم زانايانە پلەوپايە بێت لە لاى خەڵك ئەوا دڵى ئەو خەڵكە بە دەستى غەيرى ئەوانە(بە دەستى خودايە).

سوێند بە خوا، کەسم بینیوە نوێژ و ڕۆژوو و بێدەنگی زۆر بووە و لە نەفس و بەرگیشیدا خاکەڕا بووە بەڵام دڵەکان لێی دوورکەوتوونەتەوە و پایە و ڕێزی لە دڵان وەها نەبووە! دیتووشمە کەس هەبووە جلوبەرگی نایاب و جوانی پۆشیوە و سوننەت و خشوعی زۆریشی نەبووە بەڵام دڵەکان لە خۆشەویستیدا تێی ئاڵاون! لە هۆکاری ئەمە وردبوومەوە دیتم بە هۆی ناخەوەیە.

هەروەك لە ئەنەس کوڕی مالیك گێڕدراوەتەوە کە نوێژ و ڕۆژووی زۆری نەبووە بەڵکوو ناخی خاوێن بووە.

هەرکەسێ ناوەوەی خۆی چاك بکات ئەوا بۆنی خۆشی فەزڵ و چاکەی بڵاو دەبێتەوە و بە بۆنی خۆشی دڵەکان گیرۆدەی دەبن. بۆ خاتری خودا ئاگاداری ناختان بن، چونکە بە خراپبوونی ناخ جوانی و باشیی ڕواڵەت سوودی نییە.

## ١٤٩- هۆکارەکانی دواکەوتنی گیرابوونی نزا

تووشی ناخۆشییەك بووم و نزای زۆرم کرد و داوای لاچوونی ناخۆشییەکە و حەسانەوەم کرد بەڵام گیرابوونی نزاکەم دواکەوت! نەفسم بێزار و نیگەران بوو!

هاوارم لە نەفسم کرد: ماڵوێران! سەرنجی کاری خۆت بدە! ئەتوو کۆیلەیت یان ئازادی خاوەندار؟! کاروبار هەڵسووڕێنراویت یان هەڵسووڕێنەر؟! ئەی نەتزانیوە دونیا خانەی تاقیکردنەوە و ئەزموونە، ئەگەر داوای مەبەست و ئامانجەکانت کرد و ئارامت نەگرت لەسەر ئەو شتانەی پێچەوانەی مەبەستی تۆن، ئەی کوا تاقیکردنەوە؟! ئایا تاقیکردنەوە تەنها پشت تێکردن و پێچەوانەی مەبەستەکان نییە؟ لە واتای تەکلیف تێ بگە، ئەوەی لەسەرت قورسە سووك دەبێ و ئەوەی دژوارە ئاسان دەبێ!

کاتێ لەوەی وتم وردبۆوە کەمێك ئارام بۆوە. پێم وت: وەڵامی دووەمیشم هەیە ئەویش ئەوەیە ئەتوو داوای پێویستییەکانت لە خودا دەکەیت وەك ئەوەی تۆ خاوەن ماف بیت و چاوەڕێ دەکەیت خودا مافەکانت بداتێ بەڵام داوا لە نەفسی خۆت ناکەیت فەرمانەکانی خودا جێبەجێ بکەیت و لە قەدەغەکراوەکانی دوورکەویتەوە! ئەمەش خودی جەهل و نەزانییە، بەڵکوو دەبووایە شتەکە بەپێچەوانە بووایە چونکە تۆ کۆیلەیت و کۆیلەی ژیریش داوا لە نەفسی خۆی دەکات

مافی خاوەنەکەی جێبەجێ بکات و دەشزانێ لەسەر خاوەنەکەی پێویست نییە پێی بڵێ حەز بە چی دەکات.

ئیتر نەفسم بەم وەڵامی دووەمە زیاتر ئارام بوویەوە..پێم وت: وەڵامی سێیەمیشم پێیە ئەویش ئەوەیە کە تۆ پێت وابووە وەڵامدانەوە و گیرابوونی نزاکەت دواکەوتووە بەڵام تۆ ڕێگاکانی گیرابوونی نزات بە تاوان و گوناه گرتووە، ئەگەر دەرگات کردبایەوە ئەوا ئەو خێرا دەهات. دەڵێی نەتزانیوە کە تەقوا هۆکاری ئاسوودەیی و حەسانەوەیە! وتەی خودای گەورەت نەبیستووە: ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مَخۡرَجٗا ۝٢ وَيَرۡزُقۡهُ مِنۡ حَيۡثُ لَا يَحۡتَسِبُۚ ...۝٣ ... وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مِنۡ أَمۡرِهِۦ يُسۡرٗا ۝٤﴾ (الطلاق: ٢ - ٤) هەرکەسێ تەقوای خودا بکات خودا دەرووی بۆ دەکاتەوە و ڕۆزی دەدات...کاروباری ئاسان دەکات..

نەتزانیوە پێچەوانە بە پێچەوانەیە؟! ئاخ لە مەستیی بێئاگایی کە بەهێزتر بووە لە هەموو بەربەستێکی بەردەم ئاوی ویستراو کە ڕێی لێ دەگرێ لەوەی بگات بە کێڵگەی خۆزگە و ئاواتەکان!

نەفس زانی کە ئەمە هەقە و ئەرخەیان بوو..پێم وت: وەڵامی چوارەمیشم هەیە ئەویش ئەوەیە کە تۆ داوای شتێك دەکەیت کە نازانیت چارەنووسەکەی چییە و ڕەنگە زیانی تۆی تێدا بێت، نموونەی تۆ وەکوو ئەو منداڵە تادارەیە کە داوای شیرینی دەکات، هەڵسووڕێنەری تۆ زیاتر زانایە بە سوود و بەرژەوەندەکان، چۆن نا لە کاتێکدا فەرموویەتی: ﴿وَعَسَىٰٓ أَن تَكۡرَهُواْ شَيۡـٔٗا وَهُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡۖ﴾ (البقرة: ٢١٦) واتە: لەوانەیە ڕقتان لە شتێك بێت و خێر و چاك بێت بۆتان.

کاتێ لەم وەڵامەدا ڕاستی بۆ نەفس دەرکەوت دڵنیابوونی زیاتر بوو..پێم وت: وەڵامی پێنجەمیشم لە کنە ئەویش ئەوەیە ئەم خواست و داواکراوەت لە پاداشتت کەم دەکاتەوە و لە ئاستت دێنێتە خوارەوە، کەواتە بێبەشکردنت لەمە بەخششی خودایە بۆت، ئەگەر داوای شتێکت کردبایە بۆ ئاخیرەتت باش بووایە ئەوا بۆت باشتر بوو. ئیتر وا باشترە بۆت تێ بگەیت لەوەی بۆم ڕوون کردیتەوە..

وتی: بەناو باخی ڕوونکردنەوەکانت گەڕام و بەباشی تێگەیشتم.

## ١٥٠- بێنیازبوونی زانا لە ماڵی خەڵك، شكۆمەندییە

لە خۆراك (دەعوەت)ی هەندێ دەوڵەمەند و خاوەنپارە ئامادە بووین، دیتم زانایان لە لایان زەلیلترین كەسن، زانایان خۆیان بۆ ئەوان نەرم دەكردەوە و لەبەرئەوەی تەمایان لە دەوڵەمەندییەكەیان بوو خۆیان زەلیل دەكرد و ئەوانیش بایەخیان پێ نەدەدان لەبەرئەوەی دەیانزانی ئەوان پێویستیان پێیانە...ئەمەم بە خەوش لە هەردوولا دانا:

سەبارەت بە ئەهلی دونیا خەوشەكە ئەوەیە ئەوان دەبووایە ڕێز لە زانست بگرن بەڵام لەبەر قەدرنەزانینی زانستەوە لەدەستیان چوو و پارە پەیداكردنیان لەو پێ باشتر بوو، نابێ داوایان لێ بكرێ شتێك بە گەورە بگرن كە نەیدەناسن و نە قەدری دەزانن.

بەڵام گلەییی من لە زاناكانە و دەڵێم: پێویستە ئەو نەفسەی خۆتان بپارێزن كە بە زانست بەڕێز بووە لەوەی زەلیلی گەجەر و گوجەرانی بكەن. ئەگەر ئێوە لەوان بێنیاز بن ئەوا زەلیلی بۆ ئەوانە و داواكردن لەوان قەدەغەیە بۆتان. ئەگەر بای ئەوەندەشتان سامان هەیە كە پێویستتان بە كەس نەبێ ئەوا بۆچی بە خۆپاراستن لەو ماڵە پووچەی بە زەلیلی وەدەسهاتووە خۆتان لە زەلیلی نەدەپاراست؟! بەڵام لەم بابەتەدا وام بە خەیاڵدا دێت زانیومە كە نەفس لەسەر قایلبوون بەوەی هەیە و

دوورکەوتنەوە لە زیادە ئارامی کەمە، ئەگەر لە کاتێکیش ئەوەی هەبێ بە بەردەوامی نییە.

بۆ زانا باشترە کۆشش بکات لە خەڵك بێنیاز بێت و زۆر کار بکات ئەگەر بەوەش کاتێکی زۆری زانستخوازی لێ بڕوات چونکە بە هەبوونی و دارابوون ئابڕووی خۆی دەپارێزێ... (سەعیدی کوڕی موسەییەب) بازرگانیی ڕۆنی دەکرد و ماڵ و داراییەکی زۆری لە دوای خۆی بەجێهێشت. (سوفیانی سەوری)ش داراییەکی باشی لەدوای خۆی بەجێهێشت و دەیوت: ئەگەر تۆ نەبووایەیت (پارە) ئەوا ڕووی خۆیان پێ دەسڕیم!

لە بەشەکانی پێشووی ئەم کتێبەمدا باسی گەورەیی و بەڕێزیی ماڵ و دارایی و ئەو هاوەڵ و زانایانەم کردووە کە سامانیان وەدەست هێناوە و هەروەها نهێنیی ئەم کارەیان و هاندانم بۆ زانستخوازان کە ئەوە بکەن، ڕوونم کردۆتەوە کە نەفس لەسەر خۆپاراستن جێگیر نابێ و لەسەر بەردەوامیی وازهێنان ئارام ناگرێ.

چەندان کەسمان بینی لەسەر ئاخیرەتخوازی ئیرادەی بەهێز بوو و ئەوەی هەیبوو بەخشی، پاشان لاواز بوو، لە ناشیرینترین ڕێگا و ڕووی دەستی بە پارە پەیداکردن کرد!

پاشەکەوتکردنی پارە و بێنیازبوون لە خەڵك باشتر و شیاوترە، ئیتر تەمەع لە دڵ دێتەدەر و بڵاوکردنەوەی زانست لە خڵتەی مەیل پاك دەبێتەوە.

هەر کەسێ سەرنج بداتە باسوخواسی زانایانی چاك دەبینێ لەسەر ئەم ڕێگایە بوون. ئەو کەسانەی ڕێی حەسانەوە لە کارکردنیان گرتەبەر کە لەدەستدانی دین و ڕووی بەلاوە ئاسایی بوو و بەدوای ئیسراحەتدا گەڕا و لەبیری چوو کە لە واتادا ماندووبوون هەیە هەروەك کۆمەڵێك لە سۆفیی نەزان ئەوەی هەیانبوو بەخشیان و بانگەشەی پشتبەستن بە خودایان کرد! نەیانزانی کە کارکردن دژ و پێچەوانەی پشتبەستن بە خودا نییە! بەڵکوو ڕێگای ئیسراحەتیان خواست و سواڵکردن لە خەڵکیان بە کارکردن و نان پەیداکردن دانا!

ئەم ڕێگایە لە دوو شت پێکهاتووە: یەکەمیان: کەم غیرەتی لەسەر ئابڕووپارێزی. دووەم: کەم زانستی.

## ١٥١- هۆکاری سەرپێچی

سەرنجم دایە ئەنجامدانی گوناهـ و سەرپێچی لەلایەن سەرپێچیکارانەوە، دیتم مەبەستیان سەرپێچیکردن نییە بەڵکوو مەبەستیان هاوڕێکی و هاوئاوازیی ئارەزووەکانیانە، بەم پێیەش سەرپێچی ڕوودەدات.

سەیری هۆکاری ئەم هەنگاونانەم کرد لەگەڵ زانینی ئەوەی کارەکە سەرپێچییە، دیتم ئەوەیە ئەوان پێیان وایە خودا بەخشندەیی و فەزڵی زۆرە، ئەگەر بێتوو ئەوانە لە گەورەیی و سام و شکۆی خودا وردبوونایەتەوە ئەوا سەرپێچیان نەدەکرد، سوێند بە خوا پێویستە وریای ئەو زاتە بین کە کەمترین کردەوەی گشتاندنی مردنە بۆ هەموو خەڵك تەنانەت لە زەویدانی ئاژەڵ بۆ سەربڕین و ئازاردانی منداڵان بە نەخۆشی و هەژاریی زانا و دەوڵەمەندیی نەزان.

با گوناهکار وریای خۆی بێت لە زاتێك کە ئەمە سیفەتیەتی، خودای باڵا فەرموویەتی: ﴿وَيُحَذِّرُكُمُ اللَّهُ نَفْسَهُ﴾ (آل عمران: ٢٨) واتە: خودا لە زاتی خۆیدا وریاییتان دەداتێ و ئاگادارتان دەکاتەوە.

سەرنجدانی هۆکارەکانی ترس نزیکترە لە دڵنیایی و ئۆقرەیی لە سەرنجدانی هۆکارەکانی ئومێد، کەسی ترساو توند و پەیتە، بەڵام ئومێدەوار پەیوەستە بە پەتی تەما و ئاواتەوە، ڕەنگە ئەو گومانەش نەیەتەدی!

## ١٥٢- قەناعەت و کارکردن بۆ زانایان گرینگە

دیتم زۆربەی پارەدارەکان زانایان بەکاردێنن و بە شتێکی کەم لە زەکات زەلیلیان دەکەن: ئەگەر یەکێکیان خەتمکردنی قورئانی هەبێ دەڵێ: فلان ئامادە نەبوو! ئەگەر نەخۆش بکەوێت دەڵێ: فیسار نەهات! هەموو منەتەکەی لەسەری شتێکی کەمە کە هەردەبێ بیدات بە کەسێکی هاوشێوەی وی! زانایانیش لەبەر زەڕووڕەت بەم زەلیلییە ڕازی بوون.

دیتم ئەمە نەزانییەکە لە زانایانەوە بەوەی کە لەسەریان پێویستە زانست بپارێزن، چارەسەریشی لە دوو لایەنەوەیە: یەکەم قنیاتکردن بە کەم، هەروەك وتراوە: هەر کەسێك بە سرکە و سەوزە ڕازی بێت هیچ کەسێك ناتوانێ ڕام و زەلیلی بکات. دووەم: تەرخانکردنی هەندێك لەو کاتەی بۆ زانست تەرخان کراوە بۆ کار و ئیشکردن تایبەتی بکات، ئەمە دەبێتە هۆی بەهێزکردنی زانست، ئەوە باشترە لەوەی هەموو کاتەکان بۆ زانستخوازی تەرخان بکرێ لەگەڵ بەرگەگرتنی ئەم زەلیلییە.

هەرکەسێ ئەوەی من سەرنجمدا ئەویش لێی وردبێتەوە و خاوەن شکۆمەندی بوو ئەوا خۆراکی خۆی دەخەملێنێ و ئەوەی هەیەتی هەڵیدەگرێ یان کارێك دەکات بەشی بژێوی بکات. هەر کەسێکیش خۆی لە بەر دەرگای دەوڵەمەندان نەپارێزێ ئەوا تەنها شێوە و وێنەی زانستی بێ واتاکەی دەست دەکەوێ.

## ١٥٣- شوێن بەڵگە بکەوە

کاری هەموو شتێك لەسەر عەقڵ وەستاوە، ئەگەر عەقڵ تەواو بوو ئەوا خاوەنەکەی تەنها کار بە بەهێزترین بەڵگە دەکات.

بەروبوومی عەقڵیش بریتییە لە: تێگەیشتن لە قسە و گوتار و، تێبینیکردنی مەبەستی هەر شتێك. هەر کەسێکیش لە مەبەست تێگەیشت و بە بەڵگەوە کاری کرد ئەوا وەکوو ئەوە وایە لەسەر بناغەیەکی پتەو خانوو دروست بکات.

من خەڵکی زۆرم بینی کە بە بەڵگە کار ناکەن بەڵکوو چۆن ڕێککەوت وەها دەکەن، ڕەنگە بەڵگە دابونەریتەکان بووبێت! ئەمەش ناشیرینترین شتێکە.

پاشان خەڵکیکی زۆرم بینی کە لە ڕێگای چەسپاندنی، شوێن بەڵگە ناکەون وەکوو جوولەکە و مەسیحی، ئەوان لاسایی باوانیان دەکەنەوە و سەرنجی شەریعەت نادەن ئایا ڕاستە یان نا؟! هەروەها خودا دەسەلمێنن و نازانن چ شتێك بۆ ئەو ڕەوایە و چی ناڕەوا، منداڵی دەدەنە پاڵ و ڕەواییی گۆڕینی شەریعەتی لێ قەدەغە دەکەن! ئەوانە بە دروستی سەرنجیان نەداوە، نە لە سەلماندنی دروستکار و ئەوەی بۆی ڕەوایە، نە لە بەڵگەی ڕاست و دروستیی پێغەمبەران، بۆیە کارەکانیان پووچ و فیڕۆیە وەکوو ئەو کەسەی لەسەر لم خانوو بنیات دەنێ.

هەر لەم بارەوە خەڵکێك هەن خواپەرستی دەکەن و واز لە دونیا دێنن و خۆیان ماندوو دەکەن بە کارکردن بە هەندێ فەرموودەی پووچەڵ و پرسیاریش لەو کەسانە ناکەن کە دەزانن!

خەڵك هەیە بەڵگەکە دەسەلمێنێ و لە مەبەستی بەڵگەکە تێ ناگات: لەم جۆرە خەڵکە وەکوو ئەوانەی زەمی دونیایان بیست ئیتر وازیان لێ هێنا و لە مەبەستەکە تێ نەگەیشتن، وا گومانیان برد کە دونیا لەبەر خودی خۆی زەم دەکرێ و پێویستە نەفس دژایەتی بکات، ئیتر زیاد لە توانای خۆیان باری سەرشانی خۆیان قورس کرد و بە هەموو جۆرێك ئازاریان دا و لە بەشەکانی خۆی بێبەشیان کرد، ئەم فەرموودەی پێغەمبەریان (صلی الله علیه وسلم) نەدەزانی کە فەرموویەتی: ((نەفسی خۆت مافی بەسەرتەوە هەیە))..تێیاندا هەیە حاڵی سەری کێشا بەرەو وازهێنان لە فەرزەکان و سیسبوونی جەستە و لاوازیی هێز و توانا! هەموو ئەوانەش بە هۆی لاوازیی تێگەیشتن لە مەبەست و سەرنجدانی ویستراو.

هەروەك لە (داوودی تائی) گێڕدراوەتەوە کە بەرمیلێك ئاوی لەژێر زەوی دادەنا و لێی دەخواردەوە کە زۆر گەرم بوو! بە سوفیانی وت: ئەگەر تۆ خواردنی خۆش دەخۆیت و ئاوی سارد دەخۆیتەوە، ئیتر کەی حەز بە مردن و گەڕانەوە بۆ لای خودا دەکەیت؟!

ئەوە نەزانیی مەبەستە، خواردنەوەی ئاوی گەرم دەبێتە هۆی نەخۆشیی جەستە و پێی تێراو نابیت، ئێمە فەرمانمان پێ نەکراوە بەم شێوەیە خۆمان ئەشکەنجە بدەین، بەڵکوو فەرمانمان پێ کراوە بەوەی واز لەو شتانە بێنین کە ئەو داوای

دەكات و خودا نەهی لیّ كردووە. لە فەرموودەی ڕاستدا هاتووە كە ئەبووبەكر خـودا لێی ڕازی بێت كاتیّ لـە ڕێگـای كۆچـكردن بـەرەو مەدینـە شـوانەكە ئاژەڵەكـەی بـۆ دۆشی و شیرەكەی پێدا، ئـەویش ئـاوی بەسـەر جامەكـەدا كـرد تـا ژێـرەوەی سـارد بۆوە پاشان دەرخواردی پێغەمبەری خوایدا (صلی الله علیه وسلم) و لە بن سێبەری گابەردێك جێی بۆ ڕاخست.

هــەروەها ئــاوی شــیرین بــۆ پێغەمبــەر (صــلی الله علیــه وســلم) دەهێنــرا..وە فەرموویـەتی: ((ئەگـەر ئاوێكتـان لایـە كـە شـەو لـە مەشـكە كـۆن ماوەتـەوە ئـەوا دەیخۆمەوە وەگەرنا لە ڕووبار و شیرناو دەخۆمەوە.))(ئاوی مەشكە كـۆن ساردترە لە ئاوی تر)..

ئەگەر داوودی تائی ڕەحمـەتی خـوای لیّ بێـت تێگەیشـتبایە كـە باشـكردنی ئـالیكی وشتر یارمەتیدەرە بۆ ئەوەی بتوانیّ بڕوات ئەوا ئەمەی نەدەكرد.

ئەی سوفیانی سەوری نـابینی، لەگـەڵ ئـەوەی خـاوەن زانسـت و ترسـێكی زۆر بـوو كەچی خواردنی خۆشی دەخوارد و دەیگوت: ئەگەر لەگەڵ گیانلەبەر بـاش نـەبیت و خزمەتی نەكەیت كارناكات.

ڕەنگە هەندێك لەوانەی ئـەم قسـەیەی مـن دەبیسـتن بڵـێن: ئەمـە هێرشـكردنە سـەر زاهیدانە! دەڵێم: لەگەڵ زانایان بە و سەیری ڕێگـای حەسـەنی بەسـڕی و سـوفیانی سەوری و مالیكی كوڕی ئەنەس و ئەبوو حەنیفە و ئیمامی ئەحمەد و شـافیعی بكـە، ئەوانە بناغەی ئیسلام بوون و دینت لە كەسێك وەرمەگرە زانستی كـەم بێـت ئەگـەر

زوهدیشی بەهێز بێت، کارەکەی وا لێکدەوە کە ئەو توانای ئـەو زوهـدەی هـەبووە و لە شتێك کە تۆ توانات بەسەریدا نییە چاوی لێ مەکە. بـە ئـارەزووی خۆمـان نییـە چیمان بوێت بیکەین چونکە نەفس سپاردەیەکە لەلامان.

ئەگەر نکوولی بکـەیت لـەوەی ڕوونم کـردەوە ئـەوا تـۆش لەوانـەیت کـە ڕەخنـەم لێ گرتن..ئەمەش هێمایە بۆ مەبەست و ڕوونکردنەوەشی درێژە.

## ١٥٤- شوێنکەوتنی بەڵگە

پێویستە لەسەر مرۆڤی ژیر شوێن بەڵگە بکەوێت پاشان سەیری ئەو شتانە نەکات کە ڕوودەدەن و پێی ناخۆشن. نموونە: بە بەڵگەی یەکلاکەرەوە حیکمەت و خاوەندارێتی و تەگبیری خودای گەورە سەلماوە، جا ئەگەر مرۆڤ زانایەکی بێبەش و نەزانێکی ڕۆژیدراوی بینی ئەوا ئەو بەڵگەیەی حیکمەتی خودای سەلماندووە لەسەری پێویست دەکات تەسلیمی ئەم قەدەرە بێت و دەستەوسانی لە نەزانینی ئەو حیکمەتە بداتە پاڵ خۆی، هەندێ خەڵك لەبەر نەزانییان ئەم کارەیان نەکرد! ئایا پێت وایە بەچی شتێك بڕیاری خراپیی ئەم تەگبیرەیاندا؟! ئایا بە پێی خواستی عەقڵیان نەبوو؟! ئایا عەقڵیشیان هەر یەکێك نییە لە بەخششەکانی خودا؟! دەی چۆن بە هەندێ لە مەخلووقاتەکانی خودا کە بە نیسبەت خوداوە لە هەموو شت کەمترە بڕیار لەسەر حیکمەت و تەگبیری ئەو دەدرێ؟!

هەروەها ئەوەی پێویستە تێیدا بە شوێن بەڵگە بکەوین و ئاوڕ نەدرێتەوە لەوەی چی لێ کەوتۆتەوە ئەوەیە کە زانست بەڕێزترین دەسکەوتە. کۆمەڵێك نەزان هەژاری و نەداریی زانایانیان بە خەوشێك بۆ زانست لێکدایەوە و وتیان: زانست سوودی نییە! ئەوەش بە هۆی نەزانی و نەفامییان و قەدرنەزانینی زانستەوە بوو، چونکە

شوێنکەوتەی زانست بەلایەوە گرینگ نییە چی دەبێ و ڕوودەدات، بەڵکوو بە لەدەسدانی مەبەست و ئامانج تاقیکردنەوە ڕوون دەبێتەوە.

ئەگەر هیچ بەڵگەیەك لەسەر ڕاستگۆییی پێغەمبەرمان نەبووایە جگە لە پشتکردنی لە دونیا و ژیانی تەنگ و ناخۆشی و، پاشان هیچ شتێکی لەدوای خۆی بەجێ نەهێشت و میراتی لەسەر کەسوکاری حەرام کرد، ئەوەندە بەسە لەسەر ڕاستگۆییی وی لەوەی کە ئەو خواستێکی تری غەیری دونیای هەبووە.

ڕەنگە کەسی نەزان هەندێ زانا ببینێ کە هەڵەیەك دەکەن و بەم هۆیەوە ڕەخنە و نەنگی لە زانست بگرێ و بە کەموکورتی دابنێ! ئەمەش هەڵەیەکی گەورەیە. با کەسی ژیر لە خودا بترسێ و بە خواستی عەقڵ کار بکات لەوەی فەرمانی گوێڕایەڵیی خودا و کارکردن بە زانستی پێ دەکات و بزانێت کە تاقیکردنەوە لە ئارامگرتن لەسەر لەدەسچوونی داواکراوەکانە و با پابەند بێت بە شوێنکەوتنی بەڵگە ئەگەر ناخۆشییەکیشی لێ بکەوێتەوە.

## ١٥٥- سەرەنجامی ئارامگرتن و کۆتاییی ئارەزوو

سورەتی (یوسف)م خوێندەوە سەیرم هات لە ستایش و پیاهەڵدانی لەسەر ئارامگرتنی و ڕوونکردنەوەی چیرۆکەکەی بۆ خەڵك و بەرزکردنەوەی بە هۆی وازهێنانی لەوەی وازی لێ هێنا. لە نهێنیی بابەتەکە وردبوومەوە دیتم بە هۆی سەرپێچیکردنی ئارەزووەوەیە. وتم: سەیرە! ئەگەر هاوئاوازی ئارەزووەکەی بووایە دەبووە کێ و چی دەبوو؟ بەڵام کاتێ سەرپێچیی ئارەزووی کرد بووە شتێکی گەورە کە ئارامگرتنی کرایە نموونە و پەند و هەوڵ و کۆششی بووە مایەی شانازی، هەموو ئەوانەش بە هۆی ئارامگرتنی ماوەیەکی کورت! ئای چ شکۆمەندی و شانازییەکە نەفست ئارام بگرێ لە خۆشەویست و حەزلێکراوێك کە لێتەوە نزیکە!

پێچەوانەی ئەو حاڵەتی (ئادەم)ە لە هاوئاوازیی ئارەزووەکەی، ئەگەر پەشیمانبوونەوە و فریاکەوتنی خودا نەبووایە ئەوا بۆ هەمیشە دەبووە کەموکورتییەك بۆی: ﴿فَتَابَ عَلَيْهِ﴾ (البقرة: ٣٧) واتە: خودا تەوبەی لێ وەرگرت و لێی خۆشبوو..

ئیتر سەرنجی سەرەنجامی ئارامگرتن و کۆتاییی ئارەزوو بدەن! ژیر ئەو کەسەیە کە جیاکاری بکات لەنێوان هەردوو شتە شیرین و تاڵەکە و بیانناسێتەوە..هەر کەسێ تەرازووی ڕێك و ڕاست بێت و تای ئارەزووی قورس نەبوو ئەوا هەموو سوود

و قازانجێك له ئارامگرتندا دەبینیٚ و هەموو زیان و دۆڕانێکیش له هاوڕێکیی نەفسدا دەبینیٚ.

له باسی سەرپێچیی نەفس ئەوەندە ئامۆژگارییە بەسە بۆ کەسانی خاوەن هۆش..

## ١٥٦- ژیاننامەی پیاوچاکان

دیتم بۆ چاکبوونی دڵ تەنها مژوولبوون بە فیقھ و فەرمووده بەس نییە مەگەر ئاوێتە بکرێن بە دڵنەرمکەرەوەکان و خوێندنەوە و سەرنجدانی ژیاننامەی پیاوچاکانی پێشین، بەڵام تەنێ زانینی حەڵاڵ زۆر کاریگەریی لە دڵنەرمبووندا نییە بەڵکوو دڵ نەرم دەبێت بە فەرموودەکانی دڵنەرمکردن و ژیانی پیاوچاکان، چونکە ئەوان لە ژیانی خۆیاندا مەبەستی قورئان و فەرموودەیان بەرجەستە کردووە و بەتەواوی لە واتا و مەبەستی فەرمایشتەکان تێگەیشتوون.

ئەم قسەیەش لە ئەزموونەوە دەکەم. لەبەرئەوەی من بینیم زۆرینەی فەرموودەزان و قوتابییانی فەرموودە تەنها خەمیان زۆرکردنی فەرموودەیە و، زۆرینەی فەقیھەکانیش زۆر گرینگی دەدەن بە زانستەکانی مشتومڕ و دەمەتەقێ و ئەو زانستانەی نەیاری پێ دەبەزێنن! جا چۆن دڵ لەگەڵ ئەم شتانەدا نەرم دەبێ؟!

کۆمەڵێك لە پیاوچاکانی پێشین دەچوونە لای بەندەی باش بۆ ئەوەی سەرنجی خەسڵەت و خووڕەوشتی بدەن نەك زانستی لێ وەربگرن، چونکە ڕەوشت و ئاکاری، بەرهەمی زانستەکەیەتی.

لەمە تێبگە و فێربوونی فیقھ و فەرموودە ئاوێتەی خوێندنەوەی ژیانی پیاوچاکان و زاهیدان بکە تاوەکوو ببێتە هۆی دڵنەرمبوونت.

بۆ هەر یەکێك لە پیاوچاکە ناودارەکان کتێبێکم نووسیوە کە تێیدا باسی ژیان و خووڕەوشتیم کردووە، لەبارەی هەریەکێك لەمانە کتێبێکم داناوە: حەسەنی بەصری، سوفیانی سەوری، ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم، بیشری حافی، ئەحمەدی کوڕی حەنبەل، مەعروفی کەرخی، هیتریش لە زانایان و زاهیدان..

## ١٥٧- شلرەوی دەبێتە مایەی دڵرەقی

لە شتێکدا کە لە هەندێ مەزهەبدا ڕەوایە شلڕەویم کرد، لە دڵمدا هەستم بە ڕەقییەکی گەورە کرد و وام خەیاڵ کرد کە خودا بە جۆرێك لە دەرکردن لە دەرگای خۆی دووری خستمەوە و تاریکی و دووری لەسەر دڵم چڕ و ئەستوور بوو.

نەفسم وتی: ئەمە چییە؟! ئێ خۆ لە کۆدەنگیی زانایان دەرنەچوویت؟!

پێم وت: ئەی نەفسی بەد! وەڵامەکەت لە دوو ڕووەوەیە:

یەکەمیان: ئەتوو تەئویلی شتێك دەکەیت کە باوەڕت پێی نییە، ئەگەر داوای فەتوات لێ بکرێ بەوەی کردت فەتوا نادەیت. وتی: ئەگەر باوەڕم بە ڕەواییی ئەوە نەبووایە نەمدەکرد. وتم: بەڵام ڕازی نیت بەم باوەڕەت بۆ غەیری خۆت لە فەتواداندا.

دووەم: پێویستە دڵخۆش بیت بەوەی کە دوای ئەم کارەت هەستت بە تاریکایی لە دڵتدا کرد، چونکە ئەگەر ڕووناکی لە دڵتدا نەبووایە ئەوا ئەمە ڕووی نەدەدا.

وتی: بەم تاریکاییە نوێیەی ناو دڵ هەستم بە ترس و تەنیایی کرد.

وتم: کەواتە بڕیاری یەکلاکەرەوە بدە لەسەر وازهێنان و وا تەقدیر بکە وازت لە شتێك نەهێناوە کە بە کۆدەنگیی زانایان ڕەوایە و وادانێ ئەوەی دەسبەرداری بوویت جۆرێکە لە خۆپاراستن و وەرەع، ئیتر بەمە سەلامەت دەبیت.

## ١٥٨- دژایەتیی خۆت بۆ کەس دەرمەخە

لە ئەزموونی ڕۆژگار فێربووم کە پێویست ناکات هیچ کەسێك تا دەتوانیّ دوژمنایەتی بۆ هیچ کەسێك دەربخات، چونکە ڕەنگە لە هەر پایە و ئاستێکدا بێت ڕۆژێك پێویستی پیّ بێت.

وە مرۆڤ لەوانەیە وا گومان ببات کە هیچ ڕۆژێك پێویستی بە کەسێکی وەها نەبێت هەروەك پێویستی بە داروچکەیەکی فرێدراو کە کەس ئاوڕی لیّ ناداتەوە نابیّ. بەڵام چەند کەسی وا هەبووە کە بێنرخ و سووك سەرنجدراو بووە و خەڵکیش پێویستیان پێی بووە! ئەگەر لە هێنانی سوودێك پێویستیان بەو کەسە نەبووبێت ئەوا لە دوورخستنەوە و لابردنی زیانێك پێویستیان پێی بووە.

لە تەمەنمدا پێویستم بە نەوازشکردنی هەندیّ خەڵك بووە کە هەرگیز بە بیرمدا نەهاتووە پێویستم بەوە بێت نەوازشیان بکەم. وە بزانە کە دەرخستنی دوژمنایەتی ڕەنگە بە جۆرێك ئازارت بۆ بێنیّ کە پێی نەزانیت.

بۆ هەموو کەسێك کە لە دونیادا دەژی پێویستە هەوڵ بدات دوژمنایەتی بۆ هیچ کەسێك دەرنەخات لەبەر ئەو هۆیەی ڕوونم کردەوە کە خەڵك پێویستیان بە یەکترە و دەشتوانن زیان بە یەکدی بگەیەنن.

ئەمە بەشێکی گرینگە، سوودەکەی لەگەڵ ئاڵوگۆڕی ڕۆژگار ڕوون دەبێتەوە.

## ١٥٩- خۆشی و چێژەکانی دونیا بێ دەردەسەری نین

دیتم نەفس سەیری ئەو چێژە کاتییانە دەکات کە دونیاپەرستان هەیانە و ئەوە لەبیردەکات کە چۆن وەدەست هاتوون و چ دەرد و ئافەتێکیان تێدایە، ئەمەش ڕوونکردنەوەیەتی:

تۆ ئەگەر خاوەن دەسەڵاتێکت بینی و سەرنجت دایە خۆشی و نیعمەتەکانی، دەبینی کە بە ستەم تێکەڵە: ئەگەر خۆشی مەبەستی نەبێ و نەیکات ئەوا کاربەدەستەکانی دەیکەن. پاشان ئەو هەمیشە لە ترس و نیگەرانیدا دەژی، لە هەموو کاروبارێکی بێتاقەت و وەڕەزە، دەترسێ دوژمنەکەی ژەهرخواردی بکات، نیگەرانە لەوەی کاربەدەستی سەرووی خۆی لە پۆستەکەی لابدات، دەترسێ هاوشانەکەی پیلانی لە دژ بگێڕێ. پاشان زۆربەی کاتی لە خزمەت و حیسابی ماڵ و موڵك و جێبەجێکردنی فەرمانی ئەو دەسەڵاتدارانە دەباتەسەر کە لێیان دەترسێ، ئەوەش لە شتی ناپەسند خاڵی نییە. ئەگەریش لە کار لادرا ئەوا ئەمە لە هەموو ئەو چێژانەی لەم پۆستەدا وەریگرتووە بەئێش و ئازارترە. پاشان ئەو چێژە بە ترسان تێیدا و لێی و لەسەری، ون دەبێ.

وە ئەگەر بازرگانێکت بینی کە ئەوسەر و ئەمسەری دونیای کردووە بزانە کە ئەوەی بەدەستی هێناوە بۆی مەیسەر نەبووە تەنها دوای بەتەمەنداچوون و بەسەرچوونی

سەردەمی چێژوەرگرتن لە ژیان نەبێ! دەگێڕنەوە یەکێك لە ئاغاكان لە سەردەمی لاوێتیدا هەژار بوو کە گەورە بوو دەوڵەمەند بوو و بووە خاوەن ماڵ و موڵکی زۆر و چەندان کۆیلەی تورك و غەیری تورك و کەنیزەی لە ڕۆم کڕی، لە باسی حاڵی خۆیدا ئەم شیعرەی وت:

ما كنت أرجوه إذ كنت ابن عشرينا ملكته بعد أن جاوزت سبعينا

تطوف بي من الأتراك أغزلة مثل الغصون على كثبان يبرينا

وخرد من بنات الروم رائعة يحكين بالحسن حور الجنة العينا

يغمزنني بأساريع منعمة تكاد تعقد من أطرافها لينا

يردن إحياء ميت لا حراك به وكيف يحيين ميتاً صار مدفونا

قالوا أنينك طول الليل يسهرنا فما الذي تشتكي قلت الثمانينا

باسی ئەوە دەكات ئەوەی لە تەمەنی بیست ساڵی و گەنجێتی دەیخواست لە تەمەنی سەرووی حەفتا ساڵیدا دەستی کەوت! چەندان کچی چەشنی ئاسك و پەریی بەهەشت بەدەوریدا دەخولێنەوە بەڵام ئەو لەبەر پیری چی لەگەڵیان پێ ناکرێ! خۆی بە مردوویەك وەسف دەكات کە ئەو کچانە دەیانەوێ زیندووی بکەنەوە بەڵام چۆن زیندوو دەبێتەوە کە وەکوو مردووی نێو گۆڕی لێ هاتووە! تەنانەت ئەم ئاسکانە گلەیی ئەوەی لێ دەکەن کە لەبەر ناڵەناڵی ئەو شەوان خەویان لێ ناکەوێ و لێی دەپرسن: کێشەت چییە؟! ئەویش دەڵێ: هۆکارەکەی تەمەنە کەوا گەیشتوومەتە هەشتا ساڵی!

ئەم حاڵەتە زاڵ و زۆرینەیە، زۆربەی کات مرۆڤ تەنها لە دەمی نزیکبوونەوەی مـەرگ و پیریدا ئەوەی حەزی پێ دەکات دەستی دەکەوێت و بۆی مەیسـەر دەبـێ، ئەگـەر لە سـەرەتای لاوێتیشـدا ئـەوەی حـەزی پـێ دەکـرد بـۆی هـات ئـەوا هـەرزەکاری و سەرگەرمی، ڕێگرە لە تێگەیشتنی تەگبیر و باش چێژوەرگرتن.

مرۆڤ لە حاڵەتی هەرزەکاری و سەرگەرمیدا نازانێت لەکوێیـە مەگـەر پـێ بگات(بـالغ ببێت): کـاتێکیش پـێ گەیشـت هـەموو خـەمی ئەوەیـە پەڕین(سـەرجێی)ی دەسـت کەوێت جا هەر چۆن بێت و چۆن ڕێککەوێت. کە هاوسەرگیریشـی کـرد منـداڵ پەیـدا دەبن و ڕێگری چێژوەرگرتنی لێ دەکەن و لە ناخەوە تێکدەشکێ و سارد دەبێـتەوە و ناچار دەبێ بۆ بەخێوکردنیان کاربکات. لە کاتێکدا لەو ماوەیەی نزیك لـە تەمـەنی سی ساڵیدا خەریکی کار و کەسابەتە مووی سپی هێرش بۆ سـەری دێنـێ! ئـیتر لـە نەفسی خۆی دەتۆقێ لەبەرئەوەی دەزانێ ئیتر ژنان لێـی دەپرینگێنـەوە! هـەروەك (ابن المعتز بالله) وتوویە:

لقد أتعبتُ نفسي في مشيبي ‌ ‌ ‌ ‌ فكيف تحبني الغيدُ الكَعابُ؟!

ئـەوا پیربـووم و سـەرم سـپی بـووە جـا چـۆن کچـانی جـوان و باڵابـەرز خۆشـیان دەوێم؟!

ئیتر ئاوا، ئەگەر توانای چێژوەرگرتنی ژنـانی جـوانی هـەبوو پـارەی نـابێ بگـات بـە مەبەست و ئامانجەکەی، ئەگـەر بـە کۆکردنـەوەی پـارەوە خـەریك بێـت سـەردەمی چێژوەرگرتنی بەسەردەچێ، ئەگەریش ئەوەی دەیویست بۆی هاتەدی ئـەوا پـیری و سەرسپیبوون ناشیرینترین چڵك و گەورەترین بوغزێنراوە.

پاشـان خـاوەن مـاڵ و دارایـی لـە ماڵەکـەی خـۆی دەترسـێ و لێپرسـینەوە لـە مامەڵەکارانی دەکات، ئەگەر دەسبڵاوی یان ڕەزیلی کرد هەر زەمکراوە، کوڕەکەی چاوەڕێی مردنی دەکات، ڕەنگە کەنیزەکەی لێی ڕازی نەبێ چونکە مەشغوولە بە پاراستنی کەسوکار و دەستوپێوەندەکەیەوە، ئیتر بەم جۆرە ڕۆژگاری لە مەینـەتی و ناخۆشیدا بەڕێکرد و چێژەکانیش کاتین و پەیوەستن بە سەردەمێکی تەمەنەوە و ناخۆشییەکانیش لەم چێژانە دەبەن و لێیان دەدزنەوە. پاشان لە قیامەتدا میر و بازرگان بە ڕیسوایی حەشر دەکرێن مەگەر کەسێك خودا پاراستبێتی.

ئامان و دەخیل نەکەی چاو ببڕیتە خۆشی و شادییەکانیان، چونکە دووریت لێی بۆیە بە خۆش و شیرین دەیبینیت، ئەگەر پێی بگەیت بێزت لێی دەبێتەوە، پاشان لە ناواخنیدا ئەوەندە مەینەتیی دونیا و ئاخیرەتی تێدایە کە وەسف ناکرێ، تا دەتوانی قەناعەتت هەبێ، لە قەناعەتدا سەلامەتی دین و دونیا هەیە.

بە زاهیدێك – کە نانەوشکەی لەبەردەم بوو – وترا: چۆن ئیشتیات بۆ ئەمە هەیە؟! وتی: وازی لێ دێنم تا ئیشتیام بۆی دەبێ.

## ١٦٠- پەنابردن بۆ خودا

لەپێناو مەزهەبدا لەگەڵ دەسەڵاتداران جۆرێك لە دوژمنایەتی لەنێوانمان چێ بوو، ئەمن لە مەجلیسێکی ئامۆژگاریدا بووم و دەموت: قورئان قسە و کەلامی خودایە و قەدیمە، وە ئیمامی (ئەبووبەکر) پشم پێش دەخست، ئیتر وا ڕێککەوت لەنێو دەسەڵاتدارانیش کەسی وا هەبوو مەیلی بە لای مەزهەبی ئەشعەرییەوە بوو، هەشبوو مەیلی بە لای مەزهەبی شیعە هەبوو، ئەم دووانە لە ناوەوە دژایەتییان کردم.

ڕۆژێکیان لە لاڵانەوەم لە خودای گەورە وتم: گەورەم! ژیان و چارەنووسی هەمووان بە دەستی تۆیە، هیچ کەسێك نییە بتوانێ زیانم پێ بگەیەنێ مەگەر تۆ لەسەر دەستی وی بیهێنیەدی، تۆ فەرمووتە: ﴿وَمَا هُم بِضَآرِّينَ بِهِۦ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ﴾ (البقرة: ١٠٢) واتە: ناتوانن زیان بە هیچ کەسێك بگەیەنن مەگەر بە ئیزنی خودا..
وە دڵی گرفتارت بەم وتەیەت خۆش و شاد کردووە: ﴿قُل لَّن يُصِيبَنَآ إِلَّا مَا كَتَبَ ٱللَّهُ﴾ (التوبة: ٥١) واتە: بڵێ: هیچ شتێکمان تووش نابێ مەگەر ئەوەی خودا بۆی نووسیوین.
ئەگەر لەسەر دەستی هەندێکیان بێچارە و داماوت کردم ئەوا ترسم لەوانە زیاترە کە یارمەتیت داون لەوەی لە نەفسی خۆم نەوەك بوترێ: ئەگەر ئەو لەسەر هەق بووایە داماو نەدەکرا!

ئەگەریش تەماشای کەمتەرخەمی و گوناهەکانم بکەم ئەوا من شیاوی پشت تێکردن و بێچارە هێشتنەوەم، بەڵام بە پاڵپشتیکردن و سەرخستنی سوننەتەوە دەژیم، خودایە بمخە پەنایەوە.

خەڵکێك لە پیاوچاکانت منیان بە تۆ سپاردووە، ئەگەر بە کردەوەکانی خۆم نامپارێزیت ئەوا بەوانەوە بمپارێزە.

گەورەم! سەرم بخە بەسەر ئەوانەی دژایەتیم دەکەن، ئەوان وەکوو پێویست ناتناسن و پشتیان کردۆتە تۆ، من لەگەڵ ئەوەی کەمتەرخەمم بەڵام لە تۆ نزیکترم.

## ١٦١- كێ بەختەوەرە؟

لە (حەللاجی سۆفی) گێڕدراوەتەوە کە لە گەرمایەکی توندا لەبەر هەتاو دادەنیشت و تك تك ئارەقەی لێ دەتکا، ژیرێك بەلایدا تێپەڕی و پێی وت: ئەی گەمژە! ئەمە ملەکردنە لەگەڵ خودای گەورە.

نەزانی گەمژە ئەو کەسەیە کە ملە دەکات یان داوای بەڵا دەکات هەروەکوو ئەو گەوجە وتی: چۆنت دەوێت تاقیمکەوە!!

بەختەوەر ئەو کەسەیە ملکەچی خودا بێت و داوای ساغی و سەلامەتی بکات، چونکە ساغ و سەلامەتی بەڕەهایی نادرێت، دەبێ بەڵا هەبێ، کەسی ژیر بەردەوام داوای سەلامەتی دەکات تا زاڵ بێت بەسەر زۆرینەی حاڵوباری و لە ئارامگرتن لەسەر سووکە بەڵا نزیك بێتەوە.

بە گشتی، پێویستە مرۆڤ بزانێت کە ڕێگای گەیشتن بە حەز و ئاواتەکانی گوڵڕێژکراو نییە، لەپاڵ هەر گوڵێك دڕکێك هەیە:

وَكَمْ مَنْ يَعْشَقُ الدنيا قديما ولكن لا سبيلَ إلى الوِصالِ

چەندان کەس لە کۆنەوە ئاشقی دونیا بوون بەڵام هیچ ڕێگایەك بۆ گەیشتن نەبوو..

له ڕاستیدا ئارامگرتن تەنیٚ لەسەر قەدەرەکانە، بەزۆریش قەدەرەکان پێچەوانەی مەبەستی نەفس ڕوودەدەن.

کەسی ژیر ئەوەیە کە لە ئارامگرتندا مودارای نەفسی بکات بە بەڵێنی پاداشت و ئاسانکردنی کارەکە تاوەکوو بە سەلامەتی و خاڵی لە سکاڵاکردن سەردەمی بەڵا تێپەڕێنیٚ، پاشان داوای فریاکەوتن لە خودا بکات و ساغ و سەلامەتی بخوازێت.

بەڵام ئەو کەسەی خۆی بە ئازا و ئارامگر و خۆڕاگر پیشان دەدات و بۆ لابردنی بەڵا و ناخۆشی پەنا و هاوار بۆ خودا نابات ئەوا ئەو کەسە هەرگیز خودای نەناسیوە.

## ١٦٢- ڕێگای ڕاست

جادەی ساغ و بێقۆرت و ڕێگای ڕاست: پەیڕەویکردن و شوێنپێ هەڵگرتنی خاوەنی شەرع و پەلەکردنە لە کارپێکردنی، هەر ئەوە کە تەواو و کامڵە و هیچ کەموکورتییەکی تێدا نییە.

خەڵکێکی زۆر لایانداوە بەرەو جادەی زوهد و زیاد لە توانا باری خۆیان قورس کردووە، لە ئاخروئۆخری تەمەن بەئاگاهاتنەوە و جەستەش ماندوو کراوە و شتگەلێکی گرینگی زۆر لە زانست و هیتر لەدەست چووە.

خەڵکێکیش بەرەو شێوەی زانست بایاندایەوە و لە داواکردنیدا زێدەڕۆییان کرد، لە دوادواییەکانی ژیاندا وریابوونەوە کە کاتی کارپێکردنیان لەدەست چووبوو.

ڕێگای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) زانست و کار و نەرمونیانییە لەگەڵ جەستە، هەروەك ئامۆژگاری (عەبدوڵڵای کوڕی عەمرو کوڕی عاص)ی کرد و پێی فەرموو: ((إن لنفسك عليك حقا، ولزوجك عليك حقا)) رواه الترمذي.. واتە: نەفست مافی بەسەرتەوە هەیە، هاوسەرەکەت مافی بەسەرتەوە هەیە..

ئەمە ڕێگا مامناوەندییەکە و قسەی یەکلاکەرەوەیە، بەڵام وشکیی پەتی، چەندان زانستی بەفیڕۆدا، ئەگەر وەدەست هاتبا زیاتر لەوەی بە کردەوە بەدەست دێ بەو

بەدەست دەهات، نموونەی زانا وەکوو کەسێکە ڕێگا بزانێ و خواپەرستیش(العابد) شارەزای نەبێ، خواپەرست لە بەیانییەوە تا ئێوارە ڕێ دەکات و زاناش پێش عەسر هەڵدەستێ، کاتێ پێك دەگەن زاناکە ماوەیەکی زیاتری بڕیوە.

ئەگەر یەکێ وتی: ئەمەم بۆ ڕوونکەوە!

دەڵێم: وێنە و شێوەی خواپەرستی، خزمەتکردن و ملکەچبوونە بۆ خودا، ڕەنگە خواپەرستەکە ئاگای لە واتای ئەو شێوەیە نەبووە چونکە لەوانەیە وا گومانی بردبێت کە ئەو شایانی بوونی کەرامەتە لەسەر دەستی و شایستەی دەست ماچکردنە، یان ئەو لە زۆر کەس باشترە، ئەوەش هەمووی بە هۆی کەمی زانستەوەیە. مەبەستم لە زانست: تێگەیشتنی بنچینەکانی زانستە نەك زۆری ڕیوایەت و خوێندنەوەی بابەتەکانی ناکۆکی (خلاف).

ئەگەر زانای بنەمازان خوێندیەوە ئەوا بە ڕەوشتی جوان و موداراتی خەڵك و خاکیبوونی و ڕێنماییکردنی خەڵك بۆ لای خودا، لەم خواپەرستە(العابد) پێش دەکەوێ، ئەم کارانە بۆ ئەم خواپەرستە سەختە کە لە شەوی نەزانیی خۆیدا خەوتووە.

ڕەنگە خواپەرستەکە هاوسەرگیری بکات، پاشان نەفسی خۆی ناچاری وشکی کرد، خواستەکانی هاوسەرەکەی پشتگوێ خست و تەڵاقیشی نەدا و وەکوو ئەو پشیلەیەی لێ هات کە نە خواردنی پێدا و نە ئازادیشی کرد خۆراکی خۆی پەیدا بکات.

هەر کەسێك سەرنجی دۆخی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بدات، دەبینیٚ لەنێو خەڵکدا کامڵ و تێروتەواو بووە، مافی هەموو خاوەن مافێکی داوە: گاڵتەی کردووە و پێکەنیوە، گەمەی لەگەڵ منداڵان کردووە و گوێی لە شیعر گرتووە و بە (المعاریض — قسەیەك دوو واتای هەبیٚ، یەکێکی دیار و یەکێکی نادیار) قسەی کردووە و لەگەڵ ژنان خۆشڕەفتار بووە و ئەوەی بهاتبووایە بەردەمی دەیخوارد ئەگەر وەکوو هەنگوینیش شیرین بووایە و ئاوی شیرینی دەخواردەوە و لە بەر سێبەر جێی بۆ ڕادەخرا...هیچ شتێکی لەو شتانە لیٚ نەبیستراوە کە دوای خۆی لە لایەن سۆفی و زاهیدە نەزانەکان کراوە و ڕوویداوە لە ڕێگریکردنی ڕەها لە ئارەزووەکانی نەفس، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) گندۆرەی بە خورماوە دەخوارد و ژنی خۆی ماچ دەکرد و زمانی دەمژی و حەزی لە شتی جوان و خۆش بوو.

سەبارەت بە خواردنی نانی جۆ و کێشانی خۆراك و وشککردنەوەی جەستە و دوورکەوتنەوە لە هەموو شتێکی خۆش ئەوا ئەمە ئازاردانی نەفس و تێکشکاندنی جەستەیە کە نەعەقڵ دەیخوازیٚ و نە شەرع ستایشی دەکات. بەڵکوو خەڵکێك هەبوون لەبەر هۆکارگەلێك بە کەم قایل بوون وەکوو ئەوەی گومانێکیان هەبووە بۆیە کەمیان خواردووە یان خۆراکێك بە خۆراکێك تێکەڵ بووە خۆیان پاراستووە.

پاشان پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بە شەونوێژ و زیکری زۆر مافی خواپەرستی دەدا. ئیتر پێویستە ڕێگای ئەو بگریت کە تەواوترین ڕێیە و دەست بە شەرعەکەیەوە بگریت کە هیچ کەموکورتییەکی تێدا نییە، واز لە قسەی ئەم و ئەو

له زاهیدان بێنه و تا دەتوانی عوزریان بۆ بێنەوە، ئەگەر هیچ عوزرێکت نەدۆزیـەوە ئەوا خۆیان بەرپرسن له کردەوەی خۆیان چونکە پێغەمبەر (صلی الله علیـه وسلم) پێشەنگی خەڵك و گەورەی ژیرانە، ئایا خەڵکیش هەر بـه لادان لـه شـەریعەت خـراپ نەبوون؟

ئافەتگەلێك له سۆفی و زاهیدانەوە ڕوویداوە کە بە هۆیەوە تۆڕی شـەریعەتیان کـون کـردووە و پەڕیونەتـەوە: هەیانـە بانگەشـەی خۆشەویسـتی و شـەوق دەکـات و خۆشەویست ناناسێ، دەبینی هاوار دەکـات و داوای فریاکـەوتن دەکـات و جلـەکانی دەدڕێنێ و بە بانگەشە و ناوەڕۆکەکەیەوە له سنووری شەرع دەردەچێ!!

هەیانە نەفسی خـۆی ناچـاری برسـێتی و ڕۆژووی بـەردەوام کـردووە، لـه پێغەمبـەر (صلی الله علیه وسلم) گێڕدراوەتەوە بە عەبدوڵڵای کوڕی عەمروی فەرمووە: ((ڕۆژە نا ڕۆژێك بەڕۆژووبە)) وتوویە: باشتر لەوەم گەرەکە. فەرموویەتی: ((باشتر نییە)).

هەیانـە کەشـکۆڵی کردۆتـە کـۆڵ و ڕووی کردۆتـە چـۆڵ و بیابـان و جەماعـەتی لـە دەستی خۆی داوە.

هەیانە کتێبەکانی زانستی ژێرخـاك نـاوە و دانیشـتووە هـەر خـەریکی نوێـژ و ڕۆژوو بووە و نەیزانیوە کە بنخاکنـانی کتێـب هەڵەیـەکی ناشـیرینە چـونکە نـەفس بێئاگـا دەبێ و هەموو کاتێك پێویستی بە بیرخسـتنەوەیە، کتێبـەکانی زانسـتیش باشـترین بیرخەرەوەن.

ئیبلیس لەو شوێنەی توانیویەتی چۆتە نێو هەموو خەڵکێکەوە و مەبەستیشی لە ژێرخاکنانی کتێبانیش کوژاندنەوەی چرای زانست بووە تاوەکوو خواپەرست لە تاریکاییدا بڕوات.

لە ڕاستیدا، زاهیدەکان لە پلەوپایەی شەمشەمەکوێرەکاندان، بە لاتەریکییان خۆیان لە سوودی خەڵك شاردۆتەوە، ئەمە حاڵەتێکی باشە ئەگەر ڕێگر نەبێ لە خێر و جەماعەت و شوێنکەوتنی جەنازە و سەردانی نەخۆش... بەڵام ئەمە حاڵەتی ترسنۆکەکانە، کەسە ئازاکان فێردەبن و دەزانن، ئەمە پلەوپایەی پێغەمبەرانە (سڵاوی خودایان لێ بێت)..

ئەگەر ڕووداوێك لە خواپەرست قەوما دەبینی چ جیاوازییەکی زۆر لەنێوان ئەو و زانادا هەیە؟! سوێند بە خوا، ئەگەر هەموو خەڵك ڕووبکەنە خواپەرستی (التعبد) ئەوا شەریعەت ون دەبێ. ئەگەر ئەو لە واتای خواپەرستی تێگەیشتبایە تەنها بە نوێژ و ڕۆژوو وازی نەدەهێنا! ڕەنگە کەسێك لەگەڵ موسڵمانێك بۆ جێبەجێکردنی کار و پێویستییەك بڕوات ئەوا ئەو خواپەرستییەی لە ڕۆژووی ساڵێك باشتر بێت.

کارکردن بە جەستە کۆششی ئامرازە دیارەکانە و، زانستیش کۆششی ئامرازەکانی ناوەوەیە لە هۆش و هزر و تێگەیشتن، لەبەرئەوە بەڕێزتر و پیرۆزترە.

ئەگەر وتت چۆن زەمی ئەو کەسانە دەکەیت کە خۆیان لە خراپە تەریك کردووە و خواپەرستییان لێ دادەڕنیت؟! دەڵێم: زەمیان ناکەم بەڵکوو ڕووداوگەلێکیان لێ قەوماوە کە هۆکارەکەی نەزانی و کەمیی زانستە و شتگەلێکیان بەسەر خۆیاندا

سەپاندووە کە دروست نییە! تەنانەت هی وایان هەیە پێی وایە کردنی کارێك کە ئازاری نەفس دەدات بەڕەهایی فەزیلە و چاکەیە!! گەمژەی وایان هەیە وتوویە: چوومە گەرماو هەستم بە بێئاگاییەك کرد، سوێندم خوارد تا ئەوەندە تەسبیحاتە نەکەم نەیەمەدەر، کارەکە زۆری خایاند و درێژ بوویەوە، نەخۆش کەوتم! ئەم کەسە بە کردنی کارێك ژیانی خۆی خستۆتە مەترسییەوە کە نەدەبوو بیکات و پێویست نەبوو.

سۆفی و زاهیدی وا هەیە بە شێوەی جلوبەرگ قەناعەتی کردووە بەڵام لە ناخەوە ئەوەندە نەفامی هەڵگرتووە کە لە کتێبدا جێی نابێتەوە!!

خوای گەورە زەوییان لێ پاك بکاتەوە و لە دژیان یارمەتیی زانایان بدات، زۆربەی گەمژەکان لەگەڵیانن، ئەگەر زانایەك ڕەخنە لە یەکێکیان بگرێت ئەوا بە هۆی هێزی نەزانییەوە ڕەشۆکییان دژی زاناکە دەوەستنەوە.

زۆرێك لە خواپەرستەکانم بینیوە — کە لە پایەی پیراندا بوون — هەندێ تەسبیحاتی وەها دەکات کە وتنی دروست نییە و لە نوێژیدا کاری ئەوتۆ دەکات کە لە سوننەتدا نەهاتووە!

ڕۆژێکیان چوومە لای هەندێ لەوانەی خواپەرستییان دەکرد، ئیمامێکیان دانابوو لە دوایەوە نوێژی چێشتەنگاویان دەکرد و بە دەنگ قورئانی دەخوێند! پێم وتن: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ((نوێژی ڕۆژ بێدەنگە))، زاهیدێك توورە بوو و وتی: چەندە لەسەر ئەوە ڕەخنەمان لێ دەگرن! ئەوە چەندین کەس

لەسەر ئەوە ڕەخنەمان لێ بگرن! کاکە ئێمە بۆیە دەنگمان بەرز دەکەینەوە تا نەخەوین!! وتم: سەیرە! جا کێ وتوویە: مەنوون؟! ئەدی ئەوە نییە لە صەحیحی بوخاری و موسلیمدا هاتووە کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بە (ئیبن عەمرو)ی وتووە: ((بۆ شەونوێژ هەستە و دواتر بخەوە))؟! پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەنووست و ڕەنگە هیچ شەوێك تا بەیانی بێدار نەبووبێت ئیللا خەوی خۆی کردووە!!

لە مزگەوتی مەنصوور پیاوێکم دیت پێی دەوترا (حوسەین قەزوینی)، بەردەوام و زۆر لەناو مزگەوت هاتوچۆی دەکرد، لێم پرسی: هۆکاری ئەم هەموو هاتوچۆیەت چییە؟ وتی: تا نەخەوم!

ئەمانە هەموو گەوجێتی و گەمژەییەکن کە بە هۆی کەمیی زانستەوەیە، چونکە ئەگەر نەفس بەشی پێویست خەوی دەست نەکەوێ ئەوا عەقڵ تێکەڵ و پێکەڵ دەکات و لەبەر دووریی تێگەیشتن مەبەست لە خواپەرستی لەدەست دەچێ.

پیاوچاکێکی هاوسێی مزگەوتی مەنصوور بۆی گێڕامەوە: پیاوێك کە ناوی (کەسیر) بوو هاتە مزگەوت و وتی: لەسەر شتێك پەیمانم بە خوا دابوو و شکاندم، سزای نەفسم بەوە داوە کە تا چل ڕۆژ هیچ شتێك نەخۆم! پیاوچاکەکە وتی: نزیکەی دە ڕۆژی ئاسایی بەڕێکرد و نوێژی بە جەماعەت دەکرد، لە دە ڕۆژی دووەم بێهێزی و لاوازی بەدەرکەوت و خۆی دەگونجاند، لە دە ڕۆژی سێیەم بەدانیشتنەوە نوێژی دەکرد، لە دە ڕۆژی چوارەم پاڵکەوت، کە چل ڕۆژی تەواوکرد خۆشاوێکیان بۆ هێنا

و خواردیه‌وه، گوێمان له ده‌نگی خۆشاوه‌که بوو له گه‌روویدا وه‌کوو ئاوی ناو تاوه بلقه‌بلقی ده‌هات! دوای چه‌ند ڕۆژێك مرد.

وتم: ئه‌ی خودایه چه‌نده سه‌یره! ته‌ماشاکه‌ن نه‌زانی چی پێ کرد! به ڕواڵه‌ت وا دیاره که ئه‌م که‌سه له ئه‌هلی دۆزه‌خه مه‌گه‌ر خودا لێی خۆشبێت، ئه‌گه‌ر له زانست تێگه‌یشتبایه و پرسیاری له زانایان کردبایه ئه‌وا پێیان ده‌گوت که ده‌بێ نان بخوات و ئه‌وه‌ی به نه‌فسی خۆی کردوویه‌تی حه‌رامه، به‌ڵام گه‌وره‌ترین نه‌فامی ئه‌وه‌یه که مرۆڤ به زانسته‌که‌یه‌وه خۆسه‌پێن بێت!

هه‌موو ئه‌م ڕووداوانه ورده ورده په‌یدابوون تا ئه‌وه‌ی زاڵ بوون، به‌ڵام ئه‌وه‌ی یه‌که‌م(ی هاوه‌ڵان) هیچ شتێکی له‌مه تێدا نه‌بوو و هاوه‌ڵان هیچ شتێکیان له‌مانه نه‌ده‌کرد، ئه‌وان ده‌یانخوارد بێ تێربوون و ئه‌گه‌ریش هیچیان ده‌ست نه‌که‌وتایه ئارامیان ده‌گرت، هه‌ر که‌سێ بیه‌وێ په‌یڕه‌وی که‌سێك بکات با په‌یڕه‌وی له ڕێبازی پێغه‌مبه‌ر (صلی الله علیه وسلم) و هاوه‌ڵانی بکات، له‌وه‌دا شیفا و داواکراو هه‌یه.

پێویست ناکات که‌سی ژێر په‌نا بباته به‌ر لاساییکردنه‌وه و چاولێکردنی که‌سێك که گه‌وره‌کراوه و ناوی بڵاو بۆته‌وه و بڵێ: ئه‌بوو یه‌زید وتی و سه‌وری وتی...چونکه چاولێکه‌ر و لاساییکه‌ره‌وه کوێره.

چه‌ندان کوێرمان دیت هه‌ڵگرتنی دارده‌ستێکی پێ شه‌رم بوو! هه‌ر که‌سێ له‌م ئاماژه بۆکراوه تێگه‌یشت ئه‌وا داوای باشتر و به‌رزتر ده‌کات.

## ١٦٣- فەلسەفە و ڕەهبانییەت

سەرنجی ئەو دەرد و بیدعە و شتە نامۆیانەم دا کە لە لایەنی زانست و کردەوەوە هاتوونەتە نێو دینەکەمانەوە، دیتم لە دوو ڕێگەوە هاتوون و خەڵك هۆگریان بوون:

بنچینەی بیدعە و دەرد لە زانست و بیروباوەڕ لە فەلسەفەوەیە. ئەویش ئەوەیە کە خەڵکێك لە زاناکانمان قەناعەتیان نەهات بەوەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) قەناعەتی پێ هات لە سەرداگرتن و پابەندبوون بە قورئان و سوننەتەوە، قووڵبوونەوە لە سەیرکردنی ڕێبازەکانی ئەهلی فەلسەفە و ڕۆچوون لەو کەلامەی کە بەرەو ڕێبازی لەناوبەری بردن و بیروباوەڕەکانیان پێ تێکدا و خراپ کرد.

بنچینەی بیدعە و نامۆییش لە بابەتی کردەوەدا لە ڕەهبانییەتەوەیە. خەڵکێك لە زاهیدان لە ڕاهیبەکانەوە ڕێگای وشکەژیانیان وەرگرت و سەیری ژیانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و هاوەڵانیان نەکرد، زەمکردنی دونیایان بیست و لە مەبەستەکەی تێ نەگەیشتن، ئیتر پشتکردن لە زانستی شەرع لەگەڵ خراپ تێگەیشتنی مەبەست کۆبوویەوە و بووە هۆی پەیدابوونی بیدعەی ناشیرین لەلایان.

یەکەم شت کە ئیبلیس دەستی پێ کرد، فەرمانی پێ کردن پشت لە زانست بکەن، کتێبەکانیان ژێرخاکنا و شووشتیانەوە، ناچاریکردن گۆشەی خواپەرستی بگرن و کۆمەڵێك شتی سەیروسەمەرەی بۆ دەرخستن کە وایکرد ڕەشۆکییان ڕوویان تێ

بکەن، ئارەزووەکانیانی کردە خوایان، ئەگەر بیانزانیبا ئەو ڕۆژەی کتێبەکانیان خستە بن خاك و لە زانست دابڕان چرایان کوژایەوە وایان نەدەکرد بەڵام ئیبلیس ئەو ڕۆژەی زانستەکەیانی خستە ژێر زەوییەوە زۆر فێڵباز بوو!

بە زانست خراپیی دوو ڕێگاکە دەزانرێ و ڕێگای ڕاستتر دەدۆزرێتەوە..

لە خوای گەورە داوا دەکەین لە زانستی خۆیمان بێبەش نەکات، چونکە هەر ئەو لە تاریکییدا ڕووناکی و لە تەنیاییدا هاودەم و لە کاتی لێقەوماندا پاڵپشتە.

## ١٦٤- هاوڕێیەتیی بێکاران

پەنا بە خوا لە هاوڕێیەتیی بێکاران! خەڵکێکی زۆرم بینیوە ئەوەی خەڵك دەقی پێوە گرتووە لە سەردانی زۆر لەگەڵ منیش ئەنجامی دەدەن و ئەو هاتوچۆیە ناودەنێن خزمەت و داوای دانیشتن دەکەن و تێیدا باسوخواسی خەڵك و قسەی بێکەڵك و غەیبەت دەکەن!

ئەمە شتێکە خەڵکێکی زۆر لە سەردەمی ئێستاماندا دەیکەن و ڕەنگە سەردانیکراو (خانەخوێ) داوای بکات و پەرۆشی بێت و لە تەنیاییدا هەست بە بێتاقەتی بکات، بەتایبەتی لە ڕۆژانی پیرۆزبایی و جەژنەکان، دەیانبینی دەچنە لای یەکتر و تەنها بە پیرۆزبایی و سلاو وازناهێنن بەڵکوو ئەوە تێکەڵ دەکەن بەو شتانەی باسم کرد کە کات بەفیڕۆدانە.

کاتێ دیتم کات و زەمان بەڕێزترین و پیرۆزترین شتە و پێویستە بۆ کاری خێر بەکاربهێنرێ، ڕقم لەوە بوویەوە و لەگەڵیاندا دوو ڕێگام هاتەپێش: ئەگەر ڕەخنەم لێ گرتن ئەوا دابڕان و دووری ڕوودەدات لەبەرئەوەی شتێکی دەقپێوەگیراوم پچڕاندووە! ئەگەریش لێیان قەبووڵ بکەم ئەوا کات بەفیڕۆ دەڕوات!

ئیتر هەوڵم دەدا دیدار ڕوونەدات، ئەگەریش ناچاریش بووم ئەوا قسەی کەمم دەکرد تاوەکوو زوو جیابوونەوە ڕووبدات و کۆتایی پێ بێت. پاشان هەندێ کارم ئامادە

کرد که له کاتی دیداریان ڕێگری له قسه و گفتوگۆ دەکرد نەوەك کاتەکە بەخۆڕایی بڕوات، بۆ کاتی دیدەنییان ئەم کارانەم ئامادە دەکرد کە لە کاتی بوونی ئەواندا بیانکەم: بڕینی پەڕی نووسین، تیژکردنی قەڵەم، بەستنی دەفتەرەکان، ئەو شتانە هەردەبێ بکرێن و پێویستیان بە بیر و ئامادەیی دڵ نییە بۆیە بۆ کاتی سەردانەکانی ئەوانم دانان تاوەکوو هیچ شتێك لە کاتم بەفیڕۆ نەچێت.

خەڵکێکی زۆریشم بینی واتای ژیان نازانن: هەیانە خودا بە هۆی زۆری ماڵ و سامانەوە لە کارکردن بێنیازی کردووە دەچێ زۆربەی کات لە بازاڕ دادەنیشێ و سەیری خەڵك دەکات، چەندان ئافەت و مونکەر بەلایدا تێدەپەڕێ! هەیانە خەریکی یاریی شەترەنجە ! هەیانە کاتی بە زۆریی ڕووداوەکانی دەسەڵاتداران و گرانی و هەرزانی بەسەردەبات...هیتریش.

زانیم خودا گەورەیی و گرینگی تەمەن و زانینی ڕێزی کاتەکانی لەشساغی بە کەس نەداوە تەنها بەوانە نەبێ کە تەوفیقی داون و ئیلهامی قۆستنەوەی ئەوەی کردوون.

﴿وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ذُو حَظٍّ عَظِيمٍ ۝٣٥﴾ (فصلت: ٣٥) واتە: تەنها ئەو کەسانە ئەوەیان دەست دەکەوێ کە بەختەوەر و خاوەن پشکێکی گەورەن لە ڕەوشت و ئاکاری بەرز کە دەبێتە مایەی چوونە بەهەشت.

## ١٦٥- پلانی سەرکەوتوو

ئەو ڕایەم پێ ڕاستە کە سوودی دانانی کتێب زیاترە لە سوودی فێرکردنی زارەکی، لەبەرئەوەی من لە تەمەنمدا ژمارەیەك لە فێرخوازان دەبینم بەڵام بە دانراوەکانم ژمارەیەکی زۆری خەڵك دەبینم کە هێشتا لەدایك نەبوون.

بەڵگەش بۆ ئەمە ئەوەیە کە سوودوەرگرتنی خەڵك لە دانراوەکانی زانایانی پێشین زیاترە لە سوودوەرگرتنیان لە پیرەکانیان (شێخ). بۆیە پێویستە زانا ڕوو بکاتە کتێب دانان ئەگەر توانای دانانی کتێبی هەیە و تێیدا سەرکەوتووە، چونکە کارەکە هەروا هەوەنتە و ئاسان نییە کە هەرکەس دەستی قەڵەمی گرت مل بنێتە بەر دانانی کتێبان! مەبەست هەر کۆکردنەوەی شت نییە هەرچییەك بێت، بەڵکوو ئەوە ڕازگەلێکە خودای گەورە هەندێ لەو بەندانەی لێ ئاگادار دەکاتەوە کە خۆی دەیەوێ و لە دۆزینەوەیدا هاوکارییان دەکات، ئیتر ئەویش پەرشوبڵاوەکان کۆدەکاتەوە و ڕێکیان دەخات، یان ئەو بابەتانە ڕوون دەکاتەوە کە پشتگوێ خراون..ئا ئەمەیە کتێب دانانی باش.

پێویستە لە ناوەڕاستی تەمەندا بایەخ بە دانانی کتێب بدرێ و کاتەکە بقۆزرێتەوە چونکە سەرەتاکانی تەمەن کاتی کۆکردنەوە و وەدەسهێنانی زانست و کۆتاییی تەمەنیش هەستەکان ماندوون.

کاتی زانستخوازی و لەبەرکردن و سەرقاڵبوون بە زانستەوە تا تەمەنی چل ساڵی دەبیّ، پاشان دوای چل ساڵی دەست دەکات بە دانانی کتێب و فێرکردن و وانەوتنەوە، ئەمە ئەگەر گەیشتە ئەوەی دەیەوێت لە کۆکردنەوەی زانست و لەبەرکردن و یارمەتی درا لە وەدەسهێنانی خواستەکان. بەڵام ئەگەر کتێبە گرینگەکانی لە کن کەم بوو یان لە سەرەتای تەمەنیدا لە زانستخوازیدا لاواز بوو و ئەوەی لەم کاتەدا دەیویست بەدەستی نەهێنا ئەوا دەبیّ دانانی کتێب بۆ پەنجا ساڵی دوابخات، پاشان دوای پەنجا ساڵی تاوەکوو شەست ساڵی دەست بکات بە کتێب دانان و فێرکردن.

پاشان دوای شەست ساڵی تا حەفتا ساڵی زیاتر بایەخ بە فێرکردن دەدات و وانەی فەرموودە و زانست دەڵێتەوە و واز لە دانانی کتێب دێنێت مەگەر بابەتێکی گرینگ هەبیّ پێویستی بە لەسەر نووسین هەبیّ یان پێداچوونەوە بە دانراوەکانی پێشوو بکات.

ئەگەر لە حەفتا ساڵی تێپەڕی ئەوا زۆربەی کاتەکانی بۆ یادی ئاخیرەت و خۆئامادەکردن بۆ مردن دادەنیّ و خۆی بۆ خۆی تەرخان دەکات مەگەر فێرکردن و وانەوتنەوەیەك کە چاوەڕێی پاداشتی خودایە یان دانانی کتێبێك کە پێویستی پێیەتی، ئەمە باشترین چەکە بۆ ئاخیرەت.

با زیاتر هەوڵ و خەمی پاککردنەوەی خۆی و چاککردنی ئاکارەکانی و ڕاستکردنەوەی هەڵەکانی بێت، ئەگەریش لە میانەی ئەوەی باسمان کرد مرد ئەوا

نیاز و نیەتی ئیماندار لە کردەوەی باشترە، ئەگەریش گەیشتە ئەم پلەوپایانە ئەوا بۆ هەر پلەوپایەیەك ئەوەمان ڕوون کردۆتەوە کە بۆی باش و شیاوە.

سوفیانی سەوری وتوویەتی: هەر کەسێك گەیشتە تەمەنی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) با کفنێك بۆ خۆی ئامادە بکات.

کۆمەڵێك لە زانایان گەیشتوونەتە تەمەنی (٧٧) حەفتا و حەفت ساڵی، ئەحمەدی کوڕی حەنبەل یەکێکە لەوان، هەر کەسێك گەیشتە ئەم تەمەنە با بزانێ کە لەسەر لێواری گۆڕدایە و هەموو ڕۆژێکی دوای ئەم تەمەنە شتێکی نوێیە.

ئەگەر بووە هەشتا ساڵ با هەموو کۆششی بۆ خاوێنکردنەوەی ئاکارەکانی و ئامادەکردنی توێشووی بێت و با داوای لێخۆشبوون لە خودا بکاتە هاوپەیمان و زیکر بکاتە هاودەم و لە خود لێپرسینەوە و لە زانست بەخشین یان تێکەڵبوونی خەڵك ورد و وردبین بێت، زۆر لە خەمی ئەوەدا بێت بەر لە مردنی شوێنەوارێك بەجێ بێڵێ وەکوو: بڵاوکردنەوەی زانستەکەی و بەخشینی کتێبەکانی و شتێك لە ماڵ و سامانەکەی.

پاشان هەر کەسێك خودا پشتی بگرێ ئەوا فێری دەکات و هەر کەسێکی بوێت ئیلهامی دەکات.

لە خودا داواکارین بە پاڵپشتیکردنمان چاکەمان دەگەڵ بکات و پشتمان تێ نەکات، ئەو نزیك و وەڵامدەرەوەیە.

## ١٦٦- دينداريى زۆر كەس عادەتە نەك عيبادەت

ديتم دابونەريت (عادات)ى خەڵك زاڵ بووە بەسەر كاركردنيان بەسەر شەرعدا، لە كردنى هەندێ شت دەسڵەمنەوە لەبەرئەوەى عادەت نييە نەك لەبەر نەهيكردنى شەرع !

زۆرێك لە سۆفييەكان لە ستەمكردن لە خەڵك ناپرينگێنەوە، پاشان خێر بە هەزاران دەكەن، ڕەنگە لە دەركردنى زەكاتيش سستى بكەن و بە بەكارهێنانى هەندێ تەئويل تەنبەڵى تێدا بكەن، پاشان ئەگەر يەكێكيان لە كۆڕێكى ئامۆژگاريدا ئامادەبێت دەگرييێت وەكوو ئەوەى بەو حاڵە خۆنواندن بكات.

هەيانە هەندێك زەكات دەردەكات وەكوو خۆنواندنێك لەوەى دەرينەكردووە. هەيانە دەزانێ بنەچەى ماڵ و سامانەكەى حەرامە و لەبەر عادەت دژوارە لەسەرى دەستى لێ هەڵگرێت.

تێياندايە سوێند بە تەڵاق دەخوات و سوێندەكەى دەشكێنێ و جودابوونەوەى پێ سەختە، ڕەنگە تەئويليش بكات، لەوانەيە لە تەئويليش تەنبەڵى بكات وەكوو پشتبەستنێك بە لێخۆشبوونى خودا و بە تەماى تەوبە و گەڕانەوە !

هەیانە پێی وایە بەکارهێنانی شەرع ڕەنگە هۆکارێك بوو بێت لە تەنگبوونەوەی بژێوییەکەی و دەقی گرتووە بە فراوانکاری، ئاسان نییە واز لەوە بێنێ کە دەقی پێوە گرتووە !

بە گشتی دابونەریت و خووپێوەگرتن و عادەتەکان لەناوبەرن.

دوکانێکم لە پیرەپیاوێکی هەشتاساڵە کڕی و گرێبەستم لەگەڵیدا کرد، کاتێ لێك جودابووینەوە، دوای چەند ڕۆژێك گرێبەستەکەی شکاند و پەشیمان بوویەوە، داوام لێ کرد لە کن دادوەر ئامادەبێت ڕازی نەبوو، بەزۆر بردمە لای دادوەر، سوێندی درۆی خوارد کە پێمی نەفرۆشتووە ! وتم: خوای گەورە لەسەر ئەم سوێندە درۆیە سزای دەدات !

ئیتر دەستی کرد بە بەرتیلدان بەم و بەو، خەڵکی ڕەشۆکیم دیت عادەت بەسەریدا زاڵ ببوو لەگەڵ ویدا گرینگییان بە قسەی زانا نەدەدا، یەکێ دەیوت: ئەمە نرخەکەی وەرنەگرتووە چۆن فرۆشتنەکە دروستە ؟! یەکێکی تر دەیوت: چۆن بۆت دروستە دوکانەکەی بە بێ ڕەزامەندی لێ وەربگریت ؟! یەکێکی دیکە دەیوت: پێویستە لەسەرت فرۆشتنەکە هەڵوەشێنیتەوە ! کاتێ هەڵمنەوەشاندەوە، خۆی و خزمەکانی دەستیان کرد بە ئابڕووبردنم و پێی وابوو کە بەرگری لە موڵکەکەی دەکات، پاشان لە کن سوڵتان دووزمانی لێکردم و بەدرۆ لە دژی من وەها هانی دەدا حەپەسام و بەرتیلی دەدایە خەڵکی ستەمکار، ئیتر هەوڵیاندا و زۆر کۆشان بەڵام خودا لە خراپەیان پاراستمی. پاشان لە کن دادوەر سکاڵام لێ کرد و بەڵگەم خستەڕوو، هەندێ دونیاپەرست بە دادوەریان وت: حوکمی بۆ مەدە ! تەنانەت

دادوەریش دوای ساغبوونەوەی بەڵگەش لە حوکمدان وەستا!! ئەوەی لەم دادوەرە و دادوەرێکی باڵاتر بینیم لەوەی جێبەجێکردنی هەقیان پشتگوێ خست لەبەر خاتری پاراستنی پلەوپۆستیان ئەوەی پیرەپیاوم بۆ پاراستنی ماڵەکەی بەلاوە سووك و سادە بوو، ئەو نەزان بوو بەڵام دادوەرەکان زانا بوون!

لەم ڕووداوەوە بۆم ڕوون بوویەوە کە دابونەریتەکان زاڵ بوون بەسەر خەڵك و شەرع پشتی تێ کراوە. مرۆڤ ئەگەر بە قامچی لێی بدرێ لە ڕەمەزاندا ڕۆژوو ناشکێنێ، ئەمە عادەتێکە بەردەوامی هەیە، هەر ئەم مرۆڤە دەم دەنێتە ئابڕوو و ماڵی خەڵك و عادەتێکە بەسەریدا زاڵ بووە!

چەندان جار ئەم پیرەپیاوەم بینیوە نوێژان دەکات و ئاگای لە نوێژەکانە، پاشان کە ترسا لەوەی ماڵەکەی لە دەست بچێت شەرعی بەلاوەنا!

چەندان کەس لەو دادوەرانەم بینیوە خواپەرستی دەکەن و بەدوای زانستەوەن بەڵام کە ترسان لەوەی پایە و پۆستەکانیان لەدەست بچێت لایەنی دینیان بەردا!

پاشان خودا بەسەر پیرەپیاودا سەری خستم و دادوەر لە قازانجی من بڕیاریدا، ساڵێك سووڕایەوە و شێخ بە هەژاری مرد.

لە خودا داواکارم لە ملکەچبوون بۆ شەرعەکەی و سەرپێچیکردنی ئارەزووەکانمان یارمەتیمان بدات.

## ١٦٧- سوودەکانی لاتەریکی

بۆ کەسی زانا بەرای بەرای هیچ چێژ و شکۆمەندی و شەرەف و ئاسوودەیی و سەلامەتییەك باشتر نییە لە گۆشەگیری و لاتەریکی، بە کەنارگیری، سەلامەتیی جەستە و دین و پایەی لە کن خوای گەورە و لە لای خەڵك بەدەست دێنێ، چونکە خەڵك ئەو کەسەیان لە نك کەم بایەخە کە تێکەڵیان دەبێ و ڕێزی ئەو کەسەیان لە کن گەورە نییە کە تێکەڵیان دەبێ، لەبەرئەوە قەدری خەلیفەکان گەورە بووە چونکە خۆیان لە خەڵك شاردۆتەوە و دابڕیوە، ئەگەر ڕەشۆکییان زانایەك ببینن لە بابەتێکی ڕێپێدراودا شلرەوە ئەوا لەلایان سووك دەبێ. لەسەری پێویستە زانستەکەی بپارێزێ و ڕێزی زانست لە کنیان بەرقەرار بکات.

یەکێ لە پێشینان وتوویە: ئێمە گاڵتەمان دەکرد و پێدەکەنین، وای لێهات خەڵك پەیڕەویان لێ دەکردین، ئیتر ناتوانین ئەوە بکەین.

سوفیانی سەوری وتوویەتی: ئەم زانستە فێربن و بیپارێزن و تێکەڵی فشە و گاڵتەیەکی وەهای مەکەن دڵەکان بێزیان لێ ببێتەوە.

نابێ نکوڵی لە ڕەچاوکردنی دۆخی خەڵك بکرێ. پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بە عائیشەی فەرموو ((ئەگەر لەبەرئەوە نەبووایە کە گەلەکەت هێشتا نەوموسڵمانن و

تازه له بێباوەڕی هاتوونەتەدەر ئەوا کەعبەم هەڵدەوەشاندەوە و دوو دەرگام بۆ دروست دەکرد...)) بوخاری و موسلیم گێڕاپتیانەوە.

ئەحمەدی کوڕی حەنبەل لەبارەی نوێژی دوو ڕەکاتی پێش مەغریب وتوویەتی: دیتم خەڵك پێیان خۆش نییە بۆیە وازم لێ هێنان.

گوێ لەو نەزانە مەگرە کە پێی وایە ئەم شتانە ڕووپامایین بەڵکوو ئەمانە پاراستنی زانستن. ڕوونکردنەوەی ئەمەش بەم شێوەیەیە: ئەگەر زانایەك بە سەرکۆتی بچێتە دەرەوە یان پارچە نانێکی پێ بێت بیخوات ئەوا لە کن خەڵکی ڕێزی کەم دەبێ ئەگەرچی ئەم کارانەش ئاسایی و ڕێپێدراون، ئەمە وەکوو ئەو پزیشکە وایە کە بە خەڵك بڵێ پارێزی بکەن و خۆشی خۆ لە خواردنی هیچ شتێ نەبوێرێ!

نابێ زانا لە لای ڕەشۆکییان کراوە و بێ فلتەر بێت، هەر کاتێ شتێکی ڕێپێدراوی ویست با خۆی لێیان بشارێتەوە و دوور لە چاوی ئەوان ئەم کارە ڕێپێدراوە بکات.

ئەمە ئەو ڕێزەیە کە ئەبوو عوبەیدە تێبینی کردووە کاتێ عومەری کوڕی خەتتاب(خوا لێی ڕازی بێت)ی بینی بەسەر پشتی کەرێکەوە لە شام دەهاتەوە و قاچەکانی شۆڕ ببۆوە، وتی: ئەی میری ئیمانداران! گەورەپیاوان دیدارت دەکەن! ئەوەی بینیم باش و جوان نەبوو! بەڵام ئیمامی عومەر ویستی ئەبوو عوبەیدە بە پاراستنی بنچینە و ئەسڵەوە پەروەردە بکات و وتی: خودا بە ئیسلام بەهێز و شکۆمەندی کردن، لە هەر شتێکی تری غەیری ئیسلام بەدوای شکۆمەندیدا بگەڕێن زەلیل و سووکتان دەکات. واتە: پێویستە خواستنی شکۆمەندیتان بە دین بێت نەك

به شێوەی کردارەکان ئەگەرچی شێوەکان تێبینی دەکرێن. مرۆڤ لە ماڵی خۆیدا جلوبەرگ دادەکەنێ، ئەگەریش چووە ناو خەڵك جلوبەرگێکی تەواو لەبەردەکات. ئەمەش ڕووپامایی نییە و بە خۆبەلزانی دانانرێ. مالیکی کوڕی ئەنەس خۆی دەشووشت و بۆنی خۆشی لە خۆی دەدا ئینجا دادەنیشت و فەرموودەی دەخوێندەوە.

سەیری ئەو زانایانە مەکە کە لەبەر دەرگای دەسەڵاتداران کەوتوون، بەدڵنیاییەوە لاتەریکی بۆ زانا و زانست ئابڕوومەندترە و ئەوەی زانایان لە نزیکبوونەوە لە دەسەڵات لەدەستی دەدەن چەندان هێندەی ئەوەیە قازانجی لێ دەکەن. سەعیدی کوڕی موسەییەب گەورەی زانایان نەدەچووە کن دەسەڵاتداران.

ئەگەر خۆشی و ئاسوودەییت دەوێ ئەی زانا ئەوا خۆت بخەرە کونجی ماڵەوە و لە کەسوکار و خێزانیشت تەریك بە ژیانت خۆش دەبێ، بۆ دیداری کەسوکار و خێزانت کاتێك دانێ، کە زانیان کاتەکە هاتووە ئەوا بۆ دیدارت خۆیان دەڕازێننەوە، بەوەش ئاوێزانبوون و تێکئالان خۆشتر و بەتامتر دەبێ.

با لە ماڵەوە شوێنێکی تایبەتت بۆ تەنیابوون هەبێ و لەوێدا کتێبەکانت بخوێنیتەوە و بە نێو باخی هزرت پیاسە بکەیت! خۆت لە دیدەنی خەڵك بپارێزە بەتایبەتی ڕەشۆکییان! کارێکیش بکە کە ژیانی خۆتی پێوە بەڕێوە ببەیت و لە تەماکردنە ماڵی خەڵك بتپارێزێ! ئەمە ئەوپەڕی چێژ و خۆشیی زانایە لە دونیادا.

به (ئیبن ئەلموبارەك) وترا: ئەوە چیتە بۆ لەگەڵمان دانانیشیت؟ وتی: دەچم لەگەڵ هاوەڵان و شوێنکەوتووان دادەنیشم. مەبەستی ئەوەبوو دەچێ سەیری کتێبەکانی دەکات کە ژیانی ئەوانی تێدایە.

هەر کاتێ کەسی زانا تەنیایی و بێنیازی لە خەڵکی پێدرا ئەگەر تێگەیشتنێکی وای هەبوو کە بووە هۆی دانانی کتێب ئەوا خۆشی و چێژەکەی تێروتەواو بووە، ئەگەریش تێگەیشتنێکی پێدرا کە بەرزبۆوە بۆ مامەڵە و موناجاتی خودای هەق ئەوا بەر لە مردن چۆتە بەهەشتەوە.

لە خودا داواکارین: هیممەتێکی بەرزی وامان بداتێ بەرەو کەماڵ بەرزبینەوە و بۆ کارە چاکەکانیش یارمەتیمان بدات، ئەوانەی ڕێی هەقیان گرتووە تاکوتەران.

## ١٦٨- چەند وێستگەیەك لە ژیانی دانەر

سەرنجی حاڵوباری خەڵكم دا لە حاڵەتی بەرزیی پلەوپایەیان، دیتم زۆرینەی خەڵك لەم كاتەدا زیان و دۆڕانیان دەردەكەوێ، هەیانە لە دەمی لاوییدا لە تاوان و گوناه زێدەڕۆیی كردووە، هەیانە لە وەدەسهێنانی زانستدا كەمتەرخەمی نواندووە، هەیانە لە چێژوەرگرتن لە خۆشی و چێژەكان پێدرێژی زۆری كردووە... هەموویان لە كاتی پیریدا پەشیمانن ئەو كاتەی قەرەبووكردنەوەی گوناهەكانی پێشوو لەدەست چووە یان هێزوپێزیان نەماوە یان چاكەیان لەدەست چووە، ئیتر قۆناغی پیری هەر بە ئاخ و داخ و خەم بەسەردەبات، ئەگەر پیرەپیاو لە گوناهەكانی پێشووی وریا بووبێتەوە دەڵێ: حەیف و مخابن بۆ ئەو كارە بەدانەی كردمن! ئەگەریش وریابوونەوەی نەبێ ئەوا خەفەت بۆ لەدەسچوونی ئەو شتانە دەخوات كە خۆشی و چێژی لێ دەبینی.

بەڵام ئەوەی سەردەمی گەنجێتی لە زانستدا بەسەربردبێت ئەوا لە كاتی پیریدا بەری ڕەنجی دەدورێتەوە و خۆشحاڵ دەبێ و چێژ دەبینێ لە دانانی كتێب لەبارەی ئەو زانستانەی كۆی كردوونەتەوە و بەراورد بەو چێژانەی لە زانستی وەردەگرێ لەدەستدانی چێژەكانی جەستەی بەلاوە شتێكی وەها نییە، ئەمە لەگەڵ بوونی چێژەكانی لەو خواستنەی كە هیوای دەسكەوتنی داواكراوی هەیە، ڕەنگە ئەو كارانە خۆشتر بن لەوەی لێی وەدەست هاتووە هەروەك شاعیر وتوویە:

أهتز عند تمني وصلها طربا ورب أمنية أحلى من الظفر

له كاتی خۆزگەی گەیشتن پێی له خۆشییان خەنی دەبم، ڕەنگه خۆزگەیەك شیرینتر بێت له دەستکەوتن!

سەرنجی خۆم دا كه وێڕای عەشیرەتەكەم كه تەمەنی خۆیان لە وەدەسهێنانی دونیادا خەرج كرد و منیش تەمەنی لاوێتیم لە زانستخوازیدا بە خەرجدا، دیتم ئەوەی ئەوان بەدەستیان هێناوە لەدەستم نەچووە ئیللا شتێك نەبێ كه ئەگەر بۆم هاتەدی لەسەری پەشیمان ببمەوە.

پاشان سەرنجی حاڵی خۆم دا، دیتم ژیانی من له دونیادا له ژیانی ئەوان باشترە و پلەوپایەم لەنێو خەڵكدا له پلەوپایەی ئەوان بەرزترە و ئەوەی بەدەستم هێناوە لە زانست و زانیاری بەرەنگاری ناكرێ.

ئیبلیس پێی وتم: ماندووبوون و شەونخوونیی خۆت لەبیرچووەوە؟!

پێم وت: ئەی نەزان! دەستبڕین له كاتی دیتنی یوسفدا هیچ كاریگەری و ئێشێكی نییە، ئەگەر ڕێگایەك بتگەیەنێتە هاوڕێیەكت ئەوا هەر چەند دوور بێت درێژ نییە.

من لە كاتی زانستخوازیمدا ئەوەندە چێژم دەبینی كه ناخۆشی و چەرمەسەرییەكانم لەم پێناوەدا لە هەنگوین لەلام شیرینتر بوو، له كاتی منداڵیمدا چەند كولێرەیەكی وشكم لەگەڵ خۆمدا دەبرد و بۆ وەرگرتنی فەرمووده دەردەچووم و لەسەر ڕووباری عیسا دادەنیشتم، بە بێ ئاو نەمدەتوانی بیانخۆم، هەر پارووییەكم دەخوارد ئاوم

لەسەر دەکرد، چاوی هیممەتیشم جگە لە چێژی وەدەسهێنانی زانست چیتری نەدەبینی.

بەرهەمی ئەمە ئەوەبوو کە بەوە ناسرام گوێبیست و شارەزای زۆری فەرموودە و ژیان و ئەحواڵ و ئادابی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و ئەحواڵی هاوەڵان و شوێنکەوتووانم، لە ناسینی ڕێگاکەی وەکوو (ئیبن ئەجوەد)م لێ هات.

لەمەدا فێری مامەڵە و هەڵسوکەوتێکی وەها بووم کە بە زانست وەدەست نایەت تەنانەت لەبیرمە کە لە سەردەمی منداڵی و لاوێتی و زگورتی و حەزی پەرپندا توانای هەندێ شتم هەبوو کە نەفس وەکوو کەسی تینوو بۆ ئاوی سازگار پەرۆشی بوو، هیچ شتێك ڕێگری لێ نەکردم تەنها بەرهەمی زانست نەبێ کە ترسی خودای لە دڵدا ڕوواندم، ئەگەر ئەو هەلانە نەبێ کە هیچ مرۆڤێك لێی خاڵی نییە ئەوا دەترسام نەفسم تووشی خودسەرسامی بێت. بەلام خودای گەورە پاراستمی و فێری کردم و لە نهێنییەکانی زانست ئاگاداری کردم لەسەر ناسین و پەسندانی خەڵوەت لەگەڵی، تەنانەت ئەگەر (مەعرووفی کەرخی) و (بیشری حافی) لەلام بوونایە بە قەرەباڵغیم دەبینی. پاشان گەڕایەوە و لە کەمتەرخەمیدا نقومی کردم تا ئەوەی کەمترین خەڵکم لە خۆم پێ باشتر بوو. جارێك بۆ شەونوێژ و چێژی موناجاتی لە خەوی هەڵدەستاندم و کەرەتێکیش لەگەڵ ساغیی جەستەم لەوە بێبەشی دەکردم. ئەگەر مزگێنیی زانست نەبووایە بەوەی ئەمە جۆرێکە لە چاککردن و پەروەردەکردن ئەوا یان ئەوەتا لە کاتی کردەوەدا بەرەو خودسەرسامی دەچووم یان لە کاتی بێکاریدا بەرەو بێهیوایی دەڕۆیشتم. بەلام هیوام بە فەزڵی خودا یەکسان بوو بە ترس لێی.

هیوا و ئومێد بە هۆی بەهێزیی هۆکارەکانیەوە زاڵ دەبێ، چونکە من بینیم کە هەر لەو کاتەوەی منداڵ بووم خودا پەروەردەی کردم، بابم مرد و من هێشتا فامم نەبوو و داکیشم ئاوڕی لێ نەدامەوە و بایەخی پێ نەدام، خودا خۆشەویستیی زانست و زانینی لە سروشتمدا چاند و بەردەوام بەرەو شتی گرینگ و کەسی وەهای دەبردم کە ڕاستترینی فێردەکردم تا ئەوەی کاروبارم ڕاستەڕێ بوو، چەندان دوژمن بۆم هاتن و ئەو لێمی دوورخستنەوە، کە بینیم یارمەتی دام و بەرگری لێ کردم و پێی بەخشیم، بە هۆی ئەوەی لە ڕابردوودا بینیم ئومێدم بە داهاتووش بەهێز بوو، لە کۆڕەکانی زیکردا زیاتر لە (٢٠٠) دوو سەت هەزار کەس لەسەر دەستم تەوبەیان کردووە و هەروەها زیاتر لە دوو سەت کەسیش موسڵمان بووە، چەندان چاوی وشك کە هەرگیز فرمێسکێك بە چاویاندا نەهاتووە بە ئامۆژگاریی من گریاون..کەسێك کە ئەم نیعمەت بەسەردا ڕژانەی هەست پێ کردووە هەق وایە هیوای بە تەواوکردن هەبێ.

ڕەنگە هۆکارەکانی ترس بە ڕوانینم بۆ کەموکورتی و هەڵەکانم بێت. ڕۆژێکیان دانیشتم و زیاتر لە (١٠) دە هەزار کەسم لە دەوری خۆم دیت، ئەوانەی لەوێ بوون یان دڵیان نەرم ببوو یان فرمێسك بە چاویاندا هاتبووە خوارێ، بە نەفسی خۆم وت: چیت بەسەردێ ئەگەر ئەوان ڕزگاریان بوو و تۆش لەناوچوویت؟! بە زمانی ئەوینمەوە هاوارم کرد: خودا و گەورەم! ئەگەر سبەینێ بە سزا لەناوت بردم ئەوان لە سزاکەم ئاگادار مەکەوە لەبەر پاراستنی ڕێز و شکۆی تۆ نەك لەبەر خاتری من نەوەك بڵێن: خودا ئەو کەسەی سزادا کە بە خەڵکی ناساند.

خودایه! بیروباوەڕی باشیان لەبارەی منەوە بە هۆی بەخششی تۆوە بپارێزە بەوەی ئاگاداریان نەکەیت لە سزادانی ئەو کەسەی بۆتە ڕێنیشاندەریان بۆ لای تۆ.

خودایە ئەمە دوورە لە تۆ کە سازگارێك لێڵ بکەیت.

## ١٦٩- گرفتەکانی عیشق

لەو شتانەی لە کەسی ژیر ون و پەنهانە ئەوەیە کە پێی وایە هەر کاتێ ژنێکی لەلا نەبوو کە زۆری خۆشبوێت ئەوا دونیا تام و چێژی نییە، ئەگەر خۆشەویستێکیشی هێنایە بەرچاو و بە هی خۆی دانا ئەوا خەیاڵی چێژێکی گەورە دەکات، ئەگەریش یەکێکی لە کن بێت کە مەیلی بۆ نییە ئەوا خۆی بە بێبەش لە خۆشییەکانی دونیا دادەنێ!

ئەمەش شتێکی زۆر شاراوە و پەنهانە دەبێ ڕوون بکرێتەوە کە ئەوهایە: هەموو شتێك کە هی خۆت بێت لێی بێزار دەبیت و، هەر کاتێ مرۆڤ ئەوەی دەست کەوت کە ئارەزووی لێیەتی ئەوا لێی بێزار دەبێت و ڕوو دەکاتە غەیری وی: جارێك لەبەر دەرکەوتنی ئەو نەنگی و خەوشانەی کە بە هۆی تێکەڵبوونەوە ئاشکرا دەبێ، دانایان وتوویانە: عیشق چاو لە ئاستی خەوشەکانی خۆشەویست کوێر دەکات. کەرەتێکیش لەبەرئەوەی هی خۆیەتی و دەسەڵاتی بەسەردا هەیە، نەفسیش هەمیشە چاوی لەو شتانەیە کە نیەتی و دەسەڵاتی بەسەردا نییە.

پاشان ئەگەر بەردەوامبوونی خۆشەویستیمان لەگەڵ تواناداریدا خەملاند ئەوا ئەمە دەبێت بەڵام بە ئەندازەی توانایەکە ناتەواو دەبێ، بەڵکوو تاوانکردنی خۆشەویست بەهێزی دەکات، تاوانکردنەکەشی وەکوو ملنەدان وایە یان ملنەدانی بە ڕازیبوون.

ئەگەر ساف و سازگار و بێ کێشە بوو ئەوا هەر هەندێ لێڵی و گرفتی دەبێت: وەکوو ترس و وریایی لێی و کەم مەیلی بۆ ئەم عاشقە، ڕەنگە بەزۆر خۆی لێ نزیك بخاتەوە و مرۆڤیش بە کەم مەیلی خۆشەویستەکەی دەزانێ ئیتر بێتاقەت و وەڕس دەبێ.

ئەگەر ترسا لەوەی ناپاکی لێ بکات ئەوا پێویستی بە چاودێری هەیە، بەوەش خەم و تاڵی زیاتر و بەهێزتر دەبێ.

باشترین پلە و ئاست مامناوەندێتییە کە بریتییە لە هەڵبژاردنی ئەوەی نەفس ئارەزووی دەکات و مەیلی بۆ هەیە و ناگاتە پایەی عیشق، چونکە عاشق لە ئازاردایە، ئەو کەسەی خاڵییە لە عیشق وا خەیاڵ دەکات عاشق چێژ دەبینێ بەڵام وەها نییە، ئەو بەم جۆرەیە کە لەم شیعرەی (ابن درید الازدی)دا هاتووە:

وَما فِي الأَرْضِ أَشقىٰ مِن مُحِبٍّ ... وَإِنْ وَجَدَ الهَوىٰ حُلْوَ المَذاقِ

تَراهُ باكِياً فِي كُلِّ وَقتٍ ... مَخافَةَ فُرقَةٍ أَو لِاشْتِياقِ

فَيَبكِي إِنْ نَأَوا شَوقاً إِلَيهِم ... وَيَبكِي إِنْ دَنَوا خَوفَ الفِراقِ

فَتَسخَنُ عَينُهُ عِندَ التَنائِي ... وَتَسخَنُ عَينُهُ عِندَ التَلاقِي

لە زەویدا کەسێك نییە لە ئاشق بەدبەختتر و چارەڕەشتر تەنانەت ئەگەر ئەوینەکەشی شیرین و خۆش بێت! لە ترسی دابڕان یان لە پەرۆشییان دەبینی هەمیشە چاو بە گریانە، ئەگەر خۆشەویستەکەی دوورکەوتەوە لە پەرۆشییان بۆی دەگری، ئەگەریش نزیك کەوتەوە لە ترسی دابڕان دەگرییێت، لە کاتی نزیك بوونەوە چاوی گەرم دادێ و لە کاتی دابڕانیش هەر چاوی لە تاوی دوورکەوتنەوە گەرم دادێ!

## ١٧٠- جیاوازیی خەڵك لە هیممەتبەرزیدا

مرۆڤ هەرگیز بە گەورەتر لە هیممەتبەرزی بە هیچ شتێکی تر گرفتار نەبووە، چونکە هەر کەسیٚ هیممەتی بەرز بوو بڵندایییەکان هەڵدەبژێریٚ، ڕەنگە زەمان یارمەتی نەدات و بارودۆخی لاواز بێت، ئیتر لە ئازاردا دەمێنێتەوە.

من شتێکم لە هیممەتبەرزی پێدراوە و بە هۆیەوە لە ئازاردام، ناڵێم: خۆزگە نەبووایە، چونکە ژیان بە ئەندازەی نەبوونی عەقڵ شیرین و خۆش دەبیٚ، کەسی عاقڵیش بە کەمیی عەقڵ چێژی زیاد هەڵنابژێریٚ.

سەرنجم دایە خەڵکێك کە باسی هیممەتبەرزیی خۆیان دەکرد دیتم هەر لە یەك هونەردا بوو و بایەخیان بەو کەموکورتییە نەدەدا کە لە گرینگتر لەو هەیانبوو: (الشريف الرضي) وتوویە:

ولكلِّ جسمٍ في النحولِ بليةٌ      وبلاءُ جسمي من تفاوتِ همتي

هەموو جەستەیەك لە لاوازییدا بەڵا و گرفتێکی هەیە، بەڵای جەستەی من لەوەدایە کە هیممەتی جیاواز و جۆراوجۆرم هەیە.

سەیرم کرد دیتم ئەوپەڕی ئاواتی دەسەڵات و ئەمیرایەتییە.

(ئەبوو موسلیم خوراسانی) لە هەرەتی لاویدا زۆر بەکەمی دەنووست، لەم بارەوە پرسیاری لێ کرا؟ وتی: زەینێکی ساف و خەمێکی دوور و نەفسێکم هەیە کە پەرۆشی کارە بڵند و بەرزەکانە، لەگەڵ ژیانێك وەکوو ژیانی گەجەر و گوجەران! وترا: چ شتێك تینوێتییت دەشکێنێ؟ وتی: دەسکەوتنی پاشایەتی. وترا: بیخوازە. وتی: بە مەترسی نەبێ ناخوازرێ. وترا: سواری مەترسییەکان بە. وتی: عەقڵ رێگرە. وترا: ئەی چی دەکەیت؟ وتی: عەقڵم دەکەمە نەفامی و بە هۆیەوە هەوڵی کارێکی مەترسیدار دەدەم کە بە نەفامی نەبێ نایەتەدی و بە عەقڵ پلان و تەگبیر دەکەم کە بەو نەبێ ناپارێزرێ، بەڕاستی سستی و خاوی برای نەبوونە.

سەیری حاڵی ئەم داماوەم کرد دیتم گرینگترین شتەکانی بەفیڕۆ داوە کە بریتییە لە لایەنی ئاخیرەت و لە پێناو وەدەسهێنانی دەسەڵاتداری هەستاوە و قیت وەستاوە، چەندان کەسی کوشت و ماڵوێران کرد تا هەندێ لە مەبەستەکانی لە خۆشییەکانی دونیا وەدەستهێنا! پاشان تەنها هەشتساڵ خۆشی دیت و تیرۆر کرا و تەگبیری عەقڵی بیرچوویەوە، کوژرا و لەسەر ناشیرینترین حاڵ بەرەو ئاخیرەت ڕۆیشت.

(المتنبي) شاعیر دەیوت:

وَفِي النَاسِ مَنْ يَرضَى بِمَيسورِ عَيْشِهِ وَمَرْكوبُهُ رِجلاهُ وَالثَوبُ جِلدُهُ

وَلَكِنَّ قَلباً بَينَ جَنبَيَّ مالَهُ مَدىً يَنتَهي بي في مُرادٍ أَحُدُّهُ

يَرى جِسمَهُ يُكسى شُفوفاً تَرُبُّهُ فَيَختارُ أَن يُكسى دُروعاً تَهُدُّهُ

خەڵکی وا هەیە کە ئەوەندە هیممەتنزمە بە ژیانێکی سووك و سانا ڕازییە و ئەسپی بەزینی پێیەکانیەتی و جلکی بەری پێستەکەیەتی واتە ڕووت و ڕەجاڵە، بەڵام من دڵێکم لەناو سینگدایە کە سنوور نازانێ و ئەو دڵەم بە جلکی نەرم و ناسك ڕازی نییە دەیەوێ قەڵغانی پتەو و قورس لەبەرکەم و بەرەو بەرزایی بڕۆم!

سەرنجی ئەمەشم دا دیتم هیوا و هەوڵی ئەویش تەنها بە دونیاوە بەستراوە.

سەیری هیممەتبەرزیی خۆم کرد سەیروسەمەرەم دیت! لەبەرئەوەی من ئەوەندە خوازیاری زانستم کە دڵنیام پێی ناگەم چونکە من حەز دەکەم هەموو هونەر و جۆرەکانی زانست بەدەست بێنم و لە وردەکاری هەموو هونەرێك بکۆڵمەوە! ئەمەش کارێکە تەمەن بەشی هەندێکیشی ناکات نەك هەمووی.

ئەگەر کەسێکی خاوەن هیممەت لە هونەرێکدا ببینم کە گەیشتبێتە ئەوپەڕی ئەوا دەبینم لە هونەرێکی تردا ناتەواوە و هیممەتەکەی بە تێروتەواو دانانێم، وەکوو فەرموودەناس کە فیقهی لەدەست چووە، فەقیهیش فەرموودەزانی لەدەست چووە، پێم وایە ڕازیبوون بە کەموکورتی زانستەکان بە هۆی ناتەواوی و کەمیی هیممەتەوەیە.

پاشان من گەرەکمە ئەوپەڕی کار بە زانست بکەم، پەرۆشی وەڕەعی بیشری حافی و زوهدی مەعرووفی کەرخییم! ئەمەش لەگەڵ خوێندنەوەی کتێبان و سوودگەیاندن بە خەڵك و دووری و دۆستی!

پاشان من دەمەوێ لە خەڵك بێنیاز بم و ئاواتمە چاكەیان لەگەڵ بكەم! سەرقاڵبوون بە زانستیش ڕێگرە لە ئیشكردن و پارە پەیداكردن و، قەبووڵكردنی بەخشش و منەتەكانیش هیممەتی بەرز پێی ڕازی نییە.

پاشان من پەروەردەی منداڵ خستنەوەم هەروەك پەرۆشی دانانی كتێبانم تاوەكوو منداڵ و كتێب دوای مردنم ببنە جێگرەوەم! خواستنی ئەمانەش ئەو دڵەی حەزی لە تەنیایی و یەكلابوونەوەیە سەرقاڵ دەكات.

پاشان من دەمەوێ چێژ لە شتە جوانەكان وەربگرم! بەڵام كەمیی پارە و سامان ڕێگرە لەوە، پاشان ئەگەر بێتەدیش ئەوا هیممەتجەمی پەرت دەكات.

هەروەها بۆ جەستەم خواردن و خواردنەوەی باشم دەوێت، چونكە جەستە دەقی گرتووە بە خۆشی و نیانی! بەڵام كەمیی پارە ڕێگرە.

هەموو ئەوانە كۆكردنەوەی نێوان دژەكانە.

من لە كوێ و حاڵی ئەوانە لە كوێ كە ئەوپەڕی خەم و هەوڵی دونیایە هەروەك وەسفم كرد، من حەز ناكەم بە هیچ هۆكارێك وەدەسهێنانی شتێكی دونیا ڕووی دینم بڕووشێنێ و كار بكاتە سەر زانین و كردەوەم.

ئای چەند نیگەران و دڵەڕاوكەمە لە شەوبێداری و هێنانەدی وەرەع، لەگەڵ دووبارەكردنەوەی زانست و سەرقاڵبوونی دڵ بە كتێبان و وەدەسهێنانی ئەو خۆراكانەی بۆ جەستە گونجاون! مخابن بۆ ئەو موناجاتەی لە تەنیاییدا لە دەستم

دەچێ لەگەڵ دیداری خەڵك و فێركردنیان! ئای لە شێلوو كردنی وەڕەع لەگەڵ خواستنی ئەو شتەی بۆ خێزان پێویستە!

بەڵام من تەسلیمی ئازاردانم بووم و، ڕەنگە چاكبوون و پەروەردەبوونم لە ئازاردانم بێت، چونكە هیممەتبەرزی پێویستی بەو بڵندخوازییانە هەیە كە لە خودای هەق نزیكت دەخەنەوە.

ڕەنگە سەرگەردانی لە خواستن ڕێنیشاندەرێك بێت بۆ مەبەست و ئامانج. ئا ئەوەتا من هەناسەكانم دەپارێزم لەوەی هەناسەیەكم بێسوود بڕوات. ئەگەر خەم و هیممەتم گەیشتە ئامانجەكەی باشە وەگەرنا نییەت و نیازی ئیماندار لە كردەوەی باشتر و كاریگەرترە.

## ١٧١- ڕەچاوکردنی مافی نەفس

کاتیٚ بەشی پیٚشـووم نووسـی، پـیٚم بـاش بـوو هەنـدیٚ شـت بـەبیر نـەفس بیٚنمـەوە ئەویش ئەوەیە کە دەبیٚ ئاگامان لە نەفس بیٚت و نەرم و نیان بین لەگەڵیـدا و بـاری قورس نەکەین چونکە کەسیٚ بیەویٚ دوو قۆناغەڕیٚ بە یەك قۆنـاغ بـبڕیٚ ئـەوا پـەکی دەکەویٚ و ناتوانیٚ بەردەوام بیٚت، پیٚویستە ڕیٚگا بە نەرمترین شیٚوە کە لە توانادایـە ببڕیٚ، ئەگەر باربەرەکان ماندوو بوون لاوکبیٚژ گۆرانییـان بـۆ دەڵـیٚ. پشـوودانیٚك بـۆ ئەوەی توانا و وزەت وەبەربیٚتەوە زۆر گرینگە، چوونی مەلەوان بۆ قولاییی دەریا بۆ دەسکەوتنی مـرواری بەرزبوونەوەیـە و بـەردەوام ڕۆیشـتن وشـتر شـەکەت و مانـدوو دەکات و بڕینی بیابان و چۆڵەوانیش سەختە.

هەرکەسیٚ بیەویٚ نەرمونیانی بە نەفس ببینیٚ با سەیری ژیاننامەی پیٚغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بکات، ئەو ئاگای لە نەفسی خۆی بوو و لەگەڵی نەرم بـوو و گاڵتـەی دەکـرد و تیٚکـەڵی ژنـان دەبـوو و ماچـی دەکـرد و زمـانی دەمـژی و شـتی جـوانی هەڵدەبژارد و ئاوی شیرینی دەخواردەوە و ئاوی سـارد و خـواردنی باشـی دەخـوارد وەکوو گۆشتی پشت و قۆڵ و شیرینی.

هەموو ئەمانە نەرم و نیانییە بەو جەستەیەی ڕیٚی پیٚ دەکەیت، بەڵام ئەوەی ئازاری بدات ئەوا ناتوانیٚ ڕیٚی پیٚ بکات و تا سەر بەردەوام بیٚت، پیٚغەمبەر (صلی الله علیـە

وسلم) فەرموویەتی: ((ئەم دینە پتەوە، بەنەرمی بڕۆنە ناویەوە، چونکە کەسی توندئاژۆ ناتوانێ تا سەر بەردەوام بێت و خۆی و ئەوەی لەگەڵیەتی لەناودەبات.)).

بزانە پێویستە کەسی ژێر نەفسی خۆی دەسخەڕۆ بکات و بە هەڵەیدا ببات لەو خەوشانەی عەقڵ دەیاندۆزێتەوە! بیری بەئاگا بەر لە نزیکبوونەوەی لە ژن وا بیردەکاتەوە کە جووتبوون بریتییە لە ئامێزگرتنی جەستەیەك کە پیس و پۆخڵی لەخۆگرتووە، وە بەر لەوەی پاروو قوت بدات وا بیر دەکاتەوە کە لەناو لیکی دەمدا گەوزەگەوزیەتی کە ئەگەر زمان دەری بێنێ فرێی دەدات چونکە قێزی لێ دەبێتەوە! وە ئەگەر بیر لە نزیکبوونەوەی مردن و ڕووداوەکانی دوای مردن بکاتەوە ئەوا چێژ و خۆشییەکانی ئێستاشی لەلا بێزراو دەبێ! بۆیە دەبێ مرۆڤ هەندێ کات خۆی بەهەڵەدا ببات تاوەکوو سوود لە ژیانی وەربگرێت. هەروەکوو (لەبید کوڕی ڕەبیعە) وتوویە:

واكْذِبِ النَّفسَ إذا حَدَّثتَهَا    إنّ صدقَ النفسِ يُزري بالأملِ

مەبەستی ئەوەیە ئەگەر ویستت کارێك بکەیت بەگوێی نەفس مەکە کە خاوت دەکاتەوە و دەتترسێنێ، چونکە بڕواکردن بە گومان و نیگەرانییەکانی نەفس هیوا و ئومێدت لەناودەبات..

(ئەبولفەتح ئەلبوستی) وتوویە:

أفدْ طبعَكَ المَكدودَ بالجدِّ راحةً — يجُمُّ وَعلِّلهُ بشيءٍ منَ المَزحِ

ولكنْ إذا أعطيتهُ المَزحَ فليَكنْ — بمقدارِ ما تُعطي الطَّعامَ منَ المِلحِ

پشوویەك بە دەروونی ماندووت بدە و بە شتێك لە گاڵتە و خۆشی ئاسوودەی بكە بەڵام ئەوەش با بە قەدەر خوێی چێشت بێت(هەموو شتێك بە خوێ، خوێش بە مانا).

هەروەها (ئەبوو عەلی كوڕی ئەلشیبل) وتوویەتی:

وإذا همّت فناج نفسك بالمنى — وعدًا فخيرات الجنان عدات

واجعل رجاءك دون يأسك جنة — حتى تزول بهمك الأوقات

واستر عن الجلساء بثك إنما — جلساؤك الحساد والشمات

ودع التوقع للحوادث إنه — للحي من قبل الممات ممات

فالهم ليس له ثبات مثلما — في أهله ما للسرور ثبات

لولا مغالطة النفوس عقولها — لم تصف للمتيقظين حياة

خەمی دەروونت بە بەڵێنی خۆش برەوێنەوە و ئومێدت بكە قەڵغان بە ڕووی بێهیواییدا تاوەكوو بە تێپەڕبوونی كات خەمەكانت بڕۆن..خەمەكانت لە هاونشینانت بشارەوە چونكە هەندێ كەس هەن حەسوودن و بە خەمەكانت دڵخۆش دەبن..

ئەوەندە پێشبینی ڕووداوی ناخۆش مەکە چونکە ژیان لە چاوەڕوانیدا مردنە، خۆشی و ناخۆشی هەتاهەتایی نین و دێن و دەڕۆن..

پێشینان بە گشتی مووی سپییان بۆیاغ دەکرد نەوەك خەڵك شتێکی وایان پێوە ببینێ کە کرێت بێت، ئەگەرچی بۆیاغکردنی سەروپرچ نابێتە هۆی ئەوەی نەفس بەوە نەزانێ بەڵام جۆرێکە لە هەڵخەڵەتاندنی نەفس چونکە نەفس ڕووالەت دەبینێ و فیکر و عەقڵیش لەگەڵ غائیبدان، بۆیە دەبێ بەهەڵەدابردن و دەسخەڕۆکردنێك بکرێ تاوەکوو ژیان بکرێت، ئەگەر زانا بەپێی هیواکورتی کاری کردبایە ئەوا هیچ زانستێکی نەدەنووسیەوە و کتێبێکیشی دانەدەنا.

ئەم بەشە لەگەڵ ئەوەی پێشوو باش تێ بگە، هی یەکەم لە پایەی عەزیمەتدایە و ئەمەش لە شوێنی ڕوخسەت، بۆ هەر ماندووبوونێك دەبێ پشوودانێك هەبێ، خوای گەورەش بە ئەندازەی ڕاستگۆیی خواست و هێزی پەنابردن و داڕنینی هێز و توانا لەگەڵتدایە و هەر ئەویش یارمەتیدەرە.

## ١٧٢- ڕێکخستنی کاروباری دونیا و وەدەسهێنانی زانست

کۆڵەکەی ژیانی بنیادەم بە دوو شتەوەیە: گەرمی و شێداری (ئەمە قسەی کۆنە کە لە یۆنانەکانەوە وەرگیراوە و ئێستا باوی نەماوە).

کاری گەرمی ئەوەیە کە شێداری (تەڕی) شی بکاتەوە و لەناوی ببات، ئادەمیزاد پێویستی بە وەدەسهێنانی جێگرەوەیەکە بۆ شتە شیبۆوەکە.

جەستەی منداڵ زیاتر لە شیبوونەوە خۆراك وەردەگرێ، جەستەی تەواو بە ئەندازەی شیبوونەوە خواردن وەردەگرێ، ئەو جەستانەی بەرەو پیرین زیاتر لە خۆراك وەرگرتن شیدەبنەوە.

پێویستە تازە پێگەیشتوو خۆ لە پەڕین (سەرجێی) بپارێزێ چونکە بەمە بنچینەیەکی هێز دادەمەزرێنێ کە لە پیریدا هەست بە شوێنەوارەکەی دەکات.

بەڵام مامناوەند و لە تەمەن(گەشە) وەستاو پێویستە وریای زیادە پەڕین بێت، ئەگەر وزە و بەکارهێنانی وزەی وەکیەك بوو و زیادەڕەوی لە بەکارهێنان کرد ئەوا لە دەسکەوتی وزەی دەڕوات و نزیکە لەوەی بەخێرایی وزەی نەمێنێ.

سەبارەت بە کەسی پیریش ئەوا وازهێنـان لـە پـەڕین وەکـوو پێویست وایـە بـۆی، بەتایبـەتی ئەگـەر تەمـەنی زیـاد هەڵکشـا چـونکە لـەم حاڵەتـەدا لـەو جەوهـەر و ناوەڕۆکەی خەرج دەکات کە هەرگیز هاوشێوەی دەست ناکەوێتەوە.

پاشان کەسی ژیر پێویستە سەیری ماڵ و داراییەکەی بکـات، زیـاتر لـە خـەرجکردن پارە دەست بخات بۆ ئـەوەی زیادەکـە بـۆ کـاتی پەککەوتـەیی پاشـەکەوت بکـات و دەبێ وریای دەسبڵاوی بێت، چونکە دادپەروەری و ڕاستوڕێکی باشترینە.

پاشان بڕوانێتە هاوسەرەکەی و داواکراو لێی دوو شتە: بوونی منداڵ و بـەڕێوەبردنی ماڵ، ئەگەر دەسبڵاو و بڕێژ بڕێژ بوو ئەوا ئەمە خەوشێکە بەرگەی ناگیرێ و قەبووڵ نەکراوە، ئەگەر سیفەتی نەزۆکیشی هاتەپاڵ ئەوا هیچ هۆکارێك نییە بـۆ هێشـتنەوە و دەسـت پێـوەگرتنی مەگـەر جـوان بێـت، ئەگـەر هـۆش و پاکـداوێنی هاتـە پـاڵ جوانییەکەیەوە ئەوا هێشتنەوەی باشە، ئەگـەریش لـە ڕەفتاریـدا شـتێك هـەبوو کـە دەبوو چاودێری بکرێ ئەوا وازلێهێنانی پێویستە.

با بەرانبەر هاوسەرەکەی سام و هەیبەتی خۆی بپارێزێ و لە ماڵ و داهاتی ئاگاداری نەکات چونکە ئەگەر ژن بە پارەوپووڵی پیاو بزانێت داوای زۆر خەرجی دەکات.

سەبارەت بە منداڵانیش دەبێ بیانپارێزێ لە تێکەڵبوونێك کە ببێتە مایەی خراپبوون و تێکچوونیان. هەر کاتێ منداڵ مەرد و ڕەنـد و بەشـەرم و شـکۆ بـوو ئـەوا جێگـای ئومێدە و چاکەی لێ ڕەچاو دەکرێ. بـا هـانی منداڵـەکانی بـدات هاوڕێیـەتی پیـاوی بەڕێز و زانا بکەن و ئاگادار بکرێنەوە لە برادەرایـەتیی نـەفام و گەمـژەکان، چـونکە

سروشتی مرۆڤ خووڕەوشت لە یەکتر وەردەگریٚ (کەری لە کن کەری ببەستیەوە، ڕەنگی هەڵنەگریٚ سوخەتی هەڵدەگریٚت). دەبیٚ منداڵ زۆرباش ئاگادار بکریٚتەوە لە درۆکردن و ئامۆژگاری بکات لەگەڵ دایکوباوکی باش بیٚت. کە پیٚگەیشت و گەورە بوو کچیٚکی بۆ بخوازن هەردووکیان سوود وەردەگرن.

ئەمانە هەمووی ئامازە بوون بۆ ڕیٚکخستنی کاروباری دونیا.

سەبارەت بە ڕیٚکخستنی کاروباری زانین و زانستەوە ئەوا پیٚویستە منداڵ لە تەمەنی پیٚنج ساڵیەوە بخریٚتە بەر خویٚندن و فیٚری قورئان و فیقه و فەرموودە بکریٚ و زیاتر شتی پیٚ لەبەر بکریٚ وەك لەوەی شتی بەگویٚدا بدریٚ چونکە سەردەمی لەبەرکردن تا پازدە ساڵی گونجاوە، کە پیٚگەیشت ئەوا هیممەت و هەوڵی پەرش و بڵاو دەبیٚت.

یەکەم ئەرك بیدریٚتیٚ لەبەرکردنی قورئانە بەوردی و بەجوانی، چونکە لەم تەمەنەدا باش لە میٚشکی دەچەسپیٚ و تیٚکەڵی خویٚن و گۆشتی دەبیٚ، پاشان پیٚشەکییەك لەبارەی نەحو (ڕیٚزمانی زمانی عەرەبی) پاشان فیقه، ئەگەر دوای ئەمانە توانی زانستی تر لەبەر بکات ئەوا باشە.

(ئەمە خویٚندنی جاران بوو کە تەنها خویٚندنی مزگەوت و ئاینی هەبوو و بەم شیٚوە کلاسیکییە دەوتراوە بەڵام شیٚوازی خویٚندنی ئاینی و مۆدیٚرن ئیٚستا گۆڕاوە و پیٚشکەوتووترە بۆیە ناکریٚ ئەم بەرنامەیە لە ئیٚستادا جیٚبەجیٚ بکریٚ).

## ١٧٣- واوەیلا بۆ کەسی کەمتەرخەم

سەرەتای ساڵی ٥٧٥ی کۆچی گرانی لە بەغدا زۆر توند بوو، هەر کە جۆ دەهات نرخی زیاد دەبوو، خەڵك ملیان لە کڕینی خۆراك دەنا.

ئەو کەسە شادمان بوو کە هەموو ساڵێك ئەوەی دەچاند کە دەیخوارد و پێی دەژیا و، ئەو کەسەش دڵخۆش بوو کە سەرەتای نیسان خواردنی دەکڕی بەر لەوەی نرخی دووقات ببێتەوە، هەزارانیش ئەوەی لە ماڵەوە هەیانبوو لە بازاڕ هەرزانفرۆشیان کرد و زۆر کەسی شکۆمەند زەلیل بوو.

وتم: ئەی نەفس! لەم حاڵە ئاماژەیەك وەرگرە: ئەو کەسەی کاری باشی هەیە لە کاتی پێویستیدا دڵخۆش دەبێ و کەسێکیش لە کاتی پرسیاردا وەڵامی پێ بێت شادمان دەبێت، هەموو واوەیلایەك بۆ ئەو کەمتەرخەمەیە کە سەیری سەرەنجامەکەی ناکات! وریابە، خەڵکێکت لە دونیا سەبارەت بە ئاخیرەت ئاگادار کردۆتەوە! ماتووڵ گیانت لە جەستەدایە دەست بکە بە وەرزی چاندن، کات هەمووی مانگی تشرینە بۆ چاندن بەر لەوەی مانگی نیسانی خەرمان دابێت و تۆش هیچ بەروبوومێکت نەبێ، پێویستیی ئەوانەی ئاتاجی ماڵەکانیانن ڕێگرییان لێ دەکات لە باوەدان و دابینکردنی پێویستیی کەسانی تر (ایثار).

## ١٧٤- دڵەڕاوكەیەك

سەرنجی حاڵەتێكم دا چارسی كردم ئەویش ئەوەیە: پیاو هەموو شتێكی جوان لەگەڵ ژنەكەی دەكات و ئەویش خۆشی ناوێت! هەروەها لەگەڵ هاوڕێكەشی وەها دەكات و ئەویش ڕقی لێیەتی! بە هەموو ئەوەی لە توانایدایە لە دەسەڵاتدار نزیك دەبێتەوە و ئەویش ڕووی تێ ناكات و بایەخی پێ نادات، ئیتر سەرسام و سەرگەردان دەمێنێتەوە و دەڵێ: چی بكەم و چارم چییە؟!

ترسام لەگەڵ خوای گەورەش ئەمە حاڵەتم بێت! لێی نزیك دەبمەوە و نایەوێم، ڕەنگە هەر لە ئەزەلەوە بە بەدبەخت ناوی نووسیبم!

(حەسەنی بەصری)ش هەر لەمە دەترسا، وتوویەتی: دەترسم خوای گەورە ئاگاداری هەندێ گوناهم بووبێت و وتبێتی: ئیتر لێت خۆش نابم!

ئیتر جگە لە نیگەرانی و ترس هیچ شتێكی ترم نییە، ڕەنگە تەنها ئەو ڕۆژە ئەرخەیان بم كە كەشتیی ئومێد بەسەلامەتی دەگاتە كەنار و لەنگەر دەگرێ!

## ١٧٥- لەبارەی ژمارەی فەرموودەکانی پێغەمبەرەوە ﷺ

مشـتومڕێك لـەنێوان مـن و فەرموودەزانێکـەوە ڕوویـدا لـەبارەی قسـەیەکی ئیمـامی ئەحمەدەوە کە وتوویەتی: حەفت سـەت هـەزار فـەرموودەی ڕاسـت لـە پێغەمبـەری خواوە (صلی الله علیە وسـلم) هـاتووە.. پـێم وت: مەبەسـتی لـەم قسـەیە ڕێیەکانـە (الطرق) (واتە ئەو کەسانەی فەرموودەکەیان گێڕاوەتەوە کە لـە زاراوەی فـەرموودە پێی دەوترێ سەنەد) . وتی: نا، بەڵکوو مەبەسـت دەقەکانـە (المتـون)! وتم: ئەمـە دوورە لە باوەڕکردن.

پاشان قسەیەکی (عەبدوڵڵای ئەلحاکم)م بینی پاڵپشتی قسەی ئەم کەسە دەکات کە لە کتێبی (المدخل إلی کتاب الاکلیل) وتوویـەتی: چـۆن جـائیزە بـوترێ فـەرموودەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) ناگاتە دە هەزار فەرموودە لە کاتێکدا چـوار هەزار ژن و پیاو لە هاوەڵانی لێیان گێڕاوەتەوە کە بیسـت سـاڵ زیـاتر لـە مەککـە و مەدینە هاوەڵێتییان کردووە، قسە و کردەوە و نووستن و بێداری و جموجۆڵەکانیان پاراسـتووە و لەبـەرکردووە، جگـە لـە لەبـەرکردنی ئـەحکامی شـەریعەت؟! قسـەی ئیمامی ئەحمەدی کردۆتـە بەڵگـە کـە وتوویـەتی: حـەفت سـەت هـەزار فـەرموودە و شتێك لە پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) گێڕدراوەتەوە. (ئیسحاق کـوڕی ڕاهەویـە) حەفتا هەزار فەرموودەی لەبەر دەوت، (ئەبالعەباس کوڕی عوقدە) وتوویـەتی: سـێ

سەت هەزار فەرموودەی ئەهلی بەیتم لەبەرە. هەروەها وتوویە: سێ سەت هەزار فەرموودە بۆ (ئیبن کورەیب) لە کوفە دەرکەوتووە.

وتم: ناکرێ ئەمە ئاماژە بێت بۆ دەقەکان (المتون). سەیرم پێ دێ چۆن ئەمە لە (ئەلحاکم) شاراوەتەوە کە دەزانێ هەموو (مسانید)ە دیارەکانی (مسند أحمد بن حنبل) کە دوو جار هەموو دونیا گەڕاوە تا دەستی خستووە چل هەزار فەرموودەیە کە دە هەزاریان دووبارەیە.

(حەنبەلی کوڕی ئیسحاق) وتوویەتی: ئەحمەدی کوڕی حەنبەل، من و صالح و عەبدوڵڵای کۆکردەوە و (المسند)ی بەسەردا خوێندینەوە و پێی وتین: ئەم کتێبەم لە زیاتر لە سەت و پەنجا هەزار فەرموودە کۆکردۆتەوە، موسڵمانان لە هەر فەرموودەیەکی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) جیاوازییان لێ پەیدابوو بۆی بگەڕێنەوە (واتە بۆ مسند)، ئەگەر لەوێ دیتتانەوە ئەوا باشە وەگەرنا بزانن بەڵگە (حجة) نییە.(ئەم قسەیە ڕێژەییە چونکە زۆر فەرموودە هەیە کە لە (مسند)ی ئیمام ئەحمەددا نییە و لە کتێبەکانی تری فەرموودەدا هەیە).

ئایا لە کەسی وریا ئەوە شاراوەیە کە مەبەستی لەوەی کە لە حەفت سەت هەزار کۆی کردۆتەوە مەبەستی ڕێیەکانە(الطرق)؟! چونکە ئەگەر حەفت سەت هەزار قسەی پێغەمبەری خوا (صلی علیه وسلم) بووبێت چۆن پشتگوێی خستووە؟!

ئەگەر وترا: ئیمام لە (مسند)ەکەیدا شتی لاوازیشی هێناوە، پاشان پەنا بە خوا کە لە حەفت سەت هەزار تەنها سی هەزاری تەحقیق کرابێت! چۆن ئەم گشتە ون

بووه؟! بۆچی پشتگوێ خراوه كه هەمووشی گەیشتۆته سەردەمی ئیمامی ئەحمەد، لێیانی هەڵبژاردووه و ئەوانیتریشی بەلاوەناوه؟! فەرموودەناسان هەموو شتێكیان له هەڵبەستراو و درۆش نووسیوەتەوه.

هەروەها ئەبوو داوود وتوویەتی: كتێبی (السنن)م له شەش سەت هەزار فەرموودەوه كۆكردۆتەوه.

باش نییه بوترێ: ئەو هاوەڵانەی گێڕایتیانەوه مردوون و بۆ شوێنكەوتووانیان (التابعین) باس نەكردووه، چونكه شتەكه گەیشتۆته ئیمامی ئەحمەد و حەفت سەت هەزار فەرموودەی ژماردووه، نەدەبوو شتەكه ئەوها بەزوویی بڕوات!

ئاشكرایه ئەگەر هەموو صەحیح و هەڵبەستراو و هەموو گواستراوەیەك له پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) كۆكرابایەوه ئەوا نەدەگەیشته پەنجا هەزار! ئەی كوا ئەوانیتر؟!

جائیز نییه بوترێ: ئەم فەرموودانه قسەی شوێنكەوتووان (التابعین)، چونكه زانایان ڕێبازەكانی ئەوانیان گواستۆتەوه و نووسیوەتەوه و دەستیان پێوه گرتووه و هیچ ڕێیەك بۆ وازلێهێنانی نییه!

هەموو هۆشمەندێك تێگەیشت كه بابەتەكه ئاماژەیه بۆ ڕێیەكان (الطرق) و ئەو وەهمەی (ئەلحاكم) ناتەواو و ناڕاسته، ئەگەر ئەم ڕەخنەیەی پیشان بدرێ و پێی بوترێ: كوا ئەوانیتر؟! هیچ وەڵامێكی نابێت. بەڵام تێگەیشتن سەخته و هەر خوای گەوره سەركەوتن دەبەخشێ.

نموونەی ئەمە بێئاگاییی خەڵکێکە وتوویانە: بوخاری هەموو ئەو فەرموودانەی نەگێڕاوەتەوە کە پێی ڕاست بووە بەڵکوو ئەوەی گێڕایتیەوە وەکوو نموونەیەکە وەگەرنا کتێبەکەی درێژ دەبوو. (ئەبووبەکر ئەلئیسماعیلی)ش قسەیەکی وەهای کردووە و لە بوخاری گێڕاوەتەوە کە وتوویە: ئەو فەرموودە ڕاستانەی وازم لێ هێناون زیاترە.

مەبەستی ڕێیەکانە (الطرق). بەڵگەی ئەو قسەیەشم ئەوەیە کە (الدار قطنی) کە گەورەی فەرموودەناسەکانە ئەوەی کۆکردۆتەوە کە دەبوو بوخاری و موسلیم بیانگێڕابایەوە، ئەوەی ئەوان باسیان نەکردووە چەند فەرموودەیەکی کەمە، ئەگەر بەو شێوەیە بووایە کە وتوویانە ئەوا چەندان بەرگی کتێب فەرموودەی دەگێڕاوە.

هەروەها (ئەبوو عەبدوڵڵا ئەلحاکم) کتێبێکی نووسیوە تێیدا ئەو فەرموودانەی کۆکردۆتەوە کە بوخاری نەیگێڕاونەتەوە، باسی فەرموودەکەی (الطائر)ی کردووە، فەرموودەناسان ئاوڕیان لەو قسەیەی نەداوەتەوە.

تێگەیشتنی ئەو کەسانە چەند کەم و نزمە کە گواستنەوەی فەرموودە مەشغوولی کردوون لەو وردبینییەی کە بۆ ڕاست و دروستیی فەرموودە پێویستە. ئەوە لەبەر کەمی تێگەیشتن و فام ڕوویداوە.

بوخاری و موسلیم فەرموودەی چەند کەسێکی متمانەپێکراویان واز لێ هێناوە چونکە لە فەرموودەدا سەرپێچی کراون، لە هەندێك کەم و لە هەندێك زۆر فەرموودەیان گێڕاوەتەوە، ئەگەر تێگەیشتن هەبووایە دەیانزانی کە زیاد گێڕانەوە

لە کەسی متمانەپێکراو قەبووڵکراوە! وازیان لە فەرموودەی هەندێ کەس هێناوە چونکە تەنها ئەوان فەرموودەکەیان لە کەسێك گێڕاوەتەوە، ئاشکراشە کە بە تەنها گێڕانەوەی کەسێکی متمانەپێکراو هیچ عەیبێکی تێدا نییە! لەوەشدا وازیان لە (الغرائب) هێناوە. هەموو ئەوانە خراپ تێگەیشتنە.

لەبەرئەمە زاناکان پابەندی ئەمە نەبوون و وتوویانە: زۆر گێڕانەوە لە کەسی متمانەپێکراو قەبووڵکراوە و تانەدان وەرناگیرێ تا هۆکارەکەی ڕوون نەکرێتەوە.

هەر کەسێك تێکەڵی زانایان نەبێ و لەگەڵ فەرموودەناسان ماندوو نەبێ تێگەیشتنی خراپ دەبێ و ئازاری پێ دەگات!

## ١٧٦- هەندێ شت پێویستی بە بەڵگە نییە

بزانە کە خوای گەورە شتگەلێکی لە دڵ و دەروونەکان داناوە کە ئاتاج بە بەڵگە نییە و نەفسەکان بە زەرورەت دەیزانن و زۆربەی خەڵکیش ناتوانن گوزارشتی لێ بکەن.

خودا لە دڵ و دەروونی مرۆڤی داناوە کە دروستکراو دەبێ دروستکەرێکی هەبێ و بنیاتنراو دەبێ بنیاتنەرێکی هەبێ و دوو زیاترە لە یەك و یەك جەستە ناتوانێ لە یەك حاڵەت لە دوو شوێن بێت.. نموونەی ئەم شتانە پێویستیان بە بەڵگە نییە.[1]

---

(١) لێرەدا نووسەر باسی هەندێ بابەتی ڕێزمانی عەرەبی دەکات کە بۆ خوێنەری کورد پێویست نییە

## ۱۷۷- وردبوونەوە و تێڕوانین

سەرنجی ئەحواڵی مرۆچاکان و مرۆبەدانم دا، دیتم هۆکاری باشیی چاکان تێڕوانین و وردبوونەوەیە و، هۆکاری خراپیی بەدانیش پشتگوێخستنی تێڕوانین و وردبوونەوەیە.

لەبەرئەوەی کەسی ژیر ورد دەبێتەوە و دەزانێ کە دەبێ دروستکەرێك هەبێ کە گوێڕایەڵێکردنی پێویستە، لە پەرجووەکانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) ڕادەمێنێ و جڵەوی خۆی تەسلیمی شەرع دەکات، پاشان سەرنج دەدات تا بزانێ چ شتێك لە خودا نزیکی دەخاتەوە. ئەگەر دووبارەکردنەوەی زانستی لەسەر قورس بوو ئەوا سەرنج دەداتە بەروبوومەکەی، ئیتر بۆی ئاسان دەبێ. ئەگەر شەوبێداری لەسەر سەخت بوو ئەوا هەروا دەکات. ئەگەر شتێکی حەزلێکراوی بینی سەرنج دەداتە سەرەنجامەکەی و زانی کە چێژ دەڕوات و نەنگی و گوناهەکە دەمێننەوە ئەوا وازلێهێنانی لە کن ئاسان دەبێ. ئەگەر ئارەزووی کرد تۆڵە لەو کەسە بسێنێتەوە کە ئازاری دەدات ئەوا پاداشتی ئارامگرتن و پەشیمانیی کەسی تووڕەی لەسەر کردەوەکانی لە کاتی تووڕەییدا بیردەکەوێتەوە...پاشان هەمیشە لە خێرا تێپەڕبوونی تەمەن ورد دەبێتەوە و بە وەدەسهێنانی باشترین چاکە سوودی لێ وەردەگرێ، ئیتر خۆزگە و هیوای دێتەدی.

بەڵام کەسی بێئاگا، تەنها شتی بەرچاو و بەردەم دەبینێ، هەیە سەرنجی واتای دروستکراو و سەلماندنی دروستکەری نەداوە ئیتر نکووڵی کردووە و وازی لە وردبوونەوە هێناوە و ئینکاری پێغەمبەران و پەیامەکانیانی کردووە، سەیری دونیایان کردووە و بیریان لە سەرەتا و کۆتاییەکەی نەکردۆتەوە، لە خۆراك تەنها خواردن دەزانن و ئەگەر سەرنجیان دابووایە کە چۆن دروست بووە و بۆچی کراوەتە پارێزەری جەستە؟ ڕاستیی شتەکانیان دەزانی! هەروەها هەر شەهوەت و ئارەزوویەك کە دێتە پێشیان سەیری سەرەنجامەکەی ناکەن بەڵکوو سەیری چێژ و خۆشییە کاتییەکەی دەکەن. ئەو چێژە کاتییە چەندان کەسی تووشی سزا و دەسبڕین و حەیاچوون کرد! پەلەی چێژ وەرگرتن دەبێتە هۆی لەدەستدانی چاکەکان و گرفتاربوون بە خراپەکان، هۆکاری ئەمەش سەرنجنەدان و وردنەبوونەوەیە لە سەرەنجامەکان، ئەمە کاری عەقڵە و ئەو زەمکراوەش کاری ئارەزووە.

لە خودا دەپاڕێینەوە بێدارییەکمان پێ بدات کە سەرەنجامەکانمان پیشان بدات و چاکە و خراپەکانمان بۆ ئاشکرا بکات، ئەو توانای ئەوەی هەیە.

## ١٧٨- هیممەتی بەرز

هیممەتێکم هەیە کە ئەوپەڕی بەرزی دەخوازێ، تەمەن هەڵکشا و نەگەیشتم بە ئاوات! داوای تەمەندرێژی و بەهێزکردنی جەستە و گەیشتن بە ئاواتەکانم لە خودا کرد. عادەت و خوو و نەریتەکان ڕەخنەیان لێ گرتم و وتیان: ئەوەی تۆ داوای دەکەیت عادەت نییە. وتم: من داوا لە خودایەکی بەتوانا دەکەم کە عادەتەکان دەشکێنێ، بە پیاوێك وترا: پێویستیۆکەکمان(حویجة) هەیە. وتی: پیاویژگەکی بۆ بدۆزنەوە.

بە یەکێکی تر وترا: بۆ پێویستییەك هاتووین کە ماندووت ناکات. وتی: خەڵکی کەم و نزمی بۆ بدۆزنەوە.

ئەگەر خەڵکی شکۆمەند و پایەداری دونیا ئەمە بڵێن، ئەی بۆچی تەما و ئومێدمان بە بەخششی خودای بەخشندە و بەتوانا نەبێ؟!

ئەم داوایەم لە مانگی (ربیع الاخر) لە ساڵی ٥٧٥ی کۆچی لە خودا کرد، ئەگەر تەمەنی درێژ کردم و گەیشتم بە ئاواتەکانم، ئەم بەشەم گواستەوە بۆ دواتر و پاکنووسم کرد و هەواڵی گەیشتن بە ئاواتەکانم پێدرا، ئەگەریش ئەوە ڕووی نەدا ئەوا گەورەم باشتر بە بەرژەوەندەکان دەزانێ، ئەو لەبەر چرووکی نییە کە نابەخشێ و توانا و هێزیش هەمووی لەوەوەیە.

## ١٧٩- حەزی خۆدەرخستن

چەند کەمن ئەوانەی پاك و بێگەرد، تەنێ بۆ خودا کار دەکەن! چوون زۆرینەی خەڵك حەز دەکەن پەرستشەکانیان وەدەرخەن، سوفیانی سەوری دەیوت: پشت بە کردەوە دیارەکانم نابەستم! ئەوان کردەوەکانیان دەشاردەوە، بەڵام خەڵکی ئەمڕۆ بە جلوبەرگەکانیان خۆیان دەردەخەن! (ئەییووبی سەختیانی) کراسەکەی تا سەر قاچی درێژ دەکرد و دەیوت: جاران شۆرەت لە درێژکردن بوو، بەڵام ئێستا لە کورتکردنە.

بزانە کە وازهێنان لە ڕوانین بۆ خەڵك و سڕینەوەی پایە لە دڵیان بە کار و کۆشش و دڵسۆزی و داپۆشینی حاڵ، ئا ئەمە ئەو کەسانەی بەرز کردۆتەوە کە بەرزبوونەتەوە، ئەحمەدی کوڕی حەنبەل هەندێ کات بە پێخواسی دەڕۆیشت و پێڵاوەکانی بە دەستەوە دەگرت و دەچووە گوڵەگەنمی هەڵدەگرتەوە، بیشری حافی بەردەوام و تەنیا بە پێپەتی دەڕۆیشت، مەعرووفی کەرخی دەنکە خورمای هەڵدەگرتەوە.(پێم وایە هەموو ئەم کارانە لە ڕەوشت و ئاکاری پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) نەبوون و ئەو کردەوەی لەم چەشنەی نەکردووە لە کاتێکدا لەوپەڕی خاکیبوون و بێفیزیدا بووە)..

ئەمڕۆ حەزی سەرکردایەتی لە هەموو لایەنێك سەری هەڵداوە، ئەم حەزەش ناوەستێ تا بێئاگایی و بینینی خەڵك و لەبیرچوونەوەی هەق دەست بەسەر دڵدا دەگرێ، ئەو کات داوای سەرۆکایەتی بەسەر ئەهلی دونیادا دەکات.

شتی سەیروسەمەرەم لە خەڵك بینیوە تەنانەت لەوانەش کە بەرگی زانستیان پۆشیوە: ئەگەر بمبینێ بەتەنیا دەڕۆم ڕەخنەم لێ دەگرێ، ببینێ سەردانی هەژارێ دەکەم بەلایەوە گەورەیە، ببینێ دڵخۆش دەبم و پێ دەکەنم ئەوا لەبەر چاوی کەم دەبم!

وتم: ئای لەو سەیروسەمەرەیە! ئەمە ڕێگای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و هاوەڵان بوو، حاڵوباری خەڵك بۆتە یاسا بۆ دامەزراندنی پلەوپایە.

سوێند بە خوا ئەوان لەبەر چاوی خودای هەق کەوتن و ئەویش لەبەر چاوی خەڵکی خستن.

براکانم: ئاوڕ بدەنەوە بە لای چاککردنی نیازەکان و واز بێنن لە خۆڕازاندنەوە بۆ خەڵك! با کۆڵەگەی ژیانتان دامەزراوی بێت لەگەڵ هەق، هەر بەمە پێشینان بەرزبوونەوە و بەختەوەر بوون. ئامان و دەخیل وریای ئەو خوو و نەریتانە بن کە خەڵکی ئەمڕۆ لەسەریانن، کە بەراورد بە بێداریی پێشینان وەکوو خەوتن وایە.

## ١٨٠- ئەگەر خودا کەسێکی بوێت

سوێند بە خوا، پەروەردەکردنی باوك هیچ سوودێکی نییە ئەگەر هەڵبژاردنی خودا بۆ ئەو منداڵە پێش نەکەوتبێت. خوای گەورە ئەگەر کەسێکی ویست ئەوا لە منداڵییەوە پەروەردەی دەکات و شتی باشی لە کن خۆشەویست دەکات و هاوڕێیەتیی کەسی چاکی بۆ دەڕەخسێنێ و پێچەوانەی ئەمانەشی لەلا بێزراو دەکات و شتی پڕوپووچی لە نك ناشیرین دەکات و لە کردەوە کرێتەکان دەیپارێزێت و هەر کاتێ ساتمە بکات دەستی دەگرێ و هەڵیدەسێنێتەوە.

ئەگەریش ڕقی لە کەسێك بوو ئەوا وازی لێ دێنێ بەردەوام هەڵە بکات و لە هەموو بارێکدا شپرزە بێت و هیممەتێکی وای بۆ چێ ناکات کە بە دوای شتی بەرزدا بگەڕێ، بە شتی گەند و بەد مەشغوولی دەکات لە شتە باشەکان، ئەگەر وتی: بۆچی تایبەت بەمە کراوم؟! ئەوا بەمە وەڵام دەدرێتەوە: قَالَ تَعَالَى: ﴿وَمَآ أَصَٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتْ أَيْدِيكُمْ وَيَعْفُواْ عَن كَثِيرٍ ٣٠﴾ (الشوری: ٣٠) واتە: بە هۆی کردەوەکانتانەوەیە..

## ١٨١- گەورەترین بەڵگەی بوونی خودا

گەورەترین بەڵگە لەسەر بوونی خودای خوڵقێنەر ئەم نەفسە بگۆ و جیاکەرەوە و بزوێنەری جەستەیە بەپێی پێویستی ویستی کە بەرژەوەندەکانی ڕێك خستووە و بەرزبۆتەوە بۆ ناسینی گەردوون و ئەوەی لە توانایدا هەیە لە زانستەکان وەدەستی هێناوە و دروستکەری لە دروستکراوەوە بینیوە، هیچ داپۆشینێك هەر چەند چڕ بێت لێی نەشاردۆتەوە! لەگەڵ ئەوەشدا ماهییەتیی ئەم نەفسە و چۆنییەتی و جەوهەر و شوێنی نازانرێ، وە نازانرێ لە کوێوە هاتووە و بۆ کوێ دەچێت و چۆن بەم جەستەیەوە نووساوە؟

هەموو ئەمانە وا پێویست دەکات کە ڕێکخەر و خوڵقێنەرێکی هەبێت، ئەوە بەسە بۆ ئەوەی بەڵگە بێت لەسەری، ئەگەر بە هۆی خوداوە پەیدا بووبێت ئەوا حاڵوباری لەو ون نابێت.

## ١٨٢- فەزڵی زانایان

پاك و بێگەردی بۆ ئەو خودایەی بە زانایانی تێگەیشتوو چاکەی لەگەڵ خەڵکدا کردووە، ئەو زانایانەی لە مەبەست و ویستی خودای شەرعدانەر تێگەیشتوون، ئەوان پارێزەری شەریعەتن، خودا پاداشتی باشیان بداتەوە، شەیتان لێیان دەترسێت و خۆی لێیان لادەدات، ئەوان دەتوانن ئازار بە شەیتان بگەیەنن بەڵام ئەو ناتوانێ ئازاریان پێ بگەیەنێ.

شەیتان یاری بە نەزان و نەفامان کرد، لە سەیرترین یاری پێکردنیشی ئەوەیە کە وازهێنان لە زانستی لە کن هەندێ کەس جوان کردووە، پاشان بەمەش ڕازی نەبوون تا ئەوەی تانەیان لەو کەسانەش دا کە بە زانستەوە سەرقاڵن.

— ئەگەر تێگەیشتبان — ئەمە تانەدانە لە شەریعەت، پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه وسلم) وتوویە: ((لە منەوە بە خەڵك بگەیەنن تەنانەت ئەگەر ئایەتێکیش بێت))، خوای گەورە پێی فەرمووە: قَالَ تَعَالَى: ﴿بَلِّغْ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ﴾ (المائدة: ٦٧) واتە: ئەوەی لە لای خوداوە بۆت هاتووە ڕاییبگەیەنە..

ئەگەر بە زانستەوە خەریك نەبیت ئەی چۆن شەریعەت بە خەڵك ڕابگەیەنرێت؟!

نموونەی ئەمە لە زاهیدە گەورەکانەوە گێڕدراوەتەوە وەکوو (بیشری حافی)! بە (عەبباسی کوڕی عەبدولعەزیم)ی وت: لەگەڵ فەرموودەزانان دامەنیشە. بە

(ئیسحاقی کوڕی زەیف)ی وت: ئەتوو فەرموودەزانیت حەز دەکەم چیدیکە نەیەیتە لام. پاشان پۆزشی هێنایەوە و وتی: فەرموودە فیتنەیە مەگەر بۆ کەسێ کە لە فەرموودەدا مەبەستی خودا بێت ، وە ئەگەر کاری پێ نەکرێ ئەوا واز لێ هێنانی باشترە.

ئەمە شتێکی سەیرە لەمەوە ! بە چیڕا زانی کە فەرموودەخوازان مەبەستیان خودا نییە و کاری پێ ناکەن؟! ئەدی کارپێکردنی دوو جۆر نییە: یەکەم: کارکردن بە شتێك کە پێویستە، ئەوەش هیچ کەسێ ناکرێ تەرکی بکات. دووەم: سوننەت کە مولزەم و ناچاری نییە، سەرقاڵبوون بە فەرموودە باشترە لە نوێژ و ڕۆژووی سوننەت.

پێم وایە تەنێ ڕێگاکەی خۆی گەرەك بووە کە بریتییە لە برسێتیی بەردەوام و شەونوێژ، ئەوەش شتێکە ئەوەی تەرکی بکات سەرزەنشت ناکرێ.

ئەگەر مەبەستی ئەوە بێت لە زانستی فەرموودەدا ڕۆنەچێت ئەوا ئەمە هەڵەیە، چونکە هەموو بەشەکانی باش و پەسنکراون. باشە ئەگەر خەڵك وازیان لە فەرموودەخوازی هێنابا، ئایا بیشر فەتوای دەدا؟!

بۆ خاتری خوا ئاوڕ لە قسەی کەسێك مەدەنەوە کە زانای تێگەیشتوو نییە، ناوی گەورەکردنیشی سەرسامت نەکات ، خودا لێی ببوورێت.

## ١٨٣- ڕەزامەندیی خودا لە سەرووی هەموو شتێکەوەیە

ژیر ئەو کەسەیە کە لایەنی خودا دەپارێزێت و باکی بە تووڕەبوونی خەڵك نییە. هەر کەسێك لایەنی خەڵك بپارێزێت و مافی خودا پشتگوێ بخات ئەوا خودا دڵی ئەو کەسەی لە دژ وەردەگێڕێ کە ویستوویە ڕازی بکات ئیتر ئەو کەسە خەشم و قینی لێ دەگرێ.

(مەئموون) بە هاوەڵێکی وت: بە گوێڕایەڵیکردنی من سەرپێچیی خودا مەکە خودا منت بەسەردا زاڵ دەکات.

یەکێك لە سوڵتانەکان داوای کرد ناسناوی پاشای پاشایان(شاهەنشا)ی پێ بدرێ، پرسیاری لە زانایان کرد بۆیان شەرعاند! بەڵام (ئەبولحەسەن ئەلماوەردی) بۆی نەسەلماند، بۆیە ڕێز و قەدری لە کن سوڵتان زۆر و مەزن بوو.

پێویستە ئەگەر خەڵکیش لێمان تووڕە بن هەر مەبەست و نیازمان گوێڕایەڵیی خودا بێت چونکە دواجار مرۆڤ بە تووڕەکردنی خودا و ڕازیکردنی خەڵك سووك و ڕیسوا دەبێ، نابێ خودا تووڕە بکرێ چونکە کە ئەوت تووڕە کرد ئیتر خەڵکیشت لێ تووڕە دەکات و بەمەش هەم خودا و هەمیش خەڵك لە دەست دەدەیت.

## ١٨٤- هەڵبژاردنی دروست

پێویستە کەسی ژیر بڕوانێتە ئەسڵ و بنەچەی ئەو کەسەی تێکەڵی دەبێ و لەگەڵ هەڵدەستێ و دادەنیشێ و هاوڕێیەتی دەکات یان ژن و ژنخوازی لەگەڵدا دەکات، پاشان دوای ئەوە سەیری شێوە و وێنەی بکات چونکە باشی و چاکیی شێوەی، بەڵگەیە لەسەر چاکی و باشیی ناوەوە ! !

بەڵام ئەسڵ و بنەچە گرینگە چونکە هەموو شتێك دەگەڕێتەوە بۆ بنەچەکەی، کەسێك ئەسڵ و بنەچەی نەبێ دوورە واتایەکی جوانی تێدا بێت، ژن ئەگەر لە ماڵێکی خراپەوە بێت زۆر کەم ڕوودەدات پارێزراو و پاك بێت، هەروەها هاوڕێ و هاونشین و تێکەڵ و ژنخوازیش هەروایە.

نەکەی تێکەڵی کەسێك بیت مەگەر کەسێك کە ئەسڵ و بنەچەی هەبێت کە ترسی پۆخڵێت لێی نییە، بە زۆری ئەوانە سەلامەتن، ئەگەریش غەیری ئەوە ڕوویدات ئەوە دەگمەنە.

عومەری کوڕی عەبدولعەزیز خودا لێی ڕازی بێت بە پیاوێکی وت: پێم بڵێ کێ بکەمە کاربەدەست؟ کابرا وتی: دیندارەکان حەز بە پۆست و پایە ناکەن و نایانەوێ، دونیاپەرستەکانیش تۆ حەزیان پێ ناکەیت و ناتنەوێ، کەواتە شەریفەکان گونجاون چونکە ئەوان شەرەفی خۆیان لە شتی نەشیاو دەپارێزن.

(ئەبووبەکری صوولی) وتوویە: حوسەینی کوڕی یەحیا لە زاری ئیسحاقەوە بۆی گێڕامەوە، وتی: ڕۆژێکیان خەلیفە (موعتەصەم) بانگی کردم و پێی وتم: ئەی باوکی ئیسحاق! شتێك لە دڵمدا هەیە دەمەوێ لێتی بپرسم: (مەئموون)ی برام خەڵکێکی هەڵبژارد کە بەرهەمیان هەبوو و کاری باشیان کرد، منیش وەکوو وی خەڵکێکم هەڵبژارد بەڵام زڕ و بێبەر بوون؟ وتم: ئەو کەسانە کێ بوون؟ وتی: ئەو تاهیر و کوڕەکەی و ئیسحاق و ئال سەهلی هەڵبژارد، منیش ئەفشین کە دیتت سەرەنجامەکەی چی بوو، ئەشناس کە هیچی لەباردا نەبوو، هەروەها ئیتاخ و وەصیف. وتم: ئەی میری ئیمانداران! ئا وەڵامەکە لێرەدایە، ئەگەر قسە بکەم لێم تووڕە نابیت و ئەرخەیان بم؟ وتی: چیت هەیە بێترس بیڵێ. وتم: براکەت سەیری بنەچە و ئەسڵەکانی کردن و کار و پۆستی پێدان بەرهەمیان بوو، کەچی تۆ لك و پۆپت هەڵبژارد کە هیچ ڕەگ و ڕیشەیەکیان نەبوو بۆیە زڕ و بێبەرهەم بوون! وتی: ئەی باوکی ئیسحاق! ئێش و ئازارەکانی هەموو ئەو ماوەیەی ڕابرد لەسەرم سووکتر بوو لەم وەڵامە!

سەبارەت بە وێنە و شێوەش، ئەوا هەر کات بناغە و پێکهاتەی مرۆڤ ساغ بوو و هیچ نەنگییەکی تێدا نەبوو ئەوا ساغیی ناخ و جوانیی ڕەوشت زاڵە، هەر کاتێکیش خەوشێکی تێدا بوو ئەوا نەنگییەکە لە ناوەوەشە. وریا بە لە کەسێك نەخۆشییەکی دەرەکی هەیە وەکوو کەچەڵ و کوێر و هیتر، ئەوانە بەزۆری ناخیان خراپە.(بێگومان ئەم قسەیە یەکێکە لە قسە نەشیاوەکانی دانەر! بەداخەوە کە زانایەکی ئەوها گەورە ئەم جۆرە قسانە فڕێ بدات..هەرگیز کەموکورتیی جەستەیی

پێوەر نییە بۆ باشی و خراپیی مرۆڤ و بەڵگە نییە لەسەر ئەوەی کە ئەو کەسەی دیمەنی دەرەوەی کەموکورتییەکی هەبێ واتە لە ناخیشدا تەواو نییە ! ).

پاشان لەگەڵ ناسینی بنەچەی ئەو کەسەی تێکەڵی دەبیت و تێروتەواویی شێوەی، دەبێ بەر لە تێکەڵبوون تاقیکردنەوەش هەبێ و بەکارهێنانی وریاییش پێویستە.

## ناوەڕۆك